## کوردی - کوردی

کۆکردنەوە و داڕشتنی

**کۆمەڵێک مامۆستا**

---

ئامادەو سەرپەرشتیکردن و

سەرلەنوێ داڕشتنەوە و دەوڵەمەندکردنی

**لیژنەی فەرهەنگ**

---

هەولێر - ٢٠٠٧

# فەرهەنگی هەراشان

کۆکردنەوە و داڕشتنی

مامۆستایان

ئەحمەد فەقێ یوسف
تارق خالد مەعروف
جەعفەر حەجی حوسێن
ساجیدە مەعروف
سەلام ناوخۆش
سدیق شرۆ عەلی
شوان سەرابی
عەبدولڕەحمان مستەفا
عومەر محەمەد عامر
مەجید باجلووری
محەمەد نەزیف
نوری سەعید
هێرۆ عەبدولڕەحمان

ئامادەو سەرپەرشتیکردن و

سەر لەنوێ داڕشتنەوە و دەوڵەمەندکردنی

لیژنەی فەرهەنگ

د. کوردستان موکریانی

د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی

پ.ی سەلام ناوخۆش

● ناوی کتێب : فەرھەنگی ھەراشان

● کۆکردنەوە و داڕشتنی : کۆمەڵێك مامۆستا

● ئامادە و سەرپەرشتیکردنی: لیژنەی فەرھەنگ

● بەرگ و نەخشەسازی : محەمەد زادە.

● تیپ چنین : فرناد شەمعون بیا ـ عبدالحمید عزیز رسول ـ ظاھر عمر ولی ـ سالح قادر.

● ھەڵەگری : شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.

● بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کوردستان، لیژنەی فەرھەنگ ـ ژمارە ( ٤٢ ).

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

● چاپخانەی دەزگای ئاراس- ھەولێر- ساڵی ٢٠٠٧.

● لە کتێبخانەی گشتی ھەولێر، ژمارەی سپاردنی (٤٩٥ ) ی ساڵی ( ٢٠٠٧ ) ی دراوەتێ .

## پێشەکی بۆ منداڵان

فەرهەنگی هەراشان بۆ ئێوە داندراوە و دەتوانن لەنێویدا مانـای سـەدان وشـە ببیننەوە. هەوڵدراوە لەم فەرهەنگەدا وشەکانی نێوی نـەك هـەر لـە رووی واتـاوە، بەڵکو لە بواری رێزمانیشدا تیشکێکی بخرێتەسەر، بۆ وێنە، کە نووسیومانە ***بڵێسە*** لە تەنیشتیدا (ن.)مان داناوە، لەمەدا مەبەستمان ئەوەیە، کە بڵێسە لە بەشەکانی ئاخاوتندا ***ناوە***، کەواتا ***(ن.)*** کورتکراوەی ***ناوە***، یان کـە نووسـیومانە ***ئامۆژگـار*** و لەپاڵیشی ***(ئان.)***مان داناوە بۆ ئەوەمانە پێتان بڵێین ئەم وشەیە ***ئاوەڵناوە***، کەواتـە لێرەدا ***(ئان.)*** کورتکراوەی ***ئاوەڵناوە***.

بۆ لێکدانەوەی واتای وشە فەرهەنگێکان تا بۆمان کراوە بەشێوەیەکی سـادە و سـاکار لەنێو دێڕێك وەیا دوو دێڕدا مانای وشەکانمان روونکردۆتەوە، بەڵام لەو بارانەدا، کـە هـەر بە وشەیەك وەیا زێتر واتاکەی لێکدراوەتەوە، رستەیەکمان بەوێنە هێناوەتەوە.

دوور نییە، ئێوە شارەزایەکی باشتان لەریزبەندی ئەلفوبێی کوردیدا هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانن وشە لەنێو فەرهەنگدا بدۆزنەوە، ئێمە بۆ ئاسانکاری لە هەر پەڕێکدا ئەو ئەلفوبێیانەی زمانی کوردیمان ریزکردووە، کـە دەکەونـە سـەرەتای وشـە، ئـەو تیپەی، کە بەتۆخی و تۆزێك گەورەتر لەوانی دی چاپکراوە، ئەوە دەگەیەنێت، کـە وشەکانی نێو ئەو لاپەڕەیە بەو تیپە دەستپێدەکەن. بۆ وێنە ئەگەر لە وشەی تـاوس بگەڕێیت لە بەشی سەرەوەی لاپەڕەی دەستی راستتدا، ئەم ئەلفوبێیانـە ریزکـراون:

ئا ئـە ب پ ت ج چ ح خ د ڕ ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن و ی دەبینیت لەنێویاندا تیپی **ت** بە تۆخی چـاپکراوە، بـۆ ئەوەی بزانیـت ***شلەژان*** چ واتایەك دەبەخشێت پێویستە بەدەیان لاپـەڕە هەڵبدەیتـەوە تـا بگەیتـە تیپی **ش** ، کە ئەویش لەنێو تیپەکاندا بە تۆخی چاپکراوە.

ئەلفوبێی کوردی هەر ئەو ٢٧ ئەلفوبێیانە نین، کە لێرەدا هاتوون، بەلکو زێترن و ئەوانەی لێرەدا نەنووسراون بریتین لە: ر ڵ وو ۆ ی ێ هۆی نەبوونیان لەنێو ئەلفوبێکانی دیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کەوا ناکەونە سەرەتای وشەوە، بەلام وشەشیان لێ پێکدێت، وەك: بردن. هەواڵ . نووسین . زۆزان . هەرمێ.

ئەو ٢٧ تیپە ئەلفوبێی فەرهەنگین، چونکە وشە لە زمانی کوردیدا هەر بەو ئەلفوبێیانە دەستپێدەکات و لەریزکردنی وشەکانی نێو فەرهەنگدا هەر مامەڵە لەگەڵ ئەو ٢٧ ئەلفوبێیانە دەکرێت، کە دەکەونە سەرەتای وشەوە.

ئەم فەرهەنگە وشەی ئاسانی وەك: ئافرەت، برا، پیاو، خوشك، کوڕ، گەورە، یاری و.. ناگرێتەخۆی، چونکە ئەم وشانە لەلاتان ناسراون.

هێندێك لە وشەکانی نێو ئەم فەرهەنگە بە وێنە روونکراونەتەوە، هەوڵماندا وێنەکە بکەوێتە پێش ئەو وشەیەی، کە ئەو دەنوێنێت، لەو بارەدا، کە نەگونجابێت لەلای یەکتربن، ئەوا هەر لە هەمان ئەو لاپەڕەیە داندراوە، کە وشەکەی تێدا هاتووە.

منداڵانی کورد. ئەم فەرهەنگەتان لێ پیرۆزبێت، چاوەڕێی تێبینی ئێوەی خۆشەویستین.

*__وشە کورتکراوەکانی نێو ئەم فەرهەنگە__*

(ئام.) ئامراز

(ئاك.) ئاوەڵکار

(ئان.) ئاوەڵناو

(ج.) جێناو

(چ.) چاوگ

(ن.) ناو

# پێشەکی بۆ گەوران

بیرۆکەی دانانی ئەم فەرهەنگە بۆ پاییزی ساڵی ٢٠٠٥ دەگەڕێتەوە، کە وەکو پرۆژەیەك خستمە بەردەست لیژنەی فەرهەنگ لە کۆڕی زانیاری کوردستاندا، لەبەر گرنگی پرۆژەکە پەژراندرا، دواتر لە دەستەی سەرۆکایەتی باس کرا و لە ئەنجومەنی کۆڕدا بڕیاری دانانی لەسەر درا.

دانانی ئەم فەرهەنگە لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردستانەوە لەبەر کۆمەڵێك هۆ پەسندکرا، لەوانە: ١- نەبوونی فەرهەنگێکی کوردی – کوردی بۆ منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵ و بەرەوژوور. ٢- یەکێك لە ئامانجە هەرە سەرەکێکانی کۆڕی زانیاری کوردستان بایەخدانە بە زمانی کوردی، کە دانانی فەرهەنگ رێگەیەکە بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجە.٣- زۆرجار لەسەر لاپەڕەی کۆڤار و رۆژنامەکاندا باس لە زمانی کوردی دەکرێت، کە بە بارێکی نائاساییدا تێدەپەڕێت و هەرکەسێك بە رێنووسی تایبەتی خۆی دەنووسێت و هەریەکێك لەخۆیەوە زاراوەیەك دادەتاشێت و.. دواتر دەنووسن ئەی کۆڕی زانیاری لەکوێیە؟ کۆڕی زانیاری کوردستان بە ئامادەکردنی نامیلکەیەك لەسەر رێنووسی کوردی و بڵاوکردنەوەی هەزاران دانە لێی، بە دانانی فەرهەنگی جۆراوجۆر، بڵاوکردنەوەی چەندین بەرهەم لەسەر زاراوە، لێکۆڵینەوە لەسەر رێزمانی کوردی، بە بەستنی چەندین کۆنفرانس لەسەر چەند بابەتێکی زمانەوانی و بە لەچاپدانی شەش ژمارە لە کۆڤاری ئەکادیمی و.. راژەیەکی باشی زمانی کوردی کردووە و ئەم بەرهەمەی بەردەستیش هەر وەڵامدانەوەیەکە بۆ ئەوان. ٤- بۆ بەشداریکردن لە بووژاندنەوەی زمانی کوردی و هەوڵدان بۆ پەرەسەندنی، کۆڕی زانیاری وای پێباشبوو، کە لە قوتابخانەکانەوە

دەست بەم کارە پیرۆزە بکرێت، چونکە سەرکەوتووترین چارەسەر ئەوەیانە، کە لە رەگوڕیشەوە بکرێت، نەك هەر ئەنجام.

وشە فەرهەنگێکانی نێو ئەم بەرهەمە لە کتێبی خاندنگەکان و چیرۆکی چاپکراوی منداڵان وەرگیراون.

بۆ دانانی ئەم فەرهەنگە لیژنەیەکمان لە هەولێر لەم بەڕێزانە پێکهێنا، مامۆستایان ئەحمەد فەقێ یوسف، تارق خالد مەعروف، ساجیدە مەعروف، پ.ی سەلام ناوخۆش، عەبدولرەحمان مستەفا، نوری سەعید و هێرۆ عەبدولرەحمان. لیژنەیەکیش لە شاری دهۆك ئەم بەڕێزانە بەشدارییان تێداکرد، مامۆستایان: ١ـ جەعفەر حەجی حوسێن ٢ـ سدیق شرۆ عەلی ٣ـ عومەر محەمەد عامر ٤ ـ مەجید سەعید باجلووری ٥ـ محەمەد نەزیف. بۆئەوەی سەرچاوەی ئەم پرۆژەیە هەموو کتێبی خوێندنگەکانی سەرەتایی بگرێتەوە، بەڕێز شوان سەرابی سەدان وشەی لەنێو کتێبی قوتابخانەکانی سەرەتایی شاری سلێمانی دەرهێنابوو، ئێمەش بەپێی پێویست خستمانە پاڵ وشەکانی دی.

بۆ زێتر روونکردنەوەی چۆنیەتی کارکردن لەم پرۆژە پیرۆزەدا سێ جاران لە رێکەوتی ٢٠٠٦/١/٢٣ ، ٢٠٠٦/٢/٢ و ٢٠٠٦/٣/٦ دا لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی هەولێر و دوو جارانیش لە دهۆك لە رێکەوتی ٢٠٠٦/١/٣١ و ٢٠٠٦/٣/٢ دا لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی دهۆکدا کۆبوومەوە.

لە دانیشتنەکاندا شرۆڤەی ئەوە کرا، کە چۆن ئەو بەڕێزانە یەك بەیەکی وشەکانی نێو کتێبی قوتابخانەکان دەربهێنن و لەسەر کارتی تایبەتی بینووسن و لەپاڵ هەر وشەیەکیشدا باری رێزمانی لەنێو کەوانەیەکدا بچەسپێنن لەبەر رۆشنایی لیستی کورتکراوەی بەشەکانی ئاخاوتن، کە تایبەت بۆ ئەم فەرهەنگەم

ئامادەکردبوو، جا مانای وشەکە لێکبدەنەوە دواتر بیخەنە نێو رستەیەك بە مەرجێك لێکدانەوەی وشەکە و رستەکەش بۆ ئاستی منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵ و چەند ساڵێك گەورەتر بگونجێت.

زۆربەی مامۆستایانی ئەم دوو لیژنەیە لە کاتی دیاریکراودا بابەتەکانی خۆیان هێنا، ئێمە لە کۆڕی زانیاریدا هەموو وشەکانمان تیپچن کردن، لە ئەنجام دا بۆمان دەرکەوت زۆربەی وشەکان دووبارە و سێ بارە بوونەتەوە، هەوڵماندا لەنێوانیاندا ئەو دانەیە هەڵبژێرین، کە بۆ ئەم فەرهەنگە دەستدەدات. ئەوەی لەنێو ئەم کارانەدا زۆر سرنج ڕاکێشبوو ئەوە بوو، کە زۆربەی مامۆستایانی سەرەتایی خۆیان لەوە نەدابوو، کە وشەکان لە رووی رێزمانەوە روونبکەنەوە، هەروا زۆربەی لێکدانەوەکان بە پەیڤێك لێکدرابوونەوە بۆ ئاستی تێگەیشتنی منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵ سەختبوون، ئەو رستانەی بەوێنە هێندرابوونەوە هەر باسیان لە نەبوونی ئاو، کارەبا، نەوت ، بەنزین، خراپی رێگەوبان، گرانی و... دەکرد، هێندێکیشیان بەبێ مەبەست بۆنی توندوتیژی لێدەهات و بەدەگمەن رستەیەکمان بەرچاودەکەوت، کە ئەرێنی بارێك دەربرێت ، گەشبینییەك بە منداڵانمان بدات، لەکاتێکدا، کە وڵاتەکەمان تا رادەیەك سەربەخۆیە و لە پەرەسەندن و بووژانەوەدایە، بۆیە ناچار زۆربەی هەرە زۆری وشە فەرهەنگێکانمان لە رووی رێزمان، واتا و رستەوە دەستکاری کردن، یا سەرلەنوێ دارشتنەوە.

مامۆستا ئەحمەد فەقێ یوسف لەژێر سەرپەرشتی ئێمەدا لە بژارکردنی وشە کۆکراوەکان و هەروا سەرلەنوێ نووسینەوەی ئەو دەستنووسانەی بە باشی نەنووسرابوون یارمەتی داین.

بەڕێز د. عەبدوللّا ئامێدی بە هەموو فەرهەنگەکەدا چۆوە و بۆ ئەوەی بە دانانی کۆمەڵێك رستەی گونجاو بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو فەرهەنگەکەی دەوڵەمەندتر بکات، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین جار لەگەڵی دانیشتووین بۆ ساغکردنەوەی ئەو وشانەی کرمانجی ژووروو، کە تێبینیمان لەسەریان هەبوو. بەڕێزان مامۆستایان: د. ئیبراهیم قادر، سەلام ناوخۆش، د. عەبدوللّا ئامێدی،فەیسەل مستەفا، شێرکۆ حەوێزی، حەیدەر حاجی خدر، مستەفا شەعبان، محەمەد ئیسماعیل هاوبەشییان لە هەڵسەنگاندنی فەرهەنگی نێوبراوکرد زۆر تێبینی بەسوودیان پێشکێش کردین.

لەدوای رەچاوکردنی زۆربەی تێبینێکانی هەڵسەنگێنەران، سەرلەنوێ چەند جارێك لەم روانە بە ناوەرۆکی فەرهەنگەکەدا چوومەوە:

١- باری رێزمان. ٢- لایەنی لێکدانەوەی وشەکان، هەوڵمدا لێکدانەوەکان هەر تەنێ وشە بەوشە نەبێت، بەڵکو تا بۆم کرا روونکردنەوەیەك بێت منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵ و بەرەوژوور بە ئاسانی تێبگات. ٣- جۆری ئەو رستانەی بەوێنە هێندرابوونەوە لە رووی مانا و گونجانی بۆ ئەو تەمەنە و ناوەرۆکی رستەکان و چۆنیەتی و چەندێتی دەربڕینی مەبەست. ٤- لە رووی رێنووسەوە، بۆ وێنە ئەو وشە نەسادانەی واتایەك دەبەخشن، گەر شێوەی تیپەکان رێگە بدەن بەیەکەوە بنووسرێن باشتر و راسترە، بۆ وێنە وشەی جێبەجێکردن وا بنووسرێت، نەك لەشێوەی جێ بە جێ کردن. ٥- بۆ ئەوەی ئەم فەرهەنگە بەسوودتر و هاوچەرخانەتر بێت وام بە پێویست زانی سەدان وشە، کە لەم فەرهەنگەدا نەبوون لەنێو چەند فەرهەنگێك، کە بە زمانانی هۆڵەندی، رووسی و ئینگلیزی دانراون وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی، لەوانە: ئەلبووم، ئەتلەس، پنگوین، ئایدز،

نۆکۆردیـۆن، کـۆبرا، میکرۆسـکۆپ، مـایکرۆفۆن و.... ٦- ریزبەنـدی وشـەکان بەپێی ئەلفوبێی کوردی. ٧- سەرلەنوێ تەماشـاکردنی هـەموو فەرهەنگەکـە بـۆ دڵنیابوون لەچاککردنی ئەو لایەنانەی، کە راستمکردوونەتەوە و...

بڕیار وابوو ئەم فەرهەنگە لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ دا بخرابا بەر دەستی ئێـوەی هێـژا، بـەڵام لـەرووی ئـەوەی کـۆڕی زانیـاری کوردسـتان بـە بـارێکی تایبەتیـدا تێدەپەڕێت، بۆیە لەو مانگانەی رابوردوودا زۆربەی رۆژانی هەفتـە لـە ١٠ — ١٤ سەئات کـارم لـەو فەرهەنگـەدا کـردووە، تـا بەرهـەمێکی زانسـتی و هاوچـەرخ پێشکێش بە جگەرگۆشەکانمان بکەین.

لەکۆتاییدا سوپاس و پێزانینی خۆم و ئەندامانی لیژنەی فەرهـەنگ ئاراسـتەی یەکەیەکەی هەموو ئەو خوشك و برایانە دەکەم، کە بەشـدارییان لـە کۆکردنـەوە و دانان و هەڵسـەنگاندنی فەرهـەنگی هەراشـان کـرد. هـەروا سوپاسـێکی بێپایـان پێشکێش بە بەڕێز ساڵح قادر دەکەم، کە بە بـێ وەرەزبـوون فەرهـەنگی هەراشـانی تیپچن کرد و بۆ دەیانجار تێبینێکانی چاك دەکرد و چاك دەکردەوە، هەروا سوپاسی کاك زیـاد عـاللآیی دەکـەم، کـە زۆربـەی وێنـەکانی نێـو ئـەو فەرهەنگـەی بـۆ دەستخستین، دیسانەوە پێزانینی خۆم پێشکێش بە بەڕێز محەمەد زادە دەکـەم، کـە نەخشەیەکی نایابی بۆ دەرهێنانی ئەم فەرهەنگە دانا.

لە دانشـتنێکی ئاسـایی چـەند ئەنـدامێکی کـۆڕی زانیـاری کوردسـتان و بـە ئامادەبوونی د. وریا عومەر ئەمین باس هاتەسەر ناولێنانی فەرهەنگی بەردەسـت، ناوێك بێت لەگەڵ پلەی خوێندنی منداڵێکی تەمەن نۆ ساڵ بگونجێت، لەو نێوانەی پێشنیازکران: قوتابی، فێرخواز، فێریار، خوازیار د. وریاش پێشنیازی (هـەراش)ی

بۆ ناولێنانی ئەم فەرهەنگەی کـرد، لیژنــەی فەرهــەنگ لــەدوای لێکدانــەوەی ئــەم نێوانە لەرووی واتا و رێزمانەوە نێوی (فەرهەنگی هەراشان) ی پەسندکرد.

فەرهەنگی هەراشان تاکە فەرهەنگێکی کوردی — کوردییە، کـە بـۆ منـداڵانی تەمەن نۆ ساڵ و بەرەوژوور بەشێوەی فەرهەنگانی وڵاتانی پێشکەوتوو داندرابێت و دڵنیام لەوەی دەبێتە ژێـدەرێکی بـاش بـۆ دانـانی دەیـان فەرهـەنگی زانســتانە و سەردەمانەی دی بۆ هەمان تەمەن، هەروا ژێدەرێکی بـاش دەبێـت بـۆ فەرهەنگـە هـەرە گەورەکـەی کـوردی — کـوردی. بەرهــەمی بەردەســت تاکـە فەرهـەنگێکی کوردییە، کە کۆکارە، یانی کۆمــەڵێك مامۆســتای لێهـاتوو کاریـان تێـداکردووە، هەریەکـەیان لەلایـەنێك بـە پێـی پسـپۆری و لێزانـی خۆیـان دەوڵەمەنـدیانکرد، یەکەیەکە دەستخۆشییان لێدەکەم و سوپاسێکی بێپایانیان ئاراستەدەکەین.

هــەر تێبینێکتــان هــەبوو دەتــوانن بۆمــانی بنێـرن و پێشــەکی ســوپاس بــۆ هاوکاریتان.

کوردستان موکریانی

لیژنەی فەرهەنگ

هەولێر

٢٠٠٧/٤/١

**ئابڕوو** (ن.) ئاوی ڕوو، ئاوڕوو، شەرم، ئەگەر شتێکت گوت لە ڕاستیدا وانەبوو، دەڵێن ڕاستی نەگوت ئابڕووی چوو: ئابڕووبردن کارەکی خراپە.

**ئابووری** (ن.) ١- دەستگرتن، کێم مەسرەفی ٢- بابەتێکە پەیوەندی بە ماڵو دارایی‌و بژێوی ژیانی خەڵکەوە هەیە: *زانا لە بەشی ئابووری دەخوێنێت.*

**ئاپۆ** (ن.) مام، برای باوکت ئاپۆی تۆیە: سامان ئاپۆی منە.

**ئاتاج** (ئان.) ١- پێویست، پێدڤی: لە سەردەمی ئەمڕۆدا ئاتاجی ژیان زۆر بووە. ٢- هەژار، نەدار: کەس لە دنیادا ئاتاج نەبێت.

**ئاخ**(ن.) ١- خۆڵ: *ئاخا تێکەل ئاخەکا باشە بۆ چاندنێ.* (ئام.) ٢- موخابن، ئای، داخ: *ئاخ لە دەست کاری ناڕەوا.*

**ئاخافتن**(چ.) ئاخاوتن، گۆتن، پەیڤین، وتووێژ کردن: وا باشە *ئاخافتنی دایکوباوکمان بەهەند هەلگرین.*

**ئاخاوتن**(چ.) بڕوانە: ئاخافتن

**ئاخنراو** (ئان.) بە زۆر تێکردنی شت، تێکراو، تێپەستراو، تێپەستان: *ئەم فەردەیە لە ئارد ئاخنراوە.*

**ئاخۆ** (ئام.) ئایا، ئەرێ، داخوە، داخۆ، وشەیەکە بۆ پرسیارکردن بەکاردێت: *ئاخۆ ئازاد دێت یان نا؟*

**ئادار** (ن.) خاکەلێوە، سێیەمین مانگی سالی زاینییە، ناڤێ مەهەکا بهارێیە، ٢١ی ئاداری سەرێ سالا کوردییە: *لە یازدەی ئاداری سالی ١٩٩١دا هەولێر ئازاد کرا.*

**ئادەم** (ن.) ١- بەپێی بیروباوەڕی ئایینی باپیرە گەورەی ئادەمزادانە. ٢- مرۆڤ، مرۆ. ٣- ناوە بۆ نێرینە.

**ئادەمیزاد** ئادەمزاد، ئەوەی ئادەم، مەردووم، مرۆ، مرۆڤ: *هەموو ئادەمیزادەك دایك و باوکی هەیە.*

**ئاراستە** (ن.) ئەگەر یەکێك ناونیشانی شوێنێکی لە تۆ پرسی، تۆش شوێنەکەت بە جوانی بۆ دەستنیشانکرد، مانای ئەوەیە تۆ ئاراستەیەکی باشت پیشانداوە، ڕێڕەو: *کلکە پەرەکەی ماسی یارمەتی گۆڕینی ئاراستەی دەدات.*

**ئاراستەکان** (ن.) لاکان، لایەکان، هەر چوار لا، باکوور، باشوور، ڕۆژهەلات، ڕۆژئاوا: *لە زانستی جوگرافیادا ئاراستەکان زۆر گرنگن.*

**ئارام** (ئان.) ١- هێمن، مەند، هێدی، بێدەنگ، هێور: *شار ئارام بوو.* ٢- ناوە بۆ نێرینە: *ئارام پارێزەرەکی سەرکەوتووە.*

**ئارامگا** (ن.) ئارامگا، شوێنی ئارامگرتن: *کوردستان ئارامگەها مەمیانە.* ٢- مەزار: *ئارامگەیەکی جوان بۆ شەهیدانی کوردستان دروستکراوە.*

**ئارامی** (ن.) بێدەنگی، هێمنی، بێ شەڕوشۆڕ: *بەبێ ئارامی ژیان ناچێتە سەر.*

**ئارەزوو** (ن.) هەوەس، ئاوات، هیڤی، حەز، تاسە، مەیل: *ئازاد ئارەزووی نیگارکێشانی هەیە.*

**ئارەزوومەندانە** (ئان.) ئەگەر تۆ بە ویستی خۆت یارمەتی پیاوێکی پیرت دا بۆ جادە پەڕینەوە، ئەو کارەی تۆ ئارەزوومەندانەیە، بە ئارەزووی خۆ، دڵخوازانە: *برام ئارەزوومەندانە لەگەڵ ماوریێ کاردەکات.*

**ئارەق** (ن.) ئارەقە،خوە: *من لە پێناو ژیان ئارەق دەڕێژم.*

**ئارەقە** (ن.) ئەو ئاوەیە کە مرۆڤ لە ئەنجامی گەرما، شەرمکردن، یا نەخۆشی دەری دەدات: *کە ئارەقەت کرد نابێت خۆت بدەیتە بەر هەوای سارد.*

**ئارەق ڕشتن** (چ.) زۆر جار لە خەڵك دەبیستیت بە دایکت دەڵێن: ئارەقەیەکی زۆرت ڕشتووە، مانای ئەوەیە لە ژیاندا زۆر کاریکردووە، هەوڵدان، ماندوو بوون، ڕەنجدان: *بۆ بژێوی ژیان ئارەق ڕشتن پێویستە.*

**ئارد** (ن.) ئار، هارد، دانەوێڵەی هاڕدراو، کە کێك و نان و.... لێ دروست دەکرێت: *ئاردی سپی بۆ کێك باشە.*

**ئاردەدار** (ن.) ئارکێ داری، پاشماوە یان هاڕادراوی دار: *ئاردەدار لە بواری پیشەسازی و دارتاشی بەکار دەهێندرێت.*

**ئاروو** (ن.) خەیار، هاروو: *ئارووی گوڵبەدەم ناسکە.*

**ئازا** (ئان.) ١- بەجەرگ، نەترس، چەلەنگ، بوێر: *دلێر زۆر ئازایە.* ٢- ناوە بۆ نێرینە: *ئازا برازامە.*

**ئازاد** (ئان.) سەربەست، سەربەخۆ، خۆ سەر: *ڕۆژنامەکەمان ڕۆژنامەیەکی ئازادە.* ٢- بەرەڵلا: *سەرۆ باڵندەکەی ئازاد کرد.* ٣- ناوی نێرینەیە.

**ئازادبوون** (چ.) ڕزگاربوون، ژ دەست دەرکەفتن، قوتار بوون: *ئازاد بوون داخوازییا گەلانە..*

**ئازادی** (ن.) سەربەستی، سەربەخۆیی: *ئازادی میوای گەلانی ژێر دەستە.*

**ئازادیخواز** (ئان.) داواکاری سەربەستی، رزگاریخواز: *کورد گەلەکی ئازادیخوازە.*

**ئازار** (ن.) ١- ئێش، هێش، جەورو جەفا، ژان: *من ئازاری باڵندە نادەم.* ٢- *بروانە: ئادار.*

**ئازایانە** (ئان.) بوێرانە، دلێرانە: شێرکۆ ئازایانە بەرامبەر دوژمن وەستا.

**ئازایەتی** (ن.) چاونەترسی، مەردایەتی: *ئەم پێشمەرگانە ئازایەتییەکی بێوێنەیان نواند.*

**ئازووقە**(ن.) ئازووخە، خۆراك، ئاهێن خوارنێ: *مێروو لە هاوین ئازووقە بۆ زستان کۆدەکاتەوە.*

**ئاژاوە**(ن.) شەرەهەرا، ئاڵۆزی و ناکۆکی: *لە نێو ئێمەدا ئاژاوە نییە.*

**ئاژەڵ** (ن.) گیانلەبەر، مەڕومالات، وڵسات، تەرش: *مەڕ ئاژەڵەکی شیردەرە.*

**ئاژەڵدار** (ئان.) خودانێ ئاژەڵێ و پەزان: گەلەك ژ خەلکێ کوردستانێ ئاژەڵدارن.

**ئاژۆتن** (چ.) لێخوڕین، هاژۆتن: ئاژۆتنی ئۆتۆمبێل وریایی دەوێ.

**ئاسان** (ئان.) ١- هاسان، سووك، سانا، ساناهی، سڤك: *پرسیارەکانی بیرکاری ئاسان بوون.* ٢- بێڕەنج، بێسەختی: *کارەکە بە ئاسانی کۆتایی پێهات.*

**ئاسایش** (ن.)ژیانێك شەڕوشووڕو توندوتیژی تێدانەبێت ژیانێکی ئاسایشی پێدەڵێن: *ئاسایش لە وڵاتی ئێمەدا بەرقەرارە.*

**ئاست** (ن.) ١- پلە، بارستایی، پایە، هاوشان: *ئەم کارە لە ئاستی تۆ دایە.* ٢- بەرامبەر: *لە ئاست ئەم رووداوە نازانم چی بکەم؟* ٣- شوێن، جێگا، عاست: لەو ئاستە دانیشن.

ئاسك

**ئاسك** (ن.) مامز، کەژاڵ، خەزاڵ، غەزال: *ئاسك ئاژەڵەکی جوانە.* چاڤێن وێ وەکی چاڤێن ئاسکانە.

**ئاسمان** (ن.) ئەزمان، فەلەك، عاسمان، گەردوون: *هاوینان ئاسمانی کوردستان ساماڵە.*

**ئاسمانگەڕ** (ن.) ئەو کەسەیە، کە لەبۆشایی ئاسماندا دەگەڕێت: *ئاسمانگەڕ چوو بۆ سەربانێ مەیڤێ.*

**ئاسمانی** (ئان.) شینی کاڵ، ڕەنگی ئاسمانی: *ڕەنگی کراسی نازێ شینی ئاسمانی بوو.*

**ئاسن** (ن.) کانزایەکە بۆ پیشەسازی بەکاردەهێنرێت: *داس لە ئاسن دروست دەکرێت.*

**ئاسوودە** (ئان.) دڵنیا، بێخەم، خۆش، ڕەحەت: *کچم بە ئاسوودەیی بنوو.*

**ئاش** (ن.) دەزگایەکە گەنمو جۆو دانەوێڵەی پێ دەهاڕنو دەیکەن بە ئارد: *لە گوندەکەمان ئاشێکی ئاو هەبوو.*

ئاسۆ

**ئاسۆ** (ن.) ١-مەیدانو بواری چالاکیو کار: ئاسۆی زانینو تێگەیشتنی

مرۆڤ هەروا فراوان دەبێ. ٢- بەینی ئەردو ئاسمان: *بەری بەیانیان ئاسۆ ڕووناکە.*

**ئاشتی** (ن.) ١- تەبایی، ڕێکوپێکی، سازان، هاشتی: *کورد میللەتەکی ئاشتی خوازە.* ٢- ناوە بۆ نێرو مێ.

**ئاشتیخواز** (ئان.) کەسەك، کە حەز لە ئاشتی بکاتو هەوڵی بەدیهێنانی بدات، بێ گێچەڵ : *دایکم ژنەکی ئاشتیخوازە.*

**ئاشکرا** (ئان.) خویا، ڕوون، دیار، زەق، بەرچاو: *ئاشکرایە، کە من مەڤالی تۆم.*

**ئاشکراکردن** (چ.) نهێنی دەرخستن، بەرچاوخستن، دیارکردن: *ئاشکراکرینی نهێنی باش نییە.*

**ئاشنا** (ئان.) ١- هاوەڵ، دۆست: *دەمێکە من ئاشنای ئەوم.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**ئاشی ئاو** (ن.) ئەو ئاشەی بە ئاو کاردەکات، ئاشی ئاڤی: *گەنمەکەمان لە ئاشی ئاو لێکرد.*

**ئاشیان** (ن.) خانوو، هێلانە، ئەو شوێنەی تێیدا دەحەسێینەوە: *ماڵمان ئاشیانی مەیە.*

**ئافەرین** (ن.) ١- دەستخۆشی، یان دەمخۆشی لێکردن: *ئافەرین بۆ وتە بەنرخەکەت.*

**ئاڤ** (ن.) ئاو: شلەیەکی بێ تام و بێ بۆن و بێ ڕەنگە: لەپلەی سەدی دەکوڵێتو دەبێتە هەڵم و لەپلەی سفر دەبێتە سەهۆڵ: *ئاڤ پێویستییەکی سەرەکی ژیانە.*

**ئاڤا** (ئان.) ئاوا، ئاوەدانی: *ماڵا وە ئاڤا.. کوڕێ وە ببیتە زاڤا.*

**ئاڤاکرن** (چ.) ئاوەدانکردن، دروستکردن، چاککردن: *گوندیا خانی ئاڤاکرن.*

**ئاڤاهی** (ن.) خانوویەرە: *من ئاڤاهییەك بۆ خۆ کڕی.*

**ئاڤەدان** (ئان.) ئاوەدان: *ماڵا تە ئاڤەدان بیت.*

**ئاڤڕدانەوە** (چ.) ئاوڕدانەوە: *ئاڤڕ لە مێژووی خۆمان دەدەینەوە.*

**ئـــاکنجی**: خـۆجیٚ، نیشـتەجیٚ: کـورد *ئاکنجی کوردستانێنە.*

**ئاکنجی بوون** (چ.) نیشتەجێبوون: من *لە هەولێر ئاکنجی بووم.*

**ئـــــــاکنجیکرن** (چ.) خـــــوجهکردن، نیشتەجێکردن.

**ئاگا** (ئان.) ١– چاولێبوون، چاودێر: *ئاگـــات لەماڵـــەوە بێـــت.* ٢– خەبەر، هـەواڵ: *ئاگات لـەدایکت هەیە؟* ٣– ناوی نێرینەیە.

**ئاگـــادار** (ئــان.) بــەئاگا، وریــا: *بـۆ پەڕینـەوە لـە شـەقام ئاگـاداری خۆت بە.*

**ئاگاداری** (ن.) ١– وریـایی، وشـیاریی: *ئاگـاداریی نەتـەوەیی پێویستە.* ٢– جـاڕ، بانگــەواز: *ئاگـاداری بەیانی پشووە!*

**ئاگر** (ن.) ئاور، ئـایر: ئـاگر *گـەرمایی و ڕووناکیمان پێدەبەخشێت.*

**ئـــــاگر کوژێنــــەرەوە** (ن.) ١– ئـــاگر ڤەمراندن، ئەو بوتڵەی کـە گـازی دژە ئــاگری تێدایــە: *پێویســتە ئـاگر کوژێنـــەرەوە لـــە هـــەموو ماڵـەك هـەبێت.* ٢– ئۆتۆمبێـل و فەرمانگەی ئاگر کوژێنەوە.

**ئـاگربـــاران** (ن.) زۆرجـــار لەمەیـــدانی شـــــەڕدا ئەوەنــــــدە چـــــەکی جۆراوجـــۆر بـــەکاردێن گوللـــە و پارچە وەکـو ئـاگر دەبـارن: *لـەو مەیدانە ئاگربارانە.*

**ئـاگربەست** (ئان.) ڕاگرتنی شـەڕ: *ئـاگر بەست باشترە لە شەڕکردن.*

**ئـاگرکەوتنەوە** (چ.) ئـاگر بەربوونـەوە، ئاگر تێبەر بوون: *ئاگر کەوتنەوە زیان بەخشە.*

**ئـــاگری** (ن.) نـاڤێ چیایەکێ مـەزن و ناڤداره ل ژووریـا کوردسـتانێ و هەندەك جاران دبێـژنێ ئـارارات: *شۆڕشی ئیحسان نوری پاشای ل ئاگری داغ دەستی پێکرد.*

**ئـاگرین** (ئـان.) ئـاورین، ئەگـەر تـۆ زۆر ئازاو بە کـار بیـت، بـە دلگـەرمی وانــەکانت بخوێنیــت وەك ئـــاگر چـــالاکێکانت ئـــەنجام بـــدەیت پێتدەلێن: ئاگرین.

**ئالی** (ن.) کەنار، لا، رەخ: *کی دێ مێتە ڤی ئالی؟*

**ئالیك** (ن.) ئالف، خواردنی گیانلەبەر: *ئالیك لە بەروبوومی کشتوکاڵ دروست دەکرێت.*

**ئاڵ** (ئان.) رەنگی سووری کاڵ: *رەنگی ئاڵ نیشانەی خەباتکردنە.*

**ئاڵا** (ن.) بەیداخ، بەندێر، ئاڵە: *ئاڵای کوردستان لە رەنگی سوور کەسك و سپی و زەرد پێکهاتووە.*

**ئاڵاهەڵکردن** (چ.) ئاڵا بەرزکردنەوە: *ئاڵا بەرزکردنەوە لە قوتابخانەکان نەریتێکی جوانە.*

**ئاڵتون** (ن.) زێڕ، زەر: *ئاڵتون کانزایەکی بەنرخە.*

**ئاڵوگۆڕ** (ن.) گۆڕینەوەی شتێك بە شتێك، کڕین و فرۆشتن: *لەم رۆژانەدا ئاڵوگۆڕی پەلەوەر کەم بووە*

**ئاڵووالا** (ئان.) رەنگاو رەنگ: *سروشتی کوردستان ئاڵووالایە..*

**ئاڵوودە** (ئان.) گیرۆدە، گرفتار، ئەشق، خووگرتن بە: *ئەوان ئاڵوودەی یەکترن بەبێ یەك هەڵناکەن.*

**ئاڵۆز** (ئان.) تێکهاڵاو، هاڵۆز، تەڤلهەڤ، تێکچڕژاو: *داوەکە باش هەڵکەوە نەئاڵۆزێت.*

**ئامادە** (ئان.) بەرهەڤ، ساز، حازر: *هەمیشە بۆ یارمەتیدانت ئامادەم.*

**ئامادەبوون** (چ.) بەرهەڤ بوون: *ئامادە بوون لە خۆشی و ناخۆشی دراوسێ پێویستە.*

**ئامادەکار** (ن.) بەرهەڤکار، سازکار: *سروە ئامادەکاری بەرنامەی منداڵانە.*

**ئامادەکردن** (چ.) سازدان، کارکردن، حازرکردن، بەرهەڤکرن: *شیرین کەلوپەلەکانی ئامادەکرد.*

**ئامادەیی** (ن.) ١– سازی، رێکوپێکی شت: *سازان بۆ راپەڕاندنی کارەکە ئامادەیی خۆی پێشاندا.*
٢– قوتابخانەی دوای ناوەندی: *ئازاد قوتابی قۆناخی ئامادەییە.*

**ئاماژە** (ن.) هێما، نیشانە، دەستنیشان: هەبوونی *ئاماژەکانی هاتوچۆ لەسەر ڕێگاکان زۆر گرنگە.*

**ئامان** (ن.) ١- پەنا بردن: *ئامان نەکەی ئەم کارە بکەیت.* ٢- قاپو قاچاغ: کابانێ ئامان کری.

**ئامانج** (ئان.) ئەو مەبەستەیە، کە دەتەوێت بیهێنیتەدی. کاتێك تۆ شوێنێك دەست نیشان دەکەیت، بۆ ئەوەی ڕووی تێبکەیت، ئەو شوێنە ئامانجی تۆیە

**ئامەدی** (ن.) شارۆچکەیەکە سەر بە شاری دهۆك.

**ئامراز** (ن.) ١- ئەوزار، ئامێر، کەرستە، ئەسباب، پێناو: *جاران جوتیاری کورد لە جووتکردندا ئامرازی گاسن، مێشو هەوجاڕو...* بەکاردەهێنا. ٢- لە ڕێزماندا بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، وەك: ئامرازی پەیوەندی، ئامرازی لێکدەر، ئامرازی گەیەنەرو...

**ئامۆژگار** (ئان.) ئامۆژیار، ئەو کەسەیە، کە ڕێی باشت نیشاندەدات: *مامۆستام ئامۆژگارمە.*

**ئامۆژگاری** (ن.) پەند، شیرەت، نسحەت، نەسیحەت : *وا باشە گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی مامۆستا بین.*

**ئامۆژگاریکردن** (چ.) ئەگەر تۆ ئامۆژگاری یەکێك بکەیت، دەتەوێت ئەو کارە بکات، کە تۆ بە باشی دەزانیت.

**ئامێر** (ن.) ئامراز: *ئامێری یەدەگی ئۆتۆمبێل پەیدا دەبێت.*

**ئامێز** (ن.) باوەش، بەرخوڤە: منداڵەکەم لە ئامێزدەگرم.

**ئانیشك** (ن.) ئەنیشك، هەنیشك، جومگەی نێوان پیلو باسك: *لە ناکاو ئانیشکەکی لێدا. ئانیشکی بە لوتم کەوت.*

**ئانین** (چ.) هێنان، ئینان: هەڤاڵێ من کامیرایەك ب دیاری بۆ من ئانی.

**ئاو** (ن.) بڕوانە: ئاڤ.

**ئاوا** (ن.) ١- ئاوەدان: *ماڵتان ئاوا بێت.* (ئان.) ٢- بەمجۆرە، ئەوها، وا، وەها: *کارەکە ئاوا کۆتایی پێدێت.*

**ئاوات** (ن.) هیڤی، حەز، داخواز، ئارەزوو: *بە ئاواتم سەرکەوێت.*

**ئاواز** (ن.) ١- دەنگی خۆش: *ئاوازی بولبول خۆشە.* ٢- دەنگی ئامێری میوزیک: *ئاوازی گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی کوردی خۆشە.* ٣- ناوە بۆ مێینە: *ئاواز کاری رۆژنامەوانی دەکات.*

**ئاواڵ** (ن.) برادەر، دەستە خوشک، هاوڕێ، هەڤاڵ، دۆست، هاوەڵ: *ئاواڵی باش لە کاتی تەنگانەدا دەردەکەوێت.* ٢- بە شتێک دەگوترێت، کە لەگەڵ شتێکی دیکە بەکاربێت، بۆ وێنە ئاوەڵکراس، کە ژنان لە ژێر کراس لەبەری دەکەن.

**ئاوایی** (ن.) ئاوەدانی: *ئاوایی بە نان و میوان دیارە.*

**ئاوەدان** (ن.) ئاوا، شوێنێک، کە ئاوا بێت، یان چۆڵ نەبێت: *ماڵی پیاوی مەرد هەردەم ئاوەدانە.*

**ئاوەدانکار** (ئان.) ئاوا کار، ئاڤاکار، *ئاوەدانکار ئەوکەسەیە، کە شوێنێک ئاوەدان دەکات.*

**ئاوبەر** (ن.) ئاوکێش، سەقا، سەقاڤ: *میرانی ئامێدی ئاوبەریان هەبوو.*

**ئاوبەند** (ن.) ١- بەربەستی ئاو، بەنداو، بەست: *دروستکردنی ئاوبەند سوودی جۆراوجۆری هەیە.* ٢- نەخۆشی زگ ئاوسان: *تووشی ئاوبەند بووە.*

**ئاودان** (چ.) ئاڤدان، ئاو پێدان: ئەم گوڵانە رۆژانە پێویستیان بە ئاودانە.

**ئاودەست** (ن.) ئاودەس، پێشاو، ئاودەستخانە: *لەدوای هاتنەدەر لە ئاودەست دەستم بەسابوون دەشۆم.*

**ئاودێر** (ن.) ئاڤیار، کەسێکە ئاوی شینایی بدات: *باوکی ئامەنگ ئاودێرە.*

**ئــــاودێری** (ن.) ئاویــاری، ئاڤیــاری: *وا باشـــە هەمیشـــە گرنگـــی بـــە ئـــاودێری خـــاکی کوردســـتان بدەین.*

**ئاوردن** (چ.) ئینــان، هێنــان، هــاوردن، ئـــانین: *ئـــاوردن بنەمایـــەکی سەرەکی بازرگانییە.*

**ئاوریشــم** (ن.) ئــارمووش، ئــارمیش، لیکاوی کرمی ئاوریشم، ئارمیش: چـــنراوی ئاوریشـــم نـــەرمو بریقەدارو بە بایەخە.

**ئاوڕدانـــەوە** (چ.) ئاڤڕدانەڤـــە: بـــە *ئاوڕدانـــەوە لـــە مێـــژوو ئاینـــدە دەنەخشێنین.*

**ئاوڕوو** (ن.) بڕوانە: ئـابڕوو.

**ئـــــاوزێ** (ن.) ئـــاوزە، هاوتەمـــەن، هاوشان: *ئـازاد و نـەوزاد ئـاوزێی یەکن.*

**ئـــاوس** (ن.) ئـاڤز، ئـاڤس، زگپـڕ، دوو گیـان: مانگاکـەمان ئـەم سـاڵە ئاوسە.

**ئاوســــــان** (چ.) پفبـــوون، پـــەنمان، هەڵاوســـان، ئەســـتوور بـــوون، وەرمـــــین، وەرمبـــــوون: *دوای بەربوونەوە پێم ئاوسا.*

**ئاوساو** (ئان.) پـەنماو، هەڵاوسـاو: *پێم ئاوساوە.*

**ئـــــاوگر** (ن.) ئــاڤگر: *ئــەم حــەوزە ئاوگرێکی چاکە.*

**ئاوگلدانـــەوە** (چ.) ئـاو کۆکردنـەوە لـە شوێنەك، بەری ئاوگرتنەوە، ئـاڤ پەنگاندن، ئاڤ خڕ کرن: *دوکـان شوێنێکی لەبارە بۆ ئاو گلدانەوە تا کارەبای لێ بەرهەم بێت.*

**ئـــاو و هـــەوا** (ن.) بـارودۆخ، کـەش، سەقا، ساردیو گـەرمیو هـەورو بـارانو بـا لـە شـوێنێکدا: *لـە هاوینـــــدا ئـــــاوو هـــــەوای کوێســـــتانەکانی کوردســـــتان خۆشە.*

**ئـــاوی** (ئـان.) ئـاڤی، رەنگـی ئـاوی، رەنگی ئاسمانێکی روون، شینی کاڵ: *رەنگـی پـەردەکانی ژووری کارزان ئاوییە.*

**ئاوی بەکار براو** (ئان.) ئاڤا پیس، ئاوی پیس: نابێ ئاوی بەکار براو تێکەڵ بە ئاوی پاك بکرێت.

**ئاوی خوڕ** (ن.) ئاڤا هەلاڤێتی: *ئاوی خوڕ بە چیادا دێتە خوارێ.*

**ئاوی سازگار** (ن.) ئاڤا زەلال: *ئاوی سازگار بخۆرەوە.*

**ئاوی شلەتێن** (ن.) ئاوێکە نە گەرمو نە سارد، ئاڤا تێنشیر: هەموو بەیانیان دەمو چاوم بە سابوونو ئاوی شلەتێن دەشۆم.

**ئاویلکە** (ن.) سەرە مەرگ، کاتی مردن، مردن، هەوزینگ، سەکەرات: *لە ئاویلکە داندا ناوی کچەکەی مەر دەهێنا.*

**ئاوێتە** (ن.) تێکەڵ، تێکەلاو، بەیەکدا چوو: *لە برادەرایەتیدا ئاوێتەی یەکتر بووین.*

**ئاوێزە** (ن.) کۆمەڵە چرایەکی پلپلەدارەو لە شووشە دروستکراوەو بە بنیمچەوە هەڵدەواسرێت.

**ئاوێنە** (ن.) قۆدیکا روناهییێ، خودیك، نەینۆك، نەینك، هاوێنە: *بەیانیان لەبەر ئاوێنە پرچی دادەهێنێ.*

ئاهەنگ

**ئاهەنگ** (ن.) ١. کۆڕی بەزمو شادیو خۆشی: *دوێنێ لە ئاهەنگی براکەم بووم.* ٢. ناوی مێینەیە: *ئاهەنگی خوشکم هات..*

**ئاهەنگی ژنهێنان** (ن.) ئاهەنگی ئەو دوو کەسەیە، کە لەو رۆژەدا ژیانی هاوسەرگیری پێکدەهێنن.

**ئاهەنگگێڕان** (چ.) سازکردن و بەڕێوەبردنی بەزم: *بۆ ئاهەنگگێڕانی برادەرەکەم داوەتکراوم.* .

**ئای** (ئام.) ١ـ هاوار لە ئێشان، وشەی خەفەت: *ئای لە نالەی نەخۆش چەند کاریگەرە.* ٢ـ وشەی

سەرسوڕمان: *ئای لەم فرۆکەیە چەند گەورەیە!*
**ئایـا** (ئـام.) ئـەریێ: *ئایـا هـەموو خشـۆکەکان پـەلیان هەیـە؟*
بڕوانە: **ئاخۆ**.

## ئاوی بەکار براو ــ ئایدز

**ئایـدز** (ن.) نەخۆشـیێکی کوشـندەیە، ئەوەی تووشـی ئـەو نەخۆشـییە دەبێـت، جەسـتەی بـەرگری سروشـتی بەرامبـەر نەخۆشـی نامێنێت: *تۆ تووچاری نەخۆشـی ئایـدز دەبیـت، ئەگـەر لەگـەڵ یەکێکـدا جـووت بوویـت، کـە نەخۆشی ئایدزی هەبێت.*

**ئەتلەس** (ن.) کتێبێکی گەورەیە نەخشەی وڵاتانی گێتی تێدایە.

**ئەتۆ** (ج.) تۆ، ئەتوو: *ئەتۆ مرۆڤێکی باشی*

**ئەحمەدی خانی** (ن.) (١٥٩١–١٦٥٢) ناڤێ هۆزانڤانەکێ کوردە: *ئەحمەدێ خانی داستانا مەم و زینێ ل (٤٤) سالیدا نڤیسییە.*

**ئەدەب** (ن.) ١– وشەیەکی عەرەبییە، وێژە، هۆزان، چیرۆک و پەخشان و...: *ئەدەب بەرهەمی بیرو هزری مرۆڤە.* ٢– شەرم، ڕەوشت، گرانی و سەنگینی لە هەڵسوکەوتدا: *لە بەرامبەر خەڵکیدا دەبێت زۆر بە ئەدەبەوە بجوڵێیتەوە.*

**ئەدەبی** (ن.) وێژەیی، هەر کارێک پەیوەندی بە وێژەوە هەبێت: *چیرۆک بەرهەمێکی ئەدەبییە.*

**ئەرد** (ن.) ئەرز، زەوی، هەرد، حارد: *ئەردی خۆم بە هەموو دنیا نادەم.*

**ئەرز** (ن.) بڕوانە: ئەرد.

**ئەرک** (ن.) ١– پێویستی سەرشان: *خوێندن ئەرکەکی ڕۆژانەی قوتابییە.* ٢– ڕەنج و

زەحمەتکێشان: دایکم ئەرکێکی زۆری کێشا، تا ئێمەی پێگەیاند.

**ئەرێ** (ئام.) ١- ئاخۆ: *ئەرێ ماڵی خۆی وەرگرت؟* ٢- بەڵێ، ئا: - تۆ بوویت؟ - ئەرێ.

**ئەرێ و نەرێ** (ن.) دوو دڵی و ڕاڕایی: *ئەرێو نەرێنی ناوێت؟*

**ئەز** (ج.) جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی یەکەمی تاک، من: *ئەز کوردم کوڕێ کوردامە.*

**ئەزموون** (ن.) تاقیکردنەوە، جەڕپاندن: *لە ئەزموونی نیوەی ساڵ بە یەکەم دەرچووم.*

**ئەژنۆ** (ن.) ئەژنوو، چۆک: *ئەژنۆ بەشێکە لە لاقی مرۆڤ.*

**ئەسپ** (ن.) هەسپ، ڕەخت، نێری ماین: *ئەسپ ئاژەڵێکی مرۆڤ دۆستە.*

**ئەسپایی** (ئان.) شێنەیی، هێواشی، لەسەرخۆ، هێدی: *بە ئەسپایی چوومە ژوورێ!.*

**ئەستەم** (ئان.) ١- حەستەم، زۆر کەم، ئاستەم: *دەستم بە ئەستەم برینـدار بـوو.* ٢- دژوار، ئاسـی، ئەستەم، عاسێ: *جێبەجێکردنی ئەم کارەم بەلاوە ئەستەم نییە.*

**ئەستەرلینی** (ن.) ناوی پارەیەکی ئینگلیزییە.

**ئەستری** (ن.) دڕك، خار، چقڵ، ستری: ئەستریم لە پێ ڕا چوو.

**ئەستێرك** (ن.) حەوز، گۆڵی ئاو، برکا ئاوی: من ئەستێرك تژی ئاوکر.

**ئەستوور** (ئان.) ستوێر، ستوور، دژی باریك: *زستانان پاڵتۆی ئەستوور لەبەر دەکەم.*

**ئەستۆ** (ن.) ١- بەرزایی نێوان سەرو شان، گەردەن، مل: *هەموو مرۆڤێك ئەستۆی هەیە.*

**ئەستێرە** (ن.) ستێر: *شەوان ئەستێرە لە ئاسمان دەبینرێن.*

**ئەسرین** (ن.) ڕۆندك، فرمێسك، ئەشك: ئەسرین بە خوڕ لە چاوی دەهاتنە خوار.

**ئەسیری** (ن.) هۆزانڤانەکی کوردی شاری کەرکوکە.

**ئەشکەنجە** (ن.) ئێشان، ئازار، چەرمەسەری: *مامم ژیانێکی پڕ لە ئەشکەنجەی بردە سەر.*

**ئەشکەنجەدان** (چ.) ئێشاندن، ئازاردان، نارەحەتکردنی کەسێك: *ئەشکەنجەدانی باڵندە کارێکی نا مرۆڤانەیە.*

ئەشکەوت

**ئەشکەوت** (ن.) شکەفت، ئەشکەفت: *لە چیاکانی کوردستاندا ئەشکەوت زۆرە.*

**ئەفسەر** (ن.) پلەیەکی لەشکرییە: *برام ئەفسەری لەشکری کوردستانە.*

**ئەڤ** (ج.) جێناوی نیشانەیە، ئەم: *ئەڤ ماڤینگەمە دلڤەکەرە.*

**ئەڤانە** (ج.) جێناوی نیشانەیە، ئەمانە: ئەڤانە قوتابخانە پاکژ کر.

**ئەڤە** (ج.): ئەوە: *ئەڤە مەیامەکە ئەز ل میڤیا تەمە.*

**ئەڤراز** (ن.) ١- هەوراز، بەرزایی: *هەر ئەڤرازیەکی سـ ر نڤیشەك هەیە* (پەندە) ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**ئەڤرۆ** (ئاك.) ئەمڕۆ، هەڤرو، ئیرۆ: *ئەڤرۆ بارانەکا زۆر باری.*

**ئەڤیندار** (ن.) دڵدار، شەیدا: *ئەڤینداری ئاخا خۆمە.*

**ئەکتەر** (ن.) *ئەو کەسەیە، کە لەسەر شانۆ، یان لە نێو فیلمی سینەمایی دەور دەگێڕێت.*

ئەکۆردیۆن

**ئەکۆردیۆن** (ن.) *ئامێرێکی مۆسیقایە، لە کاتی کردنەوەو داخستنیدا*

*ڕەنگێکی ئاوازەداری لێدەردەچێت..*

**ئەگەر** (ئام.) گەر، ئەر: *ئەگەر بخوێنی سەردەکەویت.*

**ئەگەرچی** (ئام.) گەرچی، هەرچەندە، لەگەڵ ئەوەش: *ئەگەرچی کات درەنگە، بەڵام هەر پێرادەگەم.*

**ئەگینا** (ئام.) ئەگەر نە: *جگەرە مەکێشە ئەگینا نەخۆش دەکەوی.*

**ئەلبۆم** (ن.) کتێبێکە لاپەڕەکانی بەتاڵن‌و هیچیان لەسەر نەنووسراوە، تۆ دەتوانیت وێنە یان پووڵو.... لەسەر بچەسپێنیت.

**ئەلفوبێ** (ن.) ئەو فەرهەنگەی بەر دەستت بەپێی ئەلفوبێی کوردی دانراوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە وشەکانی سەرەتای ئەم فەرهەنگە بە تیپی (ئا) دەست پێدەکات، دوای ئەو ب، پ، ... وشەکانی هەرە دواییش بە دوا تیپ دەست پێدەکات ، کە تیپی (ی)یە.

**ئەلند** (ن.) ئاسۆ، دەمکەل: *ئەلندا مە بەرزە.*

**ئەلهو** (ن.) ١- هەڵۆ: ئەلهو بلند دفڕن. ٢- ناڤێ چیایەکە دکەڤیتە باکووری باژێڕێ ئامێدیێ.

**ئەم**(ج.) ئەڤ، جێناوی نیشانەیە بۆ کەس‌و شوێنی نێزیك: *ئەم هات.*

**ئەمانە** (ئام.) ڤانە، ئەڤانە، ئەڤەنە: *ئەمانە ڕاڵەی ئێمەن.*

**ئەمبار**(ن.) ئەمار، عەمبار، عەنبار، شوێنێکە *دەغڵودانی تێدا دەپارێزرێت.*

**ئەمجارە**(ئاك.) ڤێ جارێ: *ئەمجارە پێکەوە دەچینە سەیران.*

**ئەمڕۆ**(ئاك.) بڕوانە: ئەڤڕۆ

**ئەمریکی**(ن.) هەلگری ڕەگەزنامەی ئەمریکا. *ئارمسترۆنگ ئاسمانگەڕەکی ئەمریکی بوو..*

**ئەمیش**(ج.) ئەڤی ژی ( بۆ نێزیکە): *ئەمیشم بۆ بێنە.*

ئەناناس

**ئەناناس** (ن.) جۆرە میوەیەکە، لە ولأتانی گەرمدا دەڕوێت، ناوەوەی ئەناناس ڕەنگی زەردە.

**ئەنجام** (ن.) دوماهی، کۆتایی،ئاکام، سەرەنجام: *کاری باش ئەنجامی باشی دەبێت.*

**ئەنجامدان** (چ.) بەجێهێنان، بجەهـ ئینان، جێهبەجێهکرن، بەجێگەیاندن، کار راپەڕاندن،: *شالأو کارەکەی بەجوانی ئەنجامدا.*

**ئەنجومەن** (ن.) کۆڕ، کۆ، لێژنەیەکە یا دەستەیەکە لە کۆمەڵە کەسێك پێکدێت بۆ ئەوەی لە بابەتەك بدوێن و بکۆڵنەوە: *دایکم سەرۆکی ئەنجومەنی دایکانە.*

**ئەندازیار** (ن.) ئەندازەزان، ئەندازەگر، دەرچووی کۆلیژی ئەندازیاری: *ئەندازیار نەخشەی ڕێگاو بان و خانووبەرە دەکێشێت.*

**ئەندام** (ن.) ١– ئەندامی ڕێکخراوێك، یان کۆمەڵەیەك، گروپێك، واتا کەسێکە بۆ ئەو ڕێکخراوە دەگەڕێتەوە، کە کاری تێدا دەکات، ئەندامی خێزان کەسێکە، کە سەر بەو خێزانەیە: *باوکم ئەندامی کۆمەڵەی جوتیارانە* ٢– بەشەك لە لەش: *دەستم ئەندامەکە لە بەدەنم.*

**ئەنفال** (ن.) ئەنفال ناوی ئەو تاوانە بەدناوەیە، کە ڕژێمی ڕەگەز پەرستی بەعس ٢٠٠هەزار کەسی کوردی پێ بێسەرو شوێنکردن: د ئەنفالادا کارێن نامرۆڤانە هاتنەکرن.

**ئەنگوست** (ن.) قامك، پل.تبل، پەنجە: *منـــدالّ بـــۆ ژمـــاردنی شـــت ئەنگوستی بەكاردێنێت.*

**ئەنگوستیلە** (ن.) گوستیلە، گرستیرك: *مانـــا ئەنگوســـتیلەیەكی زیـــوی كڕی.*

**ئەنی** (ن.) ناوچاوان، تەوێل، ناڤ چاڤ، پشـــكەكە ژ ئەنـــدامێن ســـەری: *ئەنیا خۆ نەكە گرێ.*

**ئـــەو** (ج.) وی، ویّ، جێنـــاوی كەســـی سێیەمی تاكە: *ئەو دۆستێ منە.*

**ئەوا** (ئاك.) وا، نهۆ، نوكە: *ئەوا ماتم.*

**ئـــەوە** (ج.) ئەڤـــە: *ئـــەوە ئـــازادە دۆی دەوێ..*

**ئەوەنـــدە** (ئـــاك.) ١- هنـــدە، هنـــدێ: *ئەوەنـــــدەی چـــــاوم تـــــێرم خۆشـــدەوێت.* ٢- بــــە قـــەد: *ئەوەندەی مامۆستایەك دەزانێ.*

**ئـــــەوەیان** (ج.) ١- ئەمـــــەیان: *لــــەو پێنووســـانە ئـــەوەیان باشـــە.* ٢- لەم یەكە: *لەو قوتابیانە ئەوەیان بە یەكەم دەرچوو.*

**ئەوبـــەر** (ئـاك.) لایێ دی، رەخـــێ دی: *ماڕە لە ئەوبەر جادە وەستاوە.*

**ئەوپەڕ** (ئـاك.) ئـەو بـەر، لایـەكی دی، دوایی، ئەو پەڕی، هەرە دوایـی، بنـەبان، لـە كۆتـایی: *ئـازاد لـە ئەوپـەڕی شـارەوە كەیشـتۆتە ئێرە.*

**ئەوتۆ** (ئان.) وەسا، ئەوسا: پێویستە *ڕووەك لـــە شـــوێنێكی ئـــەوتۆ بچێنرێت ڕووناكیی لێی بدات.*

**ئـــــەودالّ** (ئـــان.) مـــژویل، پـــرێـیش، هـــەڵوەدا، وێـــلّ، ســـەرگەردان، عەڤدال: *دارا ئەودالّی خوێندنە.*

**ئـــــەودالّی** (ن.) مـــژویلی، پرێیشـــــی، دەربـــەدەری: *زۆرجـــار كەســـێك هەیە وێلّ و سەرگەردانی یەكێكی دی دەبێت، پێی دەڵێن ئـەودالّی بوو.*

**ئەورووپا** (ن.) كیشـوەرەكە لـە حـەوت كیشـــوەرەكەی جیهـــان: چـیای ئــــۆڕالّ دەكەوێتـــــە نێـــــوان كیشوەری ئاسیاو ئەورووپا.

ئەوزار (ن.) ئامێر، ئالەت، ئامراز: *ئێمە ئەوزاری دەستی کەس نین.*

ئەوسا (ئاك.) ئەمجا، ئەڤجا، پاشی، ئینجا: میوە چاك بشۆ *ئەوسا بیخۆ.*

ئەو کاتە (ئاك.) هنگی، وی دەمی، وی وەختی: *ئەو کاتە دلشاد دەبم، کە کورد ببێ بە دەوڵەت.*

ئـــەوین (ن.) خۆشەویستی، ئـەڤین: *ئـەوینی مـرۆڤ بـۆ وڵاتەکـەی دلسۆزییە.*

ئەوێ (ئاك.) وێرێ، وێ درێ: *سەردانی ئەوێم کرد.*

ئەهریمەن (ن.) هێزی تاریکی و شەڕە لە ئایینی زەردەشتیدا.

ئەی (ئام.) وشەی بانگکردن و هوشیار کرنەوەیە: *ئەی مەڤاڵ ئاگاداری خۆت بە.*

ئوردن (ن.) ناڤێ وەلاتـەکێ عەرەبییـە: *ئوردن دەکەوێتە بەری ڕۆژئاوای عیراق.*

ئومێـد (ن.) ١- هیـوا، هیڤی، ئـاوات: *ئومێدا من ئەوە، هوین هەرد باشـبن.* ٢- نـاوە بـۆ مێینـەو نێرینـە: *ئومێـد سـەردانی سلێمانی دەکات.*

ئۆتـۆمۆبێل (ن.) ئۆتۆمبێل، ترومبێـل، ماشـێن: *ئۆتۆموبێـل ئامرازەکی سەرەکی گواستنەوەیە.*

ئۆتۆنـۆمی (ن.) حـوکمی زاتـی، خـود موختـاری: *لـە یـازدەی ئـاداری سـالی ١٩٧٠دا باشـووری کوردسـتان ئۆتۆنـۆمی دەستخست.*

ئۆف (ئام.) هاواری دەردو ئازار: *ئۆف لە دەست کاری ناڕەوا.*

ئـۆقرە (ن.) ئـارامی: *مرۆڤـی شـپرزە ئۆقرە ناگرێت*

ئۆقیـانوس (ن.) دەریـالوش: *ئۆقیانووسـی ئەتڵەسـی گەلـەك فراوانە.*

ئـۆی (ئـام.) ١ـ هـاوار لـە دەسـت ئێشـوئازار: *ئۆی! چاوم چەند دێشێت.* ٢ـ سەرسـوڕمان (!): *ئۆی ئەم گوڵە چەند جوانە!*

**ئۆین** (ئان.) ١- وشەیەکی تورکییە، ناز: *کچەکەم زۆر ئۆینبازە.* ٢- نۆبەت، نۆرە، کەڕەت: ئۆینی کێیە؟ ٣- یەک دەست لە یاریدا: ئۆینێکم لێبردەوە.

**ئیتالی** (ن.) هەڵگری ڕەگەزنامەی ئیتالیا: *ئەم پیاوە ئیتالییە.*

**ئیتاڵیا** (ن.) وڵاتێکە لە کیشوەری ئەورووپا: ئیتاڵیا خاوەن شارستانییەتێکی دێرینە.

**ئیجاخ** (ن.) هۆز، عەشیرەت، بنەماڵ: *هەمەوەند ئیجاخەکی شاری کەرکوکە.*

**ئیدی** (ن.) ١- هی دی، ئیدیکە: *لەم جۆرە خامەیە نا، ئیدیت هەیە؟* ٢- جارێکی دی: *ئیدی کاری وا روونادات. ئیدی تو پاش ناکەڤی.*

**ئیش** (ن.) شۆل، کار: *ئیشی قوتابی خوێندن و فێربوونە.*

**ئیلخانی** (ن.) سوڵتان ئیلخان نەڤیێ هولاکۆی بوو.

**ئیمام قاسم** (ن.) گەڕەکەکە لەکەرکوک..

**ئیمپراتۆرییەت** (ن.) دەسەڵاتی دەوڵەتێکە بەسەر چەند دەوڵەتێکی دیدا: *ئیمپراتۆرییەتی میدیا دەسەڵاتی بەسەر وڵاتانی دەوروبەریدا هەبوو.*

**ئیمڕۆ** (ئاك.) بڕوانە: ئەڤڕۆ.

**ئینان** (چ.) هێنان، ئانین، هاوردن، ئاوردن: *وێ ب خۆ نامە ئینان.*

**ئینجا** (ئام.) ئەمجا، جا، ڤێجا، ئەوکات، پاشان، پاشتر، دوایی: *وانەکانم دەنووسم ئینجا دەخەوم.*

ئینجانە

**ئینجانە** (ن.) گوڵدان، قافك، دەفرەکە لە قوڕو گڵ دروستدەکرێ بۆ ئەوەی گوڵی تێدا بچێندرێت.

**ئینگلیــزی** (ن.) ئێمــه، کــه دەڵــێین ئینگلیــزی مەبەســت لەهــەر شــتێکە، کــە پەیوەنــدی بــە ئینگلیـزەوە هــەبێت، بــەڵام بــە شـێوەیەکی گشـتی ئینگلیـزی بەرامبــەر زمــانی ئینگلیــزی بەکاردێنین: *زمانی ئینگلیزی لە زۆر شـوێنی جیهانـدا قسـەی پێدەکرێت.*

**ئێ** (ئام.) باشە، بەڵێ: *ئێ وا دێم.*

**ئێخســـتن** (ن.) تێخســـتن، تێـداکرن: *مامۆسـتای ئـەڤینا خوێنـدنێ ئێخستییە دلێ من.*

**ئێـــران** (ن.) دەوڵەتەکــە دکەڤیتــە ڕۆژهەلاتێ کوردستانێ.

**ئێــرە** (ئـاك.) ڤێـرە: *ئێـرە جێگـەی فێربوونی پەروەردەو زانستە.*

**ئێــزدی** (ن.) ئێـزد پەرسـت، یـەزدان پەرســـت: *ئێـــزدی کـــوردی ڕەسەنن.*

**ئێستا** (ئاك.) نهۆ، هەنووکـە، نووکـە: *ئێستا کاتی کارکردنە.*

**ئێســتگە** (ن.) ١- ئێزگـەه، وێسـتگە: *ئێستگەی ڕادیـۆی کوردسـتان دەنگی شۆڕشی کورد بوو.* ٢- وەســـتانجێ، کـــاروان ســـەرای شــــەمەندەفەر: *ئێســــتگەی شـەمەندەفەری هـەولێر نـۆژەن دەکرێتەوە.*

**ئێسك** (ن.) هێسك، هەسـتی، ئێسـقان، هەسـتیك: *باسـك لـە ئێسـکی زەندو کەوەرە پێکهاتووە.*

**ئێسـکە پەیکـەر** (ن.) هەسـتیکبەند: *ئێسکە پەیکەری مرۆڤی کۆن لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزرایەوە.*

**ئێســکە نەرمــە** (ن.) نەرمــە هەسـتی، جۆرە نەخۆشییەکی لەشـە، کـە تووشی مرۆڤ دەبێ ناتوانێ خۆی لەسەر پێ ڕابگرێت.

**ئێسـکدار** (ن.) هەسـتیدار: *مـەڕو گـاو مریشـك و ماسـی گیانـەوەری ئێسکدارن.*

**ئێسـکگران** (ئـان.) ڕەزا گـران، ئێسـك قـورس، کرێـت، خـوێن تـاڵ، هەسـتی گـران: *مرۆڤـی ئێسـك گران پەسەند نییە.*

**ئێسك و پرووسك** (ن.) ئێسکی پووكو ڕزیو: *ئێسك و پرووسکی ئادەمزادی کورد لە زیندە بە چاڵانی سەددام دۆزراوەتەوە.*

**ئێسك سووك** (ئان.) ڕەزا سووك، خوێن شیرین: *خوشکم منداڵەکی ئێسك سووکی هەیە.*

**ئێسکی ڕووپان** (ئان.) هەستیێ ڕووی پان.

**ئێسکی گوێی** (ئان.) هەستیێ گرۆفڕ.

**ئێسکی لوولەیی** (ئان.) هەستیێ لویلەیی.

**ئێشاندن** (چ.) ئەشکەنجەدان، ئازاردان: *ئێشاندنی منداڵان کارێکی دژوارە*

**ئێشکگر** (ن.) نۆبەدار، پاسەوان: شەوانە دەرمانخانەیەك ئێشکگرە.

**ئێك** (ئان.) یێك، یەك، ژمارە یەك، ژمارەی سەرەتا، دانەیەك: *خودێ ئێکە نابیت بە دوو.*

**ئێکەم** (ئان.) یەکەم: *ژیار ئێکەمێ پۆلا خۆیە.*

**ئێکو دوو** (ئاك.) یەکتری: *ئەزو زانا باش ئێکو دوو ناس دکەین.*

**ئێکێ** (ئان.) یەکەمین: نازدار سەرکەڤتیا ئێکێ بوو.

**ئێمە** (ج.) مە، ئەم، جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی یەکەمی کۆ: *ئێمە چووینە دمۆك.*

ئێوارە

**ئێوارە** (ئاك.) ئێوار، هێوار، ئێڤار، تاریکانە، وێرەگا: *کە ئێوارە دامات پشوو دەدەم.*

**ئێوە** (ج.) هەوە، وە، هنك، ئەنگۆ، هەنگۆ، هوون، جێناوی کەسی دووەمی کۆیە. *منداڵانی ئێوە نەوەی دوا ڕۆژن.*

**بـا** ١- وشـەی وەڵامدانـەوە بـە مانـای بەڵێ، ئا، ئاریێ: *تۆ نەچووی؟ با چـووم.* ٢ـ هـەوا، کـە لـە شوێنێکەوە بەرەو شوێنێکی دی هەڵدەکات: *هەنـدێک جار لەگـەڵ بـەفرو بـاران بایـەکی تونـد هەڵدەکات.*

**باب** (ن.) باوك، باو، باڤ: *بابی شڤانی مامۆستایە.*

**بابان** (ن.) بنەماڵەیەکی کۆنی کوردە لـە بنچـینەدا موکریـانین وەکـو میرنشینەك لە ناوچەی سلێمانی و شـارەزوور حوکمڕانییـان کـردووە: *قەڵاچواڵان پایتـەختی بابانەکان بوو.*

**بابـە** (ن.) باوکـە، بـاوە، لـە کـاتی بانگکردنـدا لـە لایـەن منداڵـەوە بـەکاردێت: *بابـە یارمـەتیت پێناوێت؟*

**بابـەت** (ن.) ١- جـۆر، چەشـن: *چ بابەتە کوتاڵێکی نـوێی هێنـاوە؟* ٢- مـژار، لەمـەڕ، دەربـارە: *لـە بابەت چـی بـدوێین؟* ٣- بـاس، لێکۆڵینـەوە: *بابـەتێکی سەرنجڕاکێشـم لەسـەر ئاژەڵـە کێوییەکان خوێندەوە.*

**بابە گەورە** (ن.) باپیر، باپیرە، بـاوکی باوك، بـاوکی دایـك: *بابە گـەورە چـیرۆکی خۆشمـان بـۆ دەگێڕێتەوە.*

بابە گوڕگوڕ

**بابە گوڕگوڕ** (ن.) ١- گەڕەک‌و ناوچەیەکی کەرکوکە، بە نەوت بەناوبانگەو چەندین بیرە نەوتی تێدایە: یەکەمین کێڵگەی نەوت لە بابە گوڕگوڕ دۆزرایەوە.٢- ناوی پیاو چاکێکە.

**بابۆڵکە** (ئان.) ١- پارووە نانی پێچراوی ئەستووری درێژ، بالوولك،بابۆڵە، قوماتك: دایە گیان بابۆڵکەکم بۆ دانێ بیخۆم. ٢- مەلۆتکە، منداڵی پێچراو: ئەم بابۆڵکە ساوایە بە چاکی لە باوەش بگرە..

**باپیرە** (ن.) بابە گەورە، ،باپیر، باوکی باوك‌و دایك (لە دۆخی بانگکردن دایە): بڕوانە: بابە گەورە.

**باج** (ن.) باژ، خویك، ئەو پارەیەیە کە میری لە خەڵکی وەردەگرێت لەبەرامبەر هەبوونی زەوی‌و زارو خانووبەرەو کەلوپەلی بازرگانی: *لە وڵاتانی ئەورووپا هەموو شتێ باجی لەسەرە.*

**باخ** (ن.) ١- باغ، شوێنی دارودرەختی بە بەرو بێبەرو گوڵ‌و گوڵزار: *ماڵی ئازاد لە هەوارەکەیاندا باخەکی گەورەی میوەیان هەیە.* ٢- *شوێنی حەسانەوە: ئێوارە لە باخی شاردا چاوەڕێت دەکەم.*

**باخەوان** (ن.) باغەوان، باغەڤان. ئەو کەسەیە، کە لە نێو باخدا کاردەکات: *باخەکەمان باخەوانەکی باشی هەیە.*

**باخچە** (ن.) باغچە، باخی بچووك: *باخچەی ماڵەوەمان پڕ لە گوڵی جوانە.*

**باخچەی هەڵواسراو** (ن.) باغی هەڵواسراو: نەبوخەزنوسەر *باخچەی هەڵواسراوی بۆ*

کوردو ئازادکردنی خاکی کوردستاندا خەباتیکردووەو باوکی رۆحی کوردەو قوتابخانەی کوردایەتییە: *شۆڕشی ئەیلول بە ڕێبەرایەتی بارزانی نەمر هەلگیرسا.*

**بارستایی** (ن.) بارست، بارسایی، دەوارەیی، کێش‌و قەبارەو قورسایی: *هەموو شتێك لە دەورو پشتمان کێش و بارستایی هەیە.*

**بارگرژی** (ن.) ئالۆزی، تێکچوون، ناڕێکی، پشێوی، بێ سەروبەری: *لە کاتی بارگرژیدا ئابووری ولات کز دەبێ.*

**بارودۆخ** (ن.) ڕەوش، باری ولات، سەروبەر، چلۆنەتی: *بارودۆخی کوردستان هێمنە.*

**باریك** (ئان.) هەر شتێکی، کە ئەستوور نەبوو باریکە: سەماکەرەکە کیژێکی قەد باریك بوو.

**باڕە** (ن.) دەنگی ئاژەڵ، بە تایبەتی دەنگی مەڕ، کە دەباڕێنن، کە دەڵێن باڕە باڕی مەڕ.

**باز** (ن.) ١- مەلی راوکەر، باڵندەیەکی گۆشتخۆرە. ٢- خۆ هەڵدانی لە تەکدا، کۆڕ خواردنەوە: زۆر حەزم لە یاری بازدانە.

بازدان

**بازدان** (چ.) قەڵەمبازی، خۆ هەڵدان: *مەیموون لەسەر داران باز دەدات.*

**بازرگانی** (ن.) کڕین‌و فرۆشتن، ئاڵوگۆڕ: *پێشکەوتنی بازرگانی باری ئابووی ولات پێشدەخات.*

**بازگە** ( ن.) ١- شوێنی خۆهەڵدان، شوێنی بازدان: *لە بازگەکەوە خۆم هاوێشتە ناو ئاوەوە.* ٢- شوێنی چاودێریکردنی هاولاتیان لە هاتوچۆ کردندا: *بازگەکان ئاسایشی کوردستان دەپارێزن.*

**بازوو** (ن.) باهۆ، باسک، قۆڵ: بە دەستو بازووی خۆم دەژیم.

**بازێڕ** (ن.) ١- شار: *دهۆك بازێڕەكی خۆشە.* ٢- بازاڕ: كۆمەڵە دوكانێكە، كە دەتوانیت هەموو جۆرە شتێكی تێدا بكڕیت.

**باش** (ئان.) دژی خراپ، چاك: *خوێندنی باش ئەنجامی باشە. مرۆڤی باش جێگای ڕێزلێگرتنە.*

**باشوور** (ن.) ژێری، خواروو، لای خوارەوەی نەخشەیە: *من لە باشووری كوردستاندا دەژیم.*

**باغ** (ن.) بڕوانە: باخ.

**باغەڤان** (ن.) بڕوانە: باخەوان.

**باكوور** (ن.) ژووری، ژووروو، سەروو، ڕووكاری سەرەوەی نەخشەیە: *دیجلەو فورات لە باكووری كوردستان هەڵدەقوڵێن.*

**باگۆڕكێ** (ن.) با گوهوڕین.

**باگێڕ** (ن.) با زڤرۆك، گەردەلوول، باهۆز، گێژەڵووكە، گەردەوێژ: *پاییزان باگێڕ زۆر دەبن.*

**باڵ** (ن.) ١- ئەو دوو ئەندامەی لە جێگەی دەستی مرۆڤن و باڵندە پێیان دەفڕێت: *باڵندە دوو باڵی هەیە.* ٢- جۆرە پێوانەیەكە، جاران بەكار دەهات، كە لە پەنجەی دەستەوە تا چەناگە دەگرێتەوە: *پارچە قوماشەكە نزیكەی چوار باڵ بوو.*

**باڵا** (ن.) ١- قەد، بەژن: *شۆخ كچەكی باڵا بەرزە.* ٢- بەرز، بڵند، گەورە: *تەلارەكی باڵایان بۆ دەزگاكە دروستكردووە.*

**باڵابەرز** (ئان.) بەژن درێژ، كەڵەگەت: *سپینداری شاتان دارەكی باڵا بەرزە.*

باڵەخانە

**باڵەخانە** (ن.) تەلار، كۆچك، كۆشك، قەسر: سەردانی باڵەخانەی كۆشكی هونەرم كرد.

**باڵدار** (ن.) باڵندە، مەل، هەر گیاندارەك، كە باڵی هەبێ: *هەندێك مێروو باڵدارن.*

**باڵچۆغە** (ن.) شوێنی شەڕ، ڕەزمگە، قادا شەڕی، مەیدانا شەڕی: *دوو تیپە سەربازەکان لە باڵچۆغە بە یەک گەیشتن* ٢- ئەو شوێنەی شیر کە دەستی تێدەگیرێ (دەسك): دەستی خستە سەر *باڵچۆغەی شیرەکەی و ڕایکێشا.*

**باڵندە** (ن.) مەل، باڵدار، پەلەوەر، پەڕندە: کەو باڵندەیەکی چیاییە.

**بانك** (ن.) بانق، شوێنی پارە لێدانان و گۆڕینەوە یان وەرگرتن: *مووچەکەمان لە بانك وەردەگرێت.*

**بانگ** (ن.) ١- دەنگ، هەرا: دە هەندەك كڕ بەوە ئەم بانگو هاوارەت لە چییە؟ ٢- بانگی ئاگادار کردنەوە بۆ نوێژ، بانگی نوێژ: *دوای بانگی ئێوارە درەنگ گەیشتەجێ.*

**بانگەواز** (ن.) بانگهێشت، گازی، ئاگاداری: *بانگەواز مزکاری ئاگادارکردنەوەی خەڵکییە.*

**بانگدێر** (ن.) بانگهەڵدێر، بانگدەر، بانگوێژ: *مامۆستاکەمان بە پیشەی بانگدێری دامەزراوە.*

**باواجی** (ن.) چیایەکە لە شاری کۆیە: *من بەچیای باواجی هەڵگەڕام.*

**باوبۆران** (ن.) بای بەهێزو بە باران، با كوزیرك: *باوبۆرانەکی بەهێز بەڕێوەیە.*

**باوەش** (ن.) باووش، هامێز، ئامێز: *ئێستاشی لەگەڵدا بێت تامەزرۆی باوەشی دایکم.*

**باهۆز** (ن.) ڕەشەبا، گەردەلوول، هوڕەبا: ئەڤ ساڵە باهۆز گەلەك هاتن.

**بایەخ** (ن.) گرنگی، بەها: *منداڵ نەوەی دوا ڕۆژە بۆیە پێویستە بایەخی زۆری پێ بدرێت.*

**بایەوان** (ن.) پاپۆڕی چارۆکەدار: *بایەوانەکە گەیشتە لێواری زەریا.*

**بای حەسەن** (ن.) *بای حەسەن کێڵگەیەکی نەوتە لە کەرکووك.*

**بــە** (ئـام.) *ئـامرازی پێوەندییــەو هەمیشـــە دەکەوێتـــە پـــێش کۆمەڵـەی نـاو ( نـاو، ئاوەڵنـاو، جێنـاو، چـاوگ): بــە شــاردا تێپەڕیم.*

**بە بڕشت** (ئان.) ١– بە پێز، بە پیتو بڕێز: *ئەمساڵ زەوییەکەمان بە بڕشت بوو.*٢– بـەهێزو بـەکار: *ئازاد پیاوەکی بە بڕشتە.*

**بە پەرۆشـەوە** (ئـاک.) بـە هەوەسـەکی زۆرەوە: *بە پەرۆشەوە هاوکاریت دەکەم.*

**بە پەلە** (ئـاک.) بلـەز، خێـرا: *بە پەلـە چێشتەکەم خوارد.*

**بە پێڵ** (ئـان.) شـەپۆڵدار: *زەریایـەکی بە پێڵە.*

**بــە پێی** (ئـاک.) لـدویڤ، لپـەی، بـە گــوێرەی: *بــە پێـــی ئـــەوەی مامۆسـتام بۆیـە ئاگـاداری ئـەو بابەتەم.*

**بەتایبــەتی** (ئـاک.) نەخاسمــە: *مــن ئێوەم خۆش دەوێ، بەتایبـەتی تۆ.*

**بەتەنگەوەهاتن** (چ.) خەم لێخـواردن، بـە پـیرەوە چـوون: *دایکـم بـە تەنگ منداڵەکە هات.*

**بــەتین** (ئـان.) دژوار، بـەهێز: *تیشـکی خۆر لە هاویندا بە تینە.*

**بەجێ** (ئان.) قسەیەك یا کارێك لـەجێی خـۆی بـێ، گرنگـە، پەسـندە: *قسەکەت بەجێیە.*

**بەجێمان** (چ.) دوا کەوتن: ئێمـە زووتـر هــاتین رەنگبــێ ئــەوان بــەجێ مابن.

**بــەجێهێنان** (چ.) بجهینان،بجهئینـان، جێبەجێکردن: پێویسـتە رۆژانـە ئەرکـەکانت بـەجێ بهێنــی، بـۆ ئەوەی دوا نەکەوی.

**بەچــکە** (ن.) بەچـە، بێچـووی باڵـدار، تێشك، جووچك: مریشـکەکە بـە دوای بەچکەکانیدا وێڵە.

**بــــەخت** (ن.) چــارە، نێوچــــەوان، چـــارەنووس: *لــــەم کارەمــــدا هەمیشە بەخت یاوەرم بووە.*

**بەختـــــەوەر** (ئـــان.) خۆشـــبەخت، کامەران، شاد، دڵشاد، دڵخۆش،

بەختیار: *ئێمە بەماتنتان بەختەوەرین.*

**بەختیار** (ئان.) ١- بەختەوەر، شاد، کامەران، دڵخۆش، خودان بەخت: *مێڤیدارم ژیانەکا بەختیار ببەیەسەر.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**بەخشندە** (ئان.) چاوتێر، میهرەبان، دلۆڤان: *دایك بەخشندەیە.*

**بەخشیش** (ن.) بڕە پارەیەکە دەیبەخشیت بە یەکێك بۆ پێشاندانی پێزانینت بەرامبەر بە کارێك. بۆ وێنە بەخشیش بە خزمەتکاری ئوتێلێك، چێشتهێنەری چێشتخانەیەك دەدەیت.

**بەخشین** (چ.) ١- پێدانی بێ بەرامبەر: *قەڵەمەکەی خۆمت پێ دەبەخشم.* ٢- لێبووردن، لێبوورین، پێهێلان، عەفوکردن: *بەخشین نیشانەی بەمێزییە.*

**بەخۆڕایی** (ئان.) ١- بێ پارە، بەلاش، بێ بەرامبەر: *خوێندن لە کوردستان بە خۆڕاییە.* ٢- لە خوت و خۆڕا، بەبێ‌هۆ: *بە خۆڕایی کارەکەی بەجێهێشت.*

**بەخێر** (ئان.) ١- خێردار، بە قازانج، بەهرەوەر: *بەخێر بێن بۆ لامان.* ٢- بێ بەرامبەر: *دایکم زۆرجار بەخێر نان دەبەخشێتەوە.*

**بەخێرایی** (ئاك.) خێرا، بلەز: *بە خێرایی ڕۆیشت و هاتەوە.*

**بەخێرهاتن** (چ.) خۆشهاتن، بەخێر هێنان: *گەر مێوانەکتان هات بەخێرهاتنی بکە.*

**بەخێوکەر** (ن.) بخودانکەر، بەڕێوەبەر، پەروەردەکار: *بەخێوکەری قوتابی پێویستە هەردەم ئاگاداری بێت.*

**بەخێوکردن** (چ.) پەروەردە کردن، خودانکرن: *منداڵ بەخێو کردن هونەرە.*

**بەد** (ئان.) خراپ، خرا: *کاری بەد لە قوتابی ناوەشێتەوە.*

**بەداخەوە** (ئاك.) مخابن: گەر بتەوێت چاوت بە خۆشەویستێکت

بکەوێتو بچیتەماڵیانو لەوێ نەبێت، دەڵێیت: بەداخەوە لە ماڵ نەبوو...

**بەدەگمەن** (ئاك.) زۆر کەم: *ئازاد بە دەگمەن یاری تۆپی پێ دەکات.*

**بەد بین** (ئان.) رەش بین: لە *دوا رۆژت بەد بین مەبە.*

**بەدخۆراکی** (ن.) کەم خۆراکی، خۆراکی خراپ: *گەر مرۆڤ تووشی بەد خۆراکی بوو پێویستە زوو چارەسەر بکرێ.*

**بەدکار** (ئان.) کەسێك کاری خراپ ئەنجام بدات.

**بەدلیس** (ن.) ناوی شارەکی باکووری کوردستانە: *میر شەرەفخان خەڵکی بەدلیسە.*

**بەد مەست** (ئان.) فرە سەرخۆش، سەرخۆشەکی بێهۆش: *بەد مەست زیان بە خۆیو کۆمەڵ دەگەیەنێت.*

**بەدیکردن** (چ.) دیتن، بینین: ئەو لە دوورەوە منی بەدیکرد.

**بەدیهێنان** (چ.) ئەنجامدان، بەدەست هێنان، جێبەجێکردن، ب جهێنان: *بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەمان پێویستە هەمیشە تێبکۆشین.*

**بەر** (ن.) ١– سینگو بەرۆك: *لە پڕ پەلاماری داو بەری سینگی گرت.* ٢– میوەو بەرهەمی دارو بێستان: *ئەمساڵ باخچەکەمان بەرێکی باشی گرتووە.* (ن.) ٣– بەرد، کوچك، سەنگ: *کەلها ئامێدیێ ل سەر بەری ماتییە ئاڤاکرن.* ٤– پێش : *ئەو بەر لە من رۆیشت، بۆیە زووتر گەیشتە جێ.* ٥– روو: *ئەو قوماشە دوو بەرە.*

**بەرات** (ن.) ١– ئەو پارەو خەڵاتەیە، کە وەك بەخشین دەبردرێتەوەو دابەش دەکرێت. ٢– شەوی بەرات: لای موسڵمانان پیرۆزەو رێکەوتی پانزەی مانگی شەعبانە، بەپێی ئایینی ئیسلام لەو شەوەدا رزقو رۆزی هەر

کەس لەلایەن خودلوەوە دیاریدەکرێت: *شەڤا بەراتێ شەڤەکا پیرۆزە.*

**بەراستی** (ئاك.) بە دروستی ، بە کردەوە، بە تەواوی: *ئەو بەراستی مامۆستایە.*

**بەراو** (ئان.) ئەو زەوییەی کە ئاوەکی باشی هەبێ: زەوییەکانی ئێمە هەمووی بەراون.

**بەراورد** (ن.) بەراوەرد، هەمبەر ئەگەر نمرەکانی دەستە خوشکەکەت لەگەڵ نمرەکانی خۆت بەرامبەری یەك دانساو سەیرتکردن، مانای ئەوەیە بەراوردی نمرەی دەستە خوشکت و هی خۆت دەکەیت.

**بەراوردی** (ن.) هەڤبەری. بڕوانە: بەراورد.

**بەرامبەر** (ئاك.) بەرانبەر، بەرابەر، لەپێش، هەمبەر: *گشتمان بەرامبەر یاسا یەکسانین.*

**بەرایی** (ن.) سەرەتا، لەپێشدا، دەستپێك.

**بەراییدان** (چ.) ئەگەر تۆ دڵت بەسەرکەوتنی هەڤاڵێکت خۆش بوو، چاوت پێی هەڵات، ئەوە بەراییدانە.

**بەرایی نەدان** (چ.) چاوپێهەڵنەهاتن، دڵ بڕوایی پێنەدان، نەتوانین: *چاوی بەرایی نەدا چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێت.*

**بەرەبەرە** (ئاك.) لەسەرەخۆ، کەمکەمە، وردە وردە، پەیتا پەیتا، قیچ قیچە، پیچ پیچە: *کارەکەمان بەرە بەرە تەواو کرد.*

**بە رەحم** (ئان.) بە بەزەیی: دلۆڤان: *پێویستە لەگەڵ بچووکان بە رەحم بین.*

**بەرەڤ** (ئاك.) بەرەو، رووەو، بۆ: ئەم بەرەڤ قوتابخانێ چووین.

**بەرەڤانی** (ن.) بەرگری: پێشمەرگە *بەرەڤانی ل کوردستانێ دکەت.*

**بەرەکەت** (ن.) پیت، هات، فەڕ: خاکی هەولێر بە بەرەکەتە.

**بەرەڵا** (ئان.) ١- رەها، لە دەست دەرچوو: *ئەسپەکە بەرەڵا بوو.*

٢– بێ ڕەوشت: کەسێکی پێڕەوی یاساو ڕێسای کۆمەڵایەتی نەکات پێیدەڵێن: بەرەڵا.

**بەرەو** (ئاك.) بڕوانە: بەرەڤ.

**بەرەو پاش** (ئاك.) کشانەوە، چوونە پاشەوە: *نەخوێندەواری ئاستی بیرکردنەوە بەرەو پاش دەبات.*

**بەرەو پێش** (ئاك.) چوونە پێشەوە، بۆ پێشـــەوە: ڕەوڕەوەی مێـــژوو هەردەم بەرەو پێش دەچێ.

**بەرەوژوور** (ئاك.) بەرەڤ ژوور، ژێهەل، ڕوو لە بڵندایی: *کۆچەرییەکان لە بەهاردا بەرەو ژوور هەڵدەکشێن.*

**بەرەیرۆژکـــە** (ن.) بەرەیرۆکـــە، بـــەر بەرۆچـــکە، ئـــەو شـــوێنەیە بـــە زستانان خۆری زۆر بەر بکەوێت: *پـــیرە مێـــرل بـــەر بـــەرۆژکی ڕینشت.*

**بەرپـــەرچ** (ن.) بەرهەڵســـت، ڕێگـــرتن، وەڵامدانـــەوە: *پێشـــمەرگەی کوردستان هەمیشـــە بەرپەرچی هێرشی دوژمنانیان دەدایەوە.*

**بـــەرپرس** (ن.) ئـــەو کەســـەیە، کـــە بەرامبەر ڕاپەڕاندنی کارێك، یان جێبـــەجێکردنی فـــەرمانێك لێپرسراوە: *بەرپرس پێویستە بۆ بەرژەوەندی گەل کار بکات.*

**بەرجەستە** (ن.) خـۆ نوانـدن، شـتەك بکەوێتـە بـەر دەستوبەرچـاو: *ئەوزاد لە شانۆگەرییەکەدا ڕۆڵی کاوەی بەرجەستە کردبوو.*

**بەرچـــاڤ** (ن.) بەرچـــاو، پـــێش چـــاو، بەرچاوك، ئەگەر شتێك جـوانو سەرنج ڕاکێش بێت پێـی دەڵـێن دیارو بەرچاڤە..

بەرچاڤك

**بەرچاڤك** (ن.) چاویلکە: *پزیشکێ چاڤا داخاز ژ داپیرا من کر بەرچاڤکا بکەتێ.*

**بەرخ** (ن.) بێچووی مەڕ: *ئەم بەرخە چەند جوانە !*

**بەرخوێندن** (ن.) بەرخواندنێ، بەر فێـر بـــوونێ، بـــەرهەیبوونی هـــەر کەسێکی بچێتە قوتابخانە دەڵێن

چۆته بەرخوێندن، یانی چووە فێری خوێندن و نووسین و ...

ببێت: *زارۆیێن خو دانان بەرخواننێ.*

**بەرخۆدان** (چ.) راپەرین، پەلاماردان، هەستان، سەرهلدان، بەرخودان: مللەتێ مە بەرخۆدان کر.

**بەرد** (ن.) بەر، کەور، کەڤر، سەنگ: *بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە.*

**بەردان** (چ.) وازلێهێنان، بەرەڵا کردن، دەست لێهەڵگرتن: *کەوەکەم بەردا.*

**بەردەست** (ن.) ژێر دەست، بن دەست، خزمەتکار، کەسەکە کار لە بن دەستی کەسێکی دیدا دەکات: *بەردەست یارمەتی وەستا دەدات.*

**بەردەستی** (ن.) ژێردەستی، کار کردن لەبەر دەستی یەکەکی دیدا: شاگردەکی هەیە بۆ بەردەستی.

**بەردەلان** (ئان.) شوێنەك بەردی زۆری تێدابێ، بەرداوی: بەستەکە بەردەلان بوو.

**بەردەم** (ئاك.) پێش دەمی شت: *لە بەردەم من ئاوای گوت.*

**بەردەوام** (ئاك.) هەموو دەمەك، هەموو کاتەك، هەر گاڤ، هەمیشە: بەردەوام وەرزش دەکەم.

**بەردی قسڵ** (ن.) بەرێ کسلێ: منارەی ئامێدی لە بەردی قسڵ دروستکراوە.

**بەردی گەچی** (ن.) بەرێ گێچی، ئەو بەردەی گەچی لێ دروست دەکرێ.

**بەررۆژ** (ئاك.) پێش رۆژ، بەرتاو، بەرهەتاو: لەبەر رۆژدا دانیشتبوون.

**بەرز** (ئان.) قیت، قووچ، بڵند: *چیای هەڵگورد زۆر بەرزە.*

**بەرز بوون** (چ.) بڵند بوون.

**بەرزایی** (ن.) بڵندی، بەرزی: *بە بەرزاییەکانی چیاکەدا هەڵکەراین.*

**بەرز کردن** (چ.) بلندکرن.

**بەرزی** (ن.) بڵندی، گەورەیی: *بەرزی ئێمە لە بەرزیی چیاکانمان دایە.*

**بەرژەوەند** (ن.) بەرژەند، سوود: *کاری وابکەن بەرژەوەندی گشتی تیا بێت.*

**بەرسڤ** (ن.) بەرسیڤ، وەلام: *بەرسڤان پرسیارا بدەڤە.*

**بەرف** (ن.) بەفر: بەفر سەرچاوەیەکی سەرەکی زیادبوونی ڕێژەی ئاوە لە ساڵدا. *ئەو ساڵا بەرف زۆر دبارێت ئاڤا کانیا ژی زۆر دبیت.*

**بەرفراوان** (ئان.) بەرفرەهـ، بەریلاو، گەورەو پانوپۆڕ: *کێلگەکەیان لەسەر زەوییەکی بەرفراوان دروستکرابووە.*

**بەرك** (ن.) وردە بەرد: *زەڤیا پڕی بەرك یا کێم خێرە.*

**بەرکەڤتن** (چ.) وە بەرکەوتن، بەرکەوتن، کەوتنەبەر: *ناوچەی بالیسانو دەڤەری بامێنانیش بەرکیمیا باران کەڤتن.*

**بەرگ** (ن.) ١- جلك، پۆشاك، جلوبەرگ: *جلوبەرگەکی تازەم لەبەردایە.* ٢- گەلای دارو درەخت. ٣- ڕووپۆشی سەرین و بالیف: ئەم بالیفانە تازە بەرگیان بۆ کراوە. ٤- ڕووپۆشی کاغەز، یا نایلۆنی کتێبو دەفتەرە: *دایکم بەرگی جوانی لەکتێبەکانم گرت.*

**بەرگدروو** (ن.) بەرگساز، دروینکار، ئەو کەسێ جلکان د درویت دبێژنێ بەرگدروو: *ئازاد بەرگدرووێکی باشە.*

**بەرگر** (ن.) بەرەڤان، پێشگر: هیوا بەرگری لەشکربوو.

**بەرماڵ** (ن.) ١- بەردەرکی ماڵ، پێشماڵ: جاران ژنان لە بەرماڵ دادەنیشتن. ٢- دوو گرد، پارچە رایەخەکە نوێژی لەسەر دەکرێت: *دوو گردی نوێژ پێویستە هەردەم خاوێن بێت.*

**بەرماوە** (ن.) پاشماوەی خواردن، بەرماو، بەرماك: *بەرماوەکەیان هەموو فرێدا..*

**بەروبووم** (ن.) دەرامەت، داهات، بەرهەم: *بەروبوومی لادێ زۆر بووە.*

**بەڕوو** (ن.) بەڵوو، بەڕی، بەڕوی: *لە کوردستاندا داربەڕوو زۆرە.*

**بەرهات** (ن.) بەری ساڵ: *بەرهاتی پار بە برشت بوو.*

**بەرهەڤکرن** (چ.) ئامادەکرن: مەموزین ژ بەرهەڤکرنا ئەحمەدێ خانییە.

**بەرهەم** (ن.) دامات، بەروبووم، ڕەنجی کارەك: *ئەڤ ساڵە بەرهەمێ رەزین مە گەلەك ب بەرەکەت بوون.*

**بەرهەم ئینان** (چ.) بەرهەم هێنان: *کارگەهێن چیمەنتۆیێ دەست ب بەرهەم ئینانا خۆ کر.*

**بەرهەمهێن** (ن.) کەسەك کە کاری بەرهەمهێنان بێ: مرۆڤی بەرهەمهێن سوودبەخشە..

**بەری** (ئاك.) لە پێشدا، پێشوو، پێشی: ژیان بەری نهۆ بساناهیتر بوو.

**بەریك** (ن.) بەرك، گیرفان، بەرکە: هەکو تو دگەل مامۆستای دئاخڤی دەستا ژ بەریکا خۆ بینە دەر.

**بەرین** (ئان.) فرەه، فراوان: *مۆڵەکی گەورەو بەرینمان بۆ تاقیکردنەوەکان هەیە.*

**بەرێ** (ئاك.) بەلێ: بەرێ ئەز بووم هاتم.

**بەڕێز** (ئان.) ١– ڕێزدار، سەنگین، بە قەدر: *مامۆستای بەڕێز تۆ چرای ژیانی.* (ن.) ٢– ناوە: *بەڕێز قوتابییەکی زیرەکە.*

**بەڕێوەبەر** (ن.) ڕێڤەبەر، کارگێڕ: بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان هات.

**بەزەیی** (ن.) میهرەوانی، دلنەرمی، دلۆڤانی: *دایك بەرامبەر منداڵەکانی زۆر بە بەزەییە.*

**بەزەیی پێداهاتنەوە** (چ.) دڵ پێسووتان: بەزەییم بە *چۆلەکەکە هاتەوە بۆیە بەرەلام کرد.*

**بەزم** (ن.) ١ـ شادی: *لەم ماڵە بەزم و شاییە.* ٢ـ تەشقەلەو گەپ: *دارا بەزمی پێ کردین.*

**بەس** (ن.) چیترنا: *بەس ئازاری ئەم بەرخانە بدەن.*

**بەساغی** (ئاك.) بە ساخی، بەخۆشی ، بە تەندروستی: *ئەوم بە ساغی بینیوە.*

**بەسەرچـــوون** (چ.) بسەرڤەچـــوون، بەسەردا تێپەڕین: هەر شتەك كە ماوەی ئاسایی خۆی بەسەردا چوویێ دەبێ فرێبدرێ.

**بەسەرهات** (ن.) بسەرهاتی، سەرهات، ڕووداو، سەرگوزشتە: *كە لەلای باپیرم دادەنیشم بەسەرهاتی خۆشم بۆ دەگێڕێتەوە.*

**بەست** (ن.) ١- بەنداو: بەستی دوكان سەرچاوەیەكی گرنگە بۆ كارەبا. ٢- قەراغ، یان كەنار ڕووبارو چەم: لە بەستەكەدا دانیشتبووین.

**بەستان** (چ.) گرێدان، بەستن.

**بەستەر** (ن.) پێبەند.

**بەستەزمان** (ئان.) ١- بێ زمان، یەكێ كە جێی بەزەیی بێت: *ئازاری ئەم بەرخە بەستەزمانە مەدە.* ٢- كەسێك كە توانای بەرگریكردنی لە خۆی نەبێت: *بۆ مافی خۆت بەستەزمان مەبە.*

**بەستەنی** (ن.) دۆندرمە، بەستەڵەك: *بەستەنی لە هاوینان خۆشە.*

**بەستن** (چ.) ١- گرێدان، قایمكردن: *لە كاتی گواستنەوەی ماڵدا، بەستنی كەلوپەلەكان زۆر پێویستە.* ٢- بوون بە سەهۆڵ: *ئاوەكە بەستوویەتی.*

**بەستوو** (ئان.) بەستەڵەك: *ساردەمەنی بەستوو مەخۆ.*

**بەسوود** (ئان.) ب مفا، بەكەڵك، بە قازانج: *خواردنی مێلكە بەسوودە.*

**بەش** (ن.) ١- پشك، پارچەیەك لە شتێ: *بەشم لە كاركردن مەیە.* ٢- هێندێك كتێب دابەش دەكرێنە سەر چەند بەشێك هەر بەشەش نێونیشانی تایبەتی خۆی هەیەو لە بابەتێك دەدوێت، یان دەكۆڵێتەوە. ٣- هێندێك داو و دەزگەی میریو نامیری لە چەند بەشێك

پێکهاتوون، هەر بەشەش سەرۆکێکی هەیە، هەموو بەشەکانیش پێکڕا کاروباری دەزگەکە بەڕێوەدەبەن.

**بەشدار بوون** (چ.) پشکدار بوون: *بەشدار بووانی خولەکە هەموویان دەرچوون.*

**بەشکراو** (ئان.) پشککری، ئەو شتەی، کە بەسەر چەند بەشێکدا دابەش کرابێت: *داماتەکە لە نێوانیاندا بەشکراوە.*

**بەفر** (ن.) بڕوانە: **بەرف**.

**بەفرانبار** (ن.) ناوی یەکەم مانگی زستانە لە سالژمێری کوردیدا: *لە بەفرانباردا دەچینە لای چیا، تا لەسەر بەفر خلیسکانێ بکەین.*

**بەفراو** (ن.) ئاوی بەفر: *ئاوی ئەم کانییە ئەوەندە ساردە دەڵێی بەفراوە.*

**بەکاربراو** (ئان.) ژکار کەفتی، تێکچووی: *شتێکی نوێم بدێ نەك یەکی بەکاربراو.*

**بەکارهێنەر** (ن.) بەرخۆر.

**بەکەڵك** (ئان.) بڕوانە: **بەسوود**.

**بەکتریای گۆیی** (ن.) بەکتریای خڕ: ئەم گۆمە پڕ بەکتریای گۆییە.

**بەگوڕ** (ئان.) بەمێز، بە پەلە، بەخوڕ: *ئازاد بە گوڕ هات.*

**بەلاڤ بوون** (چ.) پەرش و بڵاو بوون، ژێك بەلاڤ بوون: *لە دوای تەواو بوونی یاری منداڵەکان بەلاڤ بوون.*

**بەڵام** (ئام.) لێ، وەلێ: ئێمە دەخوێنین، بەڵام کاتمان کەمە.

بەلەم

**بەلەم** (ن.) کەشتییەکی بچووکە بە سەوڵ بەڕێوەدەچێت: *بەلەم لە دار دروست دەکرێت.*

**بەلەنگاز** (ئان.) هەژار، بەستەزمان: یارمەتی بەلەنگازان بدەن.

**بەڵکە** (ئام.) بەڵکە، بەڵکو، بەشکو: *با تۆزێکی تر راوەستین بەڵکە بێن.*

**بەڵگ** (ن.) پەلك، گەڵا: ل پاییزێ بەلگێن دارا دوەرن.

**بەڵگە** (ن.) نیشانە، دەستاوێژ، سەنەد: *بەڵگەی زۆر لەسەر تاوانبارەکان کۆ کراونەتەوە.*

**بەڵگەنامە**(ن.) بەڵگە، نیشانە، شایەدمان، دۆکومێنت: *لە دادگایی کردنی سەدام و داروده‌ستەکەی بەڵگەنامەیەکی زۆر خراونەتە روو.*

**بەڵێ** بەلێ، ئەرێ، با: *بەلێ کورد نەتەوەیە.*

**بەڵێن** (ن.) پەیمان، سۆز، قەول: *بەڵێن بێ تا ماوم خەبات بکەم.*

**بەمجۆرە** (ئاك.) بەم شێوەیە، ئەوها: *ئەوان بەم جۆرە دەخوێنن.*

**بەن** (ن.) ١- بەندك، داو، هەودای لە خوری و موو دروستکراو: سەری هەردوو دارەکەم بە بەنێکی توند بەستوونەتەوە. ٢- دارەبەن، داری قەزوان.

**بەناوبانگ** (ئان.) بناڤودەنگ، ناڤدار، ناسراو، ناودار: هەرمێی دۆڵی رۆستێ بەناوبانگە.

**بەند** (ن.) ١- مادده، بەش: *بەندی یەکەمم لە کتێبەکە خوێندەوە.* ٢- بەربەستی بەردەم ئاو، بەنداو، بەست.

بەنداو

**بەنداو** (ن.) شوێنی کۆکردنەوەی ئاو، دیوارێکی قایمە لەسەر رووبار یا زەریایەك بە بەرد دروستدەکرێت، ئاستی ئاو لە لایەکی ئەو دیوارەدا بەرزترە لە لایەکەی دی، بەهۆی هێزی ئەو ئاوەی لە لا بەرزەکەوە دەرژێتە لا نزمەکە دەتوانرێت وزەی کارەبا بەرهەمبهێنرێت.

**بەنـــــدبوون** (چ.) ١– چەســـپاندن، نووساندن. ٢– پەیوەست بوون، پابەند بوون: بەند بوون بە یاسا نیشانەی هۆشیارییە.

**بەندیخانــــــە** (ن.) گرتووخانـــــە، حەپسخانە، زیندان، گرتیخانە : *کــوردەکی زۆر لــە بەندیخانــەی بەعسدا شەهید کران.*

**بەنرخ** (ئان.) بە بەها، بەهادار، بـەرێز، بەقیمــەت: *زێــڕ کانزایــەکی بــە نرخە.*

**بەنزین** (ن.) جۆرە سووتەمەنییەکە لە نەوتی خاو بەرهەمدەهێنرێت: تۆ بەنزین لە نێو تـانکی ئوتومبێل دەکـەیت، جـا مەکینەکـەی کـار دەکات.

**بەنگی** (ئان.) کەسێك حەشیشەو تریاك بکێشێت بەنگکێش دەبێت.

**بەوردی** (ئاك.) ب هـوبری، بـە دیقـەت: *بـە وردی سـەیری داڕشـتنەکەتم کرد.*

**بەها** (ن.) نرخ: *بەهای ئەم تابلۆیە لـە توانــای کـــەم کەســـدا هەیـــە بیکرێت.*

**بـــەهار** (ن.) وەرزەکـــی ســـاڵە، کــە ســەرەتاکەی بــە مــانگی نــەورۆز دەســـت پێـــدەکات: *بـــەهاری کوردستان ڕەنگینە.*

**بەهاناهاتن** (چ.) بـە دەنگـەوە هـاتن، دماوارهـــاتن: *بـــەهانا هـــاتنی لێقەوماوان کارەکی پیرۆزە.*

**بەهانــە** (ن.) بیـانوو، پـەڵپ، مهانـە، هەنجەت: *بە بەهانەی ئیشەکەوە نەیتوانی بێت.*

**بەهەشت** (ن.) جەننەت، لـە نێـو ئـاینی موسـڵمانێتیدا بەهەشـتو دۆزەخ هەیە.بەهەشت شوێنێکی خۆشـە هــەروەکو لــە قورئانـــدا بـــاس کـراوە، شـوێنێکە پـڕ لـە چۆمو جۆگەلەو ئاو و دارو بارو پـەریو حۆری.... بڕوانە: **جەهەننەم**.

**بەهر** (ن.) پشـك، بـەش، پـار، پـێش: *بەهرا کەسێ نەخۆو بەهرا خۆ ب کەسێ نەهێلە.*

**بــــەهرە** (ن.) ١– دامــات، قــازانج، توانایەکی زگماکیو سروشتییە لای مـرۆڤ: *مۆزانڤـان مرۆڤـەکیٚ بەهرەمەنـــدە.* ٢– ســـەلیقە: بەهرەی شاعیری هەیە. ٣– ناوە بۆ هەردوو رەگەزی نێرو مێ.

**بەهرەدار** (ئان.) بەهرەمەند، خاوەن بـــەهرە، هـــەر کەســـێکی موســـیقاژەن، دەنگخـــۆش، وێنـەکێش، سـەماکار، نووسـەرو ... بێت پێیدەڵێن بەهرەدار.

**بەهێز** (ئان.) بە شەنگ، بە توانا ، بە تاقــەت: *ســـەردار یاریزانـــەکی بەهێزە.*

**بەهێواشـــی** (ئــاك.) بــە ئەســپایی، لەسەرخۆ: بە *هێواشی ئۆتۆمبێل لێبخورە.*

**بــەیان** (ن.) ١– شـەوەکی، سـپێدە، بـەیانی: *بــەرە بــەری بــەیان بەرێکەوتین.* ٢– ناوە بۆ مێینـە: *بـەیان مامۆسـتای وەرزشـە لـە قوتابخانەکەماندا.*

**بەیانی** (ئاك.) ١– شەوەکی، سبەینێ، کاتی دەستپێکردنی ڕۆژ: *بەیانی زوو لەخـەو هەستام.* ٢– ڕۆژی دێ: *بەیانی دەچم بۆ زاخۆ.*

**بەیەکەوە** (ئاك.) پێکەوە، لەگەڵ یـەك، بـە هەماهـەنگی، پێکڤـە: هـەر کارێـك بەیەکـەوە بکرێـت کـاتو رەنجی کەمتر دەوێت .

**بەین** (ئاك.) ١– دەم، کات، ماوە: ئـەو بەینــە دیــار نیــت! ٢– نێــوان: *کەس لە بەینمان نەبوو.*

**بــــەینێك** (ئــاك.) ماوەیــەك، بێنــەك: *بەینێك لە سلێمانی مامەوە.*

**بـــبڕای بـــبڕ** (ئــاك.) بــەهیچ جۆرێــك، هــەرگیز: *بـبڕای ببڕ دەسـت لـە خوێنـدن هـەڵناگرم تـا نەگەمـە مەبەست.*

**بت** (ن.) پەیکەرەکە لەبەرد یا لـە دار دروستدەکراو دەپەرسـترا، مـرۆڤ بـە گشـتی بـەر لـە خـودا ناسـین بتـی دەپەرست: *لـە سـەردەمی جاهلیـدا عەرەبـەکان بتیـان دەپەرست.*

**بتنیٚ** (ئاك.) بە تەنیا: *ئەز بتنیٚ ماتیمە مالا مەوە.*

**بخــــودانكرن** (ج.) بــەخاوەن كــرن، بـــەخێوكردن: *بخــودان كرنــا تەرش و نەوالا كارەكیٚ باشە.*

**بچـــكۆڵە** (ئــان.) بچـووك، چــكۆڵە، كچـــكۆكە، كچــــكە: *باوكــــە سندوقەكی بچكۆڵەم بۆ بێنە بۆ خۆم دەیكەمە دەخیلە.*

**بچووك** (ئان.) كچكە، كچكۆكە، بچیك، بچویك: *ئەز ل گونـدەكیٚ بچـووك دژیم.*

**برادەر** (ن.) هـەڤال، هـاوڕیٚ: *برادەریٚ بــاش خۆشـــتڤیٚ مەمیانـــە. برادەری باشم هەن.*

**بــرازا** (ن.) كـوڕو كچـی بـرا: *برازاكـانم خوێنـــــدنی خۆیــــان بـــــە سەركەوتوویی تەواوكرد.*

**براله** (ن.) وشەیەكە بۆ خۆشەویستی بـەكار دیٚ لـە كـاتی بـانگكردن و قسـە لەگـەڵ كردنـدا: براڵە ئـەم كارە نابێت.

**برایـــــــەتی** (ن.) برادەرایـــــەتی، هاوەڵایـــــەتی، دۆســـــتایەتی: *برایەتی ئێمەو ئەوان زۆر كۆنە.*

**برەو** (ن.) ١- ڕەمێنـی بـازاڕ، هـەڕمێن: *ئەمڕۆ بازاڕ بە برەو و گەرمە.* ٢- ڕێز: *برەو لـە خـەڵك بكـرە.* ٣- ئەسپی خۆشبەز: *ئەسپەكەمان بە برەوە.*

برژانگ

**برژانگ** (ن.) بژوانگ، مـژۆڵ، مـژیلانك، ئـەو مووانــەی بەســەر پێڵــووی چاوەوەن.

**برســـی** ( ئــان.)١- گیانـدارەك كــە گەدەی بەتاڵ بێت پێویسـتی بـە خـواردن بێـت: *منداڵەكـە برسـی بوو بۆیە دەگریا.* ٢- چاوتەنگ، ڕەزیل، قرچۆك: چاڤ برسی هـیچ تێر نابێت.

**برسێتی** (ن.) برچێتی، برسیاتی.

**بـــــرنج** (ن.) مـــــەرەزە، جـــۆرە دانەوێڵەیەکـــە بـــۆ خـــواردن بـــەکاردێت: *بازیـان و ئـاکرێ و دهـــۆك بـــە چـــاندنی بـــرنج بەناوبانگن. برنج نوکە خوارنەکا سەرەکییە.*

**بریـــا** (ئـام.) خۆزگــە، خــۆزی: *بریـا بوومایە بە مامۆستا.*

**بریتی** (ن.) ١- برێتـی، ل شوینا، لـە جیـاتی. ئەگـەر تـۆ دلوەتـی ئاهـەنگێك کرایـتو بـۆت نـەکرا ئامادەبیـت، یـەکێکی دی لـە جیاتی خۆت دەنێریتو دەڵێیت: ئـەو لـە بریتـی مـن هـات.٢- پێکهاتـە، بـۆ وێنـە ئـاو لـە ئۆکســـــجینو هایــــدرۆجین پێکهاتووە، یانی برێتیە لەو دوو توخمە.

**بـرین** (ن.) زام، کاتـەك پێسـت شـەق دەبــێو خـــوێنی لـــێ دێ: *برینەکـــەی دەســـتی ســـاڕێژ بۆتەوە.*

**بریندار** (ئـان.) ئـەو کەسـەی بـرین بـە لەشـییەوە بێـت، زامـدار، زامـار: *برایەکم لە ڕاپەڕینەکەی بـەهاری ١٩٩١ بریندار بوو.*

**بڕبـــڕە** (ن.) بڕبڕاگـــە، ئـــەو پارچـــە ئێسکانەی بەسـەر یەکەوەن لـە ناوەڕاســـتی پشـــتی مـــرۆڤ و هەنـــدەك گیانـــەوەری دیکـــەدا: *هەندەك گیانەوەری بێ بڕبڕە لـە ئـاودا دەژیـن وەك هەشـتپێ و ئەستێرەی زەریا.*

**بڕبـــڕەی پشـــت** (ن.) زیـتری پشـتێ، شاپشـــت: *دەروازەی ســـنووری ئیبراهیم خـەلیل بڕبڕەی پشـتی ئابووری کوردستانە.*

**بڕست** (ن.) بڕسـت، هێـزو توانـا، وزە: *بڕستت بڕیم.*

**بڕنـــووتی** (ن.) وشـەیەکی تورکییـە، جـۆرە دەرمانێکـە لەگـەڵ تـۆزی تووتن تێکەڵ دەکرێتو لە لـووت دەکرێـت، بـۆ ئـەوەی کەسـەکە بپشمێت.*

**بڕوانامە** (ن.) بەڵێن نامـە، باوەڕنامـە: *بڕوانامەی بەکەلۆریۆسم لە زانکۆ وەرگرت .*

**بڕیار** (ن.) پەیمان، شەرت، سۆز، گفت: *بڕیارم داوە ئەركی ڕۆژانەم دوا نەخەم..*

**بڕین** (چ.) قرتاندن، لەتكردن: بڕینی دار زیان بە دارستان دەبەخشێت.

**بڕێك** (ئان.) بڕەك، هندەك، پیچەك، چەندەك، قیچەك، هەندێك: لەسەر كانییەكە بڕێك ئاوم خواردەوە.

**بزاڤ** (ن.) لڤین، چالاكی: *ئەم بزاڤێ دكەین تاكو ژیانا خۆ خۆش بكەین. بزاڤ ناڤێ ڕۆژنامەكا هەفتانە بوو.*

**بزاڤی ڕزگاریخواز** (ن.) جوولانەوەی ئازادیخوازی: *بزاڤی ڕزگاریخوازی كورد هەمیشە بزاڤەكی پێشكەوتوو بوو.*

**بزربوون** (چ.) ون بوون، شاردنەوە، نادیار، بەزرەبوون: *ئەو منداڵانەی لەنێو دارستان بزربوون، دۆزرانەوە.*

بزن

**بزن** (ن.) بزن گیاندارەكی شیردەرە، ئەو بزنەی، كە تەمەنی دوو- سێ مانگە كاریلەی پێدەڵێن، كە چەند مانگێك گەورەتر بوو، پێی دەڵێن گیسك، جا دواتر چتێرو لە یەك ساڵیدا بزنی پێدەڵێن: بزن گیاندارەكی شاخاوییە.

**بزواندن** (چ.) لڤاندن، جوڵاندن: *ئاوەڕۆكی چیرۆكەكە هەستمی بزواند.*

**بزوێنەر** (ئان.) جووڵێنەر، لڤینەر: كارەبا تەزووەكی بزوێنەرە.

**بزووتن** (چ.) بزڤین، لڤین، جووڵە: بزووتن بۆ منداڵ پێویستە.

**بزووتنەوە** (ن.) جووڵانەوە، بزاڤ: *بزووتنەوەی خوێندكاران ڕۆڵی كاریگەری لە كۆمەڵگادا هەیە.*

**بزۆك** (ئان.)ترووك، بزێو: *ئای چەند بزۆکی داناکاسێی!*

**بــــــژاردن** (ن.) ١- هەڵبــــــژاردن، لێکجیاکردنەوە، هەڵاوێرد: *دایکم نیســـك بـــژار دەکـــات.* ٢- ڕێکخســـتن و خاوێنکردنـــەوەی باخچـە: *باخەوانەکـە باخچـەکە بژاردەکات.*

**بــژوین** (ئـان.) بـژین، پاکـژ، خـاوێن، بژون، پاقژ: *ئـەز کـارەکێ پـاك و بژوین دکەم.*

بشکۆژ

**بشکۆژ** (ن.) ١- قۆپچـە، دوگمـە: *ئـەم بشکۆژەم بۆ لـە کراسـەکە بدە.* ٢- خونچـــە، چـــرۆ: *گوڵەکـــە بشکۆژی گرتـووە.* ٣- نـاوە بـۆ مێینە: *بشکۆژ ئافرەتەکا خـودان بەهرەیە.*

**بشکفتن** (چ.) ڤەبوون، بشـکفین، لەبـەر یـەك بوونـەوە: *ئـەو گـوڵ بـاش بشکفتن.*

**بشــکورین** (چ.) زەردەخەنـە، گرنـژین: *بشکورین نیشانا دلخۆشییە.*

**بلا** (ئام.) با، لێگەڕێ، با وابێ: *بلا ڤـێ جارێ موین نەمێن.*

**بلۆك** (ن.) خشـتەك لـە چیمەنتۆو لمو وردە چـــەو دروســـتکرابێت: *خانووەکـــەمان لـــە بلـــۆك دروستکراوە.*

**بڵاوکـــــراوە** (ن.) پەخشـــکراو: *بڵاوکراوەکـەم لـە سـەر دیـوار هەڵواسی.*

**بڵح** (ئان.) ناکـاری ناپەسـەند، تـووڕە، بـەد ڕەوشـت، ناشـیرین: *منـاڵی بڵح هیچ کەس خۆشی ناوێ.*

ئا ئه **ب** پ ت ج چ ح خ د ر ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن ه و ی

**بلند** (ئان.) بەرز، قیت، ئەڤراز: *کەو ل کوبێن بلند دخوینن.*

**بلندبوون** (چ.) بەرزبوون: *ڕۆژانە چەندین فڕۆکە لە فڕۆکەخانەی هەولێر بلند دەبن.*

**بلندکردن** (چ.) هەڵدان: *ئالای کوردستانمان بلند کرد.*

**بلیت** (ن.) تکت، تکێت، پسووله: *چوونە ژوورەوە بۆ هۆڵ بە بلیتە.*

**بلیمەت** (ئان.) مرۆڤی لێهاتوو، هەڵکەوتوو: *قوتابی بلیمەت ئایندەی ڕوونە.*

**بلێسە** (ن.) گڕی ئاگر، بریشك: *ئاگرەکی بلێسەدارە.*

**بناغە** (ن.) بنیاد، هێم، بنواشە، شەنگستە: *بناغەی خانووەکەمان بەهێزە.*

**ب ناڤودەنگ** (ئان.) بەناوبانگ، نێودار: *ستێڤێن بەرواری بالا گەلەك ب ناڤو دەنگن.*

**بنەڕەت** (ن.) بنیاد، بنچینە، بناغە، بنواشە، بنەما: *ڕووەك سەرچاوەیەکی بنەڕەتی خۆراکی مرۆڤ و گیانەوەرانە.*

**بنەجە** (ن.) ئاکنجی، دانیشتوو، نیشتەجێ، ئۆقرەگرتوو: *ڕەوەند تیرەیەکی بنەجە نین.*

**بنەما** (ن.) بنچینە، ماکە، هۆی پەیدابوون و مان: *هەرکارەك لەسەر بنەمای ڕاست دانەمەزرێت دەڕووخێت.*

**بنەماڵ** (ن.) ماڵبات، خانەوادە، خێزان: *بنەماڵەی ئێمە بە کردەوەیان سەرفرازن.*

**بنەوشە** (ن.) ١- بەنەوشە، وەنەوشە، جۆرە گوڵەکە: *وەنەوشە گوڵەکی بۆن خۆشە.* ٢-

ڕەنگی مۆر: *ئەم کوتاڵە ڕەنگی وەنەوشەییە.*

**بنج** (ئاك.) بن: چوومە بنجی کێشەکە.

**بنچینە** (ن.) بنیاد، بنەڕەت، بناغە، بنەما، شەنگستە: *ئەگەر بنچینەی خانوو پتەو نەبێ زوو دادەکەوێت.*

**بنکە** (ن.) بنگەه: *قوتابخانە بنکەی زانستە.*

**بنکەی سەربازی** (ن.) بنەی سەربازی، مەکۆی سەربازی: *بنکەی سەربازی لە دەرەوەی شار دانراوە.*

*بنگەه (ن.) بڕوانە:* **بنکە**.

**بنمیچ** (ن.) میچ، بنودار، کە لەسەر جێگەی خۆتدا لەسەر پشت پاڵدەکەویت ڕووت لە بنمیچی ژوورەکەت دەبێت: *چۆلەکەکە لە بنمیچی ژوورەکەمدا هێلانەی کردووە.*

**بنهەنگڵ** (ن.) بەشەکە لە جەستەی مرۆڤ، ژێرەوەی ئەو شوێنەیە، کە باسك و لەش تێکەڵ بە یەك دەبن، بن پیل، بن باڵ، بن باخەڵ، بن کەوش، بن کەمش، بن کەفش: *مریشکەکەی وە بن هەنگڵی دا و ڕۆیشت.*

**بنیاتنان** (چ.) دروستکردن، دامەزراندن، ئاڤاکرن، ئاوەدانکردنەوە: *منارەی چۆلی لە هەولێر لەلایەن مزەفەرەدین ی کەوکبەری بنیاتنراوە.*

**بنیادکردن** (چ.) ئاڤاکرن: بنیادکردنی وڵات بودجەی زۆری دەوێت.

**بهادار** (ئان.) بەهادار، بەنرخ: زێڕ لە کانزا بهادارەکانە.

**بوار** (ن.) ١- بەشەکی تەنکی ئاوی چەم و ڕووبار: *ماسییەکە لە بوارەکە گیرا.* ٢- شوێنی تێدا پەڕینەوە: *لە بواری ئەم ڕووبارە بە پێ پەڕیمەوە.* ٣- دەرەتان، دەلیڤە، کایە، ڕێگە: *مامۆستا بواری پێدام تا بیر*

بکەمەوە. ٤- بیاڤ، مەیدان: *لە هەموو بوارێکی ئەدەبیدا خاوەن بیروڕایە.* ٥- بەهار، وەرزی بەهار.

**بوتڵ** (ن.) شووشە: ڕۆژانە بوتڵە شیرەك دەخواتەوە.

**باوراندن** (چ.) بردنەسەر، دەرباز کردن: ئێمە ڕۆژگارێکی خۆشمان بوراند.

**بۆردمان** (ن.) بۆمبابارا‌ن، بۆردومان، خستنە خوارەوەی بۆمبا بەسەر خاك: *لە بۆردومانەکەی قەڵادزێ چەند خوێندکارەك شەهیدبوون.*

**بووردن** (چ.) خۆشبوون، چاوپۆشیکردن، پێهێڵان: *داوای لێبوردنت لێ دەکەم.*

**بوورانەوە** (چ.) بێهۆشبوون، دلبۆرین، لەخۆچوون، دلگرێبوون، نەهشبوون: *لە پێکەنینان خەریك بوو ببوورێتەوە.*

**بووڕین** (چ.) ڕەتبوون، تێپەڕین، دەرباز بوون: *ڕۆژگارێن سەخت بسەرمەدا بووڕین.*

**بووژانەوە** (چ.) زیندووبوونەوە، گەشانەوە، ڤەژیان، ژیانەڤە، بە چالاککەوتن و گەشە سەندن: *نەمامەکان بە ئاودان و پەین پێدا کردن بووژانەوە.*

بووك

**بووك** (ن.) ئەو کچەیە، کە شوو دەکات.

**بووکا جیهانێ** (ن.) بووکی جیهانی، شا جوانی جیهان، *هەموو ساڵێك لە ئاهەنگێکی تایبەتدا کچێك بە شای جوانیی جیهان هەڵدەبژێردرێت، هەڵبژاردنەکەش بەپێی هێندێك ڕێنوێنی و مەرجە،*

که دەبێت لە کچەکەدا هەبێت،
تا ببێتە بووکی جوانیی جیهان..

**بووکـــــە شووشـــــە** (ن.) لەیســـتۆك، بووکۆکـــە، بووکەڵـــە: *بووکـــە شووشـــەی ســـەردەمی منـــداڵیم هەموو هەڵگرتوون.*

**بووم** (ن.) کورد دەڵێت بەروبووم بە مانای داهاتو بەرهەم: *ئەمسالە بەروبووم گەلەك باش بوو.*

**بـــــوون** (چ.) ١– بەرچـــاو، زینـــدوو، هەبوون: *ئەوان پێشمەرگە بوون.* ٢– هاتنـــە ئـــارا: بـــە بـــوونی منداڵەکەیان دڵخۆش بوون.

**بوێرانە** (ئاك.) ئازایانە، نەترس، بێ ترس: *بەشەو بوێرانە بەرێگادا دەڕۆیشتم.*

**بۆ** (ئام.) ١–ئامرازی پێوەندی: *ئەو دەچێت بۆ هەولێر.* ٢– لۆ، لەبەر چی، وشەی پرس کردنە: *دوێنێ بۆ نەهاتیە قوتابخانە.*

**بۆچـــوون** (چ.) بیرکردنـــەوە، هزرکـــرن: ئێمە یەك بۆچوونمان هەیە.

**بۆڕی** (ن.) لوولەی ئاو : *ئەوت بە بۆڕی بۆ پاڵاوگەکان دەگوازرێتەوە.*

**بۆشـــایی** (ن.) بیاڤ، والایـی، بـەتالایی، ڤـــالاتی، چـــۆڵی: *مانگـــە دەســـتکردەکان لـــە بۆشـــایی ئاسماندا دەسووڕێنەوە.*

**بۆشایی ئاسمان** (ن.) بەتالایی، والایی، ڤالاتیـــا ئاسمـــانی: *ئاسمـــان گـــەڕەکان بـــە ڕۆکێـــت لـــە نێـــو بۆشایی ئاسماندا دەگەڕێن.*

بۆق

**بـــۆق** (ن.) قـۆرواق، بـەق، گیانـدارێکی بچـــووکی ڕەنـــگ کەســـك، یـــان قاوەییە. بۆق لە نێو ئاو و نێزیك ئـــاودا دەژی. هـــەردوو لاقـــەکانی پشـــــتەوەی درێـــــژن، بۆیـــــە

دەتوانێت باز بدات: *لەشی بۆق لە سەروقەد پێکدێت وملی نییە.*

**بۆن** (ن.) ١- بێهن، بۆ: *گوڵ جۆری هەیە، بە شەو بۆن دەدا، هەشە بە رۆژ.* ٢- عەتر، گولاو: *بەبۆنەی رۆژی لە دایکبوونم شووشەیەك بۆنم بە دیاری وەرگرت.*

**بۆنە** (ن.) هەلکەفت، هۆ، بیانوو، رووداو: *بە بۆنەی جەژنی نەورۆز ئاهەنگ دەگێرین.*

**بۆیە** (ئام.) لەوا، لەبەر ئەوە، ژ بەر هندێ: *میوانم هات بۆیە دوا کەوتم.*

**بیابان** (ن.) دەشتایی، دەشتی چۆڵ: *وشتر بۆ رۆیشتن لە بیاباندا خێرایە.*

**بیانوو** (ن.) ئەگەر داوەتی ئاهەنگێك کرایت و ئارەزووت لێنەبوو بچیت، بەهانەیەك دێنیتەوە، بۆ وێنە دەڵێیت خوێندنم هەیە، بۆم ناکرێت ئامادە بم، ئەمە بیانووە..

**بیانی** (ن.) بێگانە، خەڵکی دەرەوەی وڵات: *کۆمپانیاییێن بیانی روی دکەنە کوردستانێ.*

**بیبیلە** (ن.) گلێنەی چاو، بیلبیلە: *ئێوە بیبیلەی چاوی ئێمەن.*

**بیر** (ن.) ١- بیری ئاو، ئەو چاڵاییەی ئاوی لێ دەردەهێنرێ: *ئاوی ئێمە ئاوی بیرە.* ٢-هۆش، هزر، فیکر: *با بیری نوێ و کاری نوێ بەرنامەمان بێ.* ٣- یاد: *لەمێژە بیرت دەکەم.*

**بیرئانین** (چ.) یادکردنەوە، ساڵوەگەر: *ل بیر ئانینا جەژنا نەورۆزێ ئەم دلخۆش دبین.*

**بیرکاری** (ن.) هزرکاری، ماتماتیك، زانستی ژمێریاری: *لە وانەی بیرکاری زۆر باشم.*

**بیرکردن** (چ.) هێندێك جار بیر لە هاوەڵێکت دەکەیتەوە، ئەمە بیرکردنە.

**بیرکردنـەوە** (چ.) کە لە شتێك وردبیتەوەو لێیبکۆڵیتەوە، هزر کردن.

**بیرورا** (ن.) بۆچوون، تێگەیشتن، هزر: *ئەم سەردەمە، سەردەمی بیرورا گۆڕینەوەیە.*

**بیرهاتن** (چ.) یاد کردن: *بیرهاتنا ئەنفالان هۆڤاتیا دوژمنی دیار دکەت.*

**بیرۆکە** (ن.) هزر: بیرەك، کە هێشتا بە تەواوی نەناسرابێ‌و باس نەکرابێ: *بیرۆکەی نووسینێکم لە بارەی زمانەوە لە مێشکدایە.*

**بیستن** (چ.) گوهلێبوون، هەستکردن، گوێلێبوون، بهیستن: بیستوومە کە فەرهەنگەکی باش کەوتۆتە بازاڕ.

**بیلبیلە** (ن.) بڕوانە: **بیبیلە**.

**بیناسازی** (ن.) بیناکاری، نژیاری: بیناسازی هونەرو پیشەسازییە.

**بینایەت** (ن.) ئاڤاهی: حکومەتی هەرێم بینایەتی زۆری دروست کردووە.

**بینین** (چ.) دیتن: *ئەم ب بینینا وە شادین.*

**بێ ئارام** (ئان.) بێ ئۆقرە، بێ سەبر، شپرزە، بێ هەدار: *لەکاتی تەنگانە بێ ئارام مەبە.*

**بێ ئەمەك** (ئان.) بێ وەفا، بێ نمەك، بێ نان‌و خوێ، یەکەك چاکەیەکت لەگەڵ بکا پاشتر تۆ چاکەکەت لەبەر چاو نەبێ، بە سپڵە یان (سفڵە)ش گوتراوە.

**بێ ئەنوا** (ئان.) بێ دەسەڵات، چارەڕەش، بێ جێگەو ڕێگە، بێ پەنا: *ماڵی خانزاد شوێنی ئافرەتانی بێ ئەنوایە.*

**بێباك** (ئان.) بێترس، بێمنەت: *بڕۆ بێباك بە.*

**بێباکی** (ن.) بێترسی، بێمنەتی، خەمساردی: *چەند بێباکی لە دوژمن.*

**بێ بەزەیی** (ئان.) بێ میهر، بێ دلۆڤانی، ب دل رەقی، دڵڕەق: *تیرۆرستەکان بەرامبەر خەڵکی بێ بەزەیین.*

ئا ئە **ب** پ ت ج چ ح خ د ر ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ک گ ل م ن ه و ی

**بێ پەسێو** (ئان.) بێ داڵدە، بێ پەناگە، بێ نەوا: *پاش مردنی دایکم بێ پەسێو مامەوە.*

**بێتاوان** (ئان.) بێگوناه، بێ سووچ: ئازاد لە دادگاییەکە بێ تاوان دەرچوو.

**بێتەل** (ن.) جۆرە ئامێرێکی پەیوەندییە بە بێ تەل کار دەکات: *بە بێ تەل خەبەرم وەرگرت.*

**بێجگە** (ئاک.) ژێلی، جگە: *بێجگە لە من هەموویان رۆیشتوون.*

**بێچوو** (ن.) ساڤا، بچویک، زارۆک، تێشك: *گیانەوەرە شیردەرەکان بێچووەکانیان بە شیری مەمکیان بەخێو دەکەن.*

**بێدەر** (ن.) خەرمان، جۆخین: *بێدەر جهێ کومکرنا دەخل و دانیە.*

**بێ رەحم** (ئان.) بێ بەزەیی، دڵرەق، بێ دلۆڤانی: *مرۆڤێ بێ رەحم کەس حەژێ ناکەت.*

**بێریڤان** (ن.) ١- بێری، مەڕو بزن دۆش: *سپێدێ بێریڤان چوونە بێرێ.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**بێڕوو** (ئان.) بە کەسێك دەڵێن بێڕوو، کە بە بێ شەرم هەموو شتێك بکات و هەموو شتێك بڵێت، هەتا ئەگەر بێ ئابڕوویش بێت.

**بێزار** (ئان.) وەڕەز، جاڕس: *لە ئامۆژگارییەکانی مامۆستا بێزار نابم.*

**بێسەروبەرکردن** (چ.) تێکدان، شێواندن: *مالێ کەلەك بێسەروبەر نەکەن.*

**بێکاری** (ن.) بێ ئیشی، دەستبەتاڵی، بێ شوڵی: *پێویستە لە کوردستان بێکاری نەمێنێت.*

**بێکەس** (ئان.) ١- بێ خزم، هەژار: *ئەم پیاوە هەژارو بێکەسە.* ٢- *نازناوی شاعیرەکی ناوداری کوردە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا ژیاوە.*

**بێگانە** (ن.) بیانی: پشت بە بێگانە مەبەستە.

**بێگومـــــان** (ن.) بێشـــك: بێگومـــان ئەزموونەکەمان سەردەکەوێت.

**بێڵ** (ن.) پێمەرە، خاکەناز، مەرك: بە *بێڵ زەوییەکەم هەڵکەند.*

**بــێن** (ن.) ١-بـۆن، بهـن: بێنـا ریحـانیّ زۆرا خۆشـــە. ٢- پشـــوو: *زۆر ماندووین با بێنەك بدەین، ئەوجا دەڕۆیـــن.* ٣- هەناســـە: لـــە ئەفرازیا بێنا وی تەنگ دبیت.

**بیّ نــاڤ** (ئـان.) بـیّ ناونیشـان. ١- بـۆ پـاك نـەژادی بـەکاردێت: هشـیار بـە! مـە بیّنـاڤ نەکـەن. ٢- بـۆ ناولێنان: چما ئەڤ سـاڤایە هـەتا نهۆ بیّ ناڤ مایە.

**بێندان** (چ.) پشوودان، حەسانەوە: لـە کـــاتی مانـــدووبوون بێنـــدان پێویستە.

**بێـــوەی** (ئـان.) بـیّ زیـان، بـیّ ئـازار: پەپوولە گیاندارەکی بێوەیە.

**بیّ هوودە** (ئـان.) بـەفیڕۆ، بـیّ سـوود، بەخۆڕایی: *بـە بـیّ هـوودە کـات سەرف مەکە.*

**پا** (ن.) پێ، لاق، قاچ: *بە پا بەرەولای تۆ هاتم.*

**پابەست** (ن.) پابەس، پابەند، پێوەندی بوون بە کەسێك، یان شتێك.

**پابەند** (ن.) پێوەند، پابەست، پێوەست.

**پابەند بوون** (چ.) پەیوەست بوون، بەستراوە، گوێ پێدان: *پێویستە پابەندی یاساکانی هاتوچۆ بین.*

**پابەندی** (ناو.) پێوەندی، گیرۆدەبوویی.

**پاتاڵ** (ناو.) ١- پاتار، کەلوپەلی دزراو، تاڵانکراو: *ئەم ئۆتۆمبێلەمی پاتاڵە بۆیە نایکرم.* ٢- کۆنە پەڕۆ، کەفنە پاتە: خەریکی پاتاڵ کۆکردنەوەیە. ٣- شتی کۆنی لە کار کەوتوو.

**پاپۆڕ** (ن.) کەشتی گەورەی دەریا، گەمێ، لە بەلەم گەورەترەو هۆیەکی گواستنەوەی ئاوییە: *تایتانیك جوانترین و گەورەترین پاپۆڕی سەردەمی خۆی بوو.*

**پاداشت** (ن.) چاکە بە چاکە دانەوە: *لە بەرامبەر ئەو کارەی کردم پاداشتەکی چاکیان دامەوە.*

**پادشا** (ن.) شا، پاشا، گەورەی وڵات: *زوحاك کە پادشایەکی ستەمکار*

*بوو، بە دەستی کاوەی ئاسنگەر لەناو چوو.*

**پادشای قودرەتیٚ** (ن.) خوا، یەزدان.

**پار** (ئاک.) ساڵی رابردوو، پارەکە: *ئەمساڵیش وەکو پار نمرەی چاکم بەدەست هێنا.*

**پاراستن** (چ.) پارازتن، پارێزگاری کردن، ئاگا لێبوون: *پاراستنی دارستان ئەرکی هەموومانە..*

**پارە** (ن.) دراڤ، دراو، پوول: *پارەی تەواوم پێیە بۆ کرینی جلوبەرگەکە.*

**پارت** (ن.) دەستە، کۆمەڵە: *دەبێت پارت و رێکخراوەکان لە خزمەتی گەل و نیشتماندا بن.*

**پارچە** (ن.) کەرت، بەش، تیلمە: *زۆرم برسی بوو، هەر پێش نان خواردن پارچە کێکەکم خوارد.*

**پارچە گەل** (ن.) گەلەك پارچە.

**پاروو** (ن.) پارو، تیکە، پاری، لوقمە، ئەو پارچە خواردنەی بە یەکجار دەخرێتە دەم: *دەبێت پاروو جوان بجوویت، جا قووتی بدەیت.*

**پارێزەر** (ن.) ئەو کەسەیە، کە بەهۆی شارەزایی لە یاسا یارمەتی ئەو کەسانە دەدات، کە روو لە دادگە دەکەن، پارێزەر هەوڵ دەدات، کاروباریان ئاسان بکات و گەر دووچاری سزاش بن، سزاکەیان کێمتر دەکات: *ئازاد پارێزەرەکی سەرکەوتووە.*

**پارێزەری** (ن.) کاری ئەو کەسەی پارێزگاری یان بەرگری لە مرۆڤ دەکات لە دادگادا: *پارێزەری پیشەیەکی مرۆڤایەتییە.*

**پارێز کردن** (چ.) ١- پارێز کرن. خۆ پاراستن لە هەندەك خواردن: *پارێزگاریکردن باشترە لە چارەسەرکردن.* ٢- شینایی و بێستان کردن: *ئەمساڵ پارێزی نەکردووە، چونکە زەوییەکە ئاوەکی باشی نەبوو.*

**پارێزگا** (ن.) شار و هەموو ئاواییەکانی دەوروبەری دەگرێتەوە:

*کەرکووك پارێزگایەکی کوردستانە.*

پارێزگار (ن.) ١- کەسەك شتەکی دی بپارێزێو ئاگاداری بیٚ: بڕۆ، خوا پارێزگارت بیٚ. ٢- بەڕێوەبەری پارێزگا یان ناوچەیەکی دیاریکراوی دەوڵەت: *پارێزگارێك پارێزگەك بەڕێوە دەبات.*

پارێزگاری (ن.) پارێزی، ئاگاداری: *پارێزگاری لە کەلوپەلی قوتابخانە ئەرکێکی نیشتیمانییە.*

پارێزی (ن.) بڕوانە: پارێزگاری.

پاڕانەوە (چ.) ١-نزا کردن، لالەلاڤە کرن، دوعا خواستن، تکا کردن: هەموو لەخوا پاڕانەوە. ٢- کڕووزانەوە، لالانەوە: *تاوانبارەکە زۆر لە بەردەم دادوەر پاڕاوە.*

پاسەوان (ن.) چاودێر، ئێشکگر، زێرەڤان: *قوتابخانەکەمان دوو پاسەوانی چاکی هەیە.*

پاسوخ (ن.) وەڵام، بەرسڤ: *پاسوخی پرسیارەکانی تەواو بوون.*

پاش (ئاك.) دواوە، پاش ئەوەی، لە دوای: *پاش تەواو بوونی وانەکە یەکسەر گەڕایەوە.*

پاشاتی (ن.) پاشایەتی، شاهانە: *پاشاتی بە میرات بۆ ماوەتەوە.*

پاشا گەردانی (ن.) بیٚ سەروبەری، پشێوی و تێکەڵو پێکەڵ بەهۆی نەمانی یاسا و سەروەری: *لە هەر کۆمەڵگایەکدا یاسا سەروەر نەبیٚ پاشاگەردانی ڕوودەدا.*

پاشەڕۆ (ن.) ١- پاشەڕۆك، بەرماو، بەرماوە، بەرماك: *پاشەڕۆی خۆراك فڕێبدەنە شوێنی تایبەت.* ٢- پیسایی: *پاشەڕۆی پەلەوەر وەك پەینێك بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهێنرێت.*

پاشەڕۆژ (ن.) دواڕۆژ، ئایندە: *دەبێت رابردووی خۆمان باش بخوێنینەوە تا پاشەڕۆژێکی باشی پیٚ بنیاد بنێین.*

پاشەڕۆك (ن.) بڕوانە: پاشەڕۆ

**پاشەکەوت کردن** (چ.) پارەگرتنەوە، خەرجنەکردن، پشتدەستکردن، پارە لەبانك دانان، کۆکردنەوەو گلدانەوەی پارە، پارە لە دەخیلە دانان، پارە هەڵگرتن: *بە پاشەکەوتەکەی پایسکلەکی نوێی کڕی.*

**پاشەکشەکردن** (چ.) کشانەدواوە: *سەربازەکان لە بەرامبەر پێشمەرگەدا پاشەکشەیان کرد.*

**پاشوو** (ن.) پەلی دواوە، جووتك، لیتك، لووشك، هەردوو پەلی دواوەی وڵاخی یەك سم: وڵاخەکە تووڕە بوو پاشووی هاوێشت.

**پاشی** (ئاك.) ١– پاشان، پاشێ، پاش، دوای، پشتی: *پاشی پشوودانەکە یەکسەر دەستمان بە یارییەکە کردەوە.*

**پاقر** (ن.) کانزایەکە وەکو زێڕ خشڵی لێدروستدەکرێ، بەڵام نە زێڕە و نە زیو.

**پاك** (ئان.) پاکژ، پاقژ، خاوێن، بژین: *پێدڤییە پاكو تەمیزی ل هەمی جهەکی بپارێزین.*

**پاکتر** (ئان.) پاکژتر، پاقژتر، خاوێنتر، بژینتر: *ئەم ژوورە لە هی ئێوە پاکترە.*

**پاکترین** (ئان.) پاکژترین، پاقژترین، خاوێنترین، بژێنترین: *ئەمە پاکترین قوتابییە لە قوتابخانەکەمان.*

**پاکژ** (ئان) بڕوانە: **پاك**

**پاکژتر** (ئان.) بڕوانە: **پاکتر**

**پاکژترین** (ئان.) بڕوانە: **پاکترین**.

**پاکژی** (ن.) خاوێنی: پاکژی شارەکەت بپارێزە.

**پاککردنەوە** (چ.) پاقژکردنەوە، خاوێنکرن: *گەنمو دانەوێڵە پاك دەکرێنەوە جا دەبردرێنە ئاش.*

**پاکۆکەر** (ن.) پاکژکەر، خاوێنکەر، پاقژکەر.

**پاڵ** (ن.) ١- پشت: پاڵ بە دیوارەکە مەدە تازە کراوە. ٢- ڕەتاندن بە هێز: *ئۆتۆمبێلەکە بەبێ پاڵدان ناکەوێتە کار.* ٣- ملەی کێو و شاخ: *لەو پاڵە دەرکەوتو ئێمەش بەدیمان کرد.*

**پالاوتە** (ن.) پارزنینکری، پالێوراو، هەلاوێردە: *ئاو بە رێگەی پالاوتە خاوێن دەکرێتەوە.*

**پالاوتن** (چ.) پارزنین، بشافتن: *نەوتی خاو دوای پالاوتنی چەندەها مادەی دیکەی لێ بەرهەم دێت.*

**پالە** (ن.) کرێکار، کارکەر، دروێنەکەر، شۆلکەر: *باوکم ژیانی بە پالەیی بردە سەر.*

**پالەپەستۆ** (ن.) پالنان، فشار، گفاشتن: *خواردنی چەوری مزیەکی سەرەکییە بۆ تووشبوون بە نەخۆشی پالەپەستۆی خوێن*

**پالەپەستۆی هەوا** (ن.) بەرزیو نزمی هەوا: *بەرزیو نزمی پالەپەستۆی هەوا کار دەکاتە سەر خێرایی کەشتیی چارۆکەدار لە زەریادا.*

**پالپشت** (ن.) ١- لاگر، یارمەتیدەر، پشتگیر: *دەبێ موسوڵمان لە تەنگانەدا پالپشتی یەکتر بین.* ٢- ئەوانەی لەسەر ئەرد دادەنیشن، شتێکی نەرم دەخەنە پشتیان، تا یەکسەر پال بەدیوارەوە نەدەن، ئەمە پالپشتە: *پالپشتی نەرم بۆ پشت و مل باشە.*

**پالنەر** (ن.) ١- پالدەر: *هەوا پالنەرەکی بەهێزە.* ٢- هۆکار، هاندەر: *مامۆستاکەم پالنەرم بوو تا ئەو نمرەیە بە دەست بێنم.*

**پاوان** (ن.) لەوەرگە و مێرگ، چەروان، زەنوێر: *مەرەکان ببە بۆ پاوان بیان لەوەرێنە.*

**پاوانە** (ن.) خرخالّ، ریزە مۆری و لیرەی خشلّی پێ: *پاوانەکانی پێی دەزرنگێنەوە.*

**پاوانکردن** (ن.) دەست بەسەرا گرتن، قۆرخکردن: یاسا رێ بە پاوانکردنی موڵک و ماڵی میللەت نادا.

**پایە** (ن.) ١- پلە، ئاست: *لە زیرەکیدا کەس ناگاتە پایەی ئەو* ٢- کۆلەکە، راگر، سوندەکە،

ئەستوون: *پایەی خانووەکە لار بووە، دەبێ چاك بکرێتەوە.*

پایتەخت (ن.) مەڵبەندی وڵاتو دەسەڵات: هەولێر پایتەختی باشووری کوردستانە.

پەپکە (ن.) ١- جۆرە کولێرەیەکە، ئەستوورك، تووتك. ٢- دانەوێڵەی گێرەکراوی لە شەنە نەدراو: *گەنمەکە مێشتا پەپکەیە.* ٣- گرمۆڵە بوو، خڕوەبوو: *مارەکە پەپکەی خواردووە.*

پەپوو (ن.) پەپویك، تۆك، کوندەبوو: پەپوو باڵدارە. ٢- باڵدارەکی سەر بە کڵاوی رەنگ زەردو رەشە، پایزان دێتەوە کوردستان، پەپو سلێمانکە.

پەپوولە (ن.) پەروانە، بەلاتینك، پەپوولە جۆرە زیندەوەرێکە، باڵی زۆریەیان رەنگاو رەنگە: پەپوولە تەمەنی زۆر کورتە.

پەت (ن.) پەتك، لە خوری مەڕ و لە مووی بزن دروستدەکرێتو گوریسیش لە پەتو بەن دروستدەکرێت.

پەتوو (ن.) بەتانی: *ئەوەی لەسەر پێخەف بەخۆ دادەدرێ، بە شێوەیەکی سەرەکی لە خوری، یا لۆکە دروستدەکرێت.*

پەراسوو (ن.) پەراسوی، پەراسی، ئەو ئێسکە کەوانەییانەی لە پشتەوە بەرەو سینگ دەکشێن: *دوای بەربوونەوەی، پەراسووەکانی ئازاریان پێگەیشتووە.*

پەرەپێدان (چ.) گەشە پێدان، پێشخستن، سازکردن: *بە پەرەپێدانی سامانی ئاژەڵ باری ئابووری وڵات دەگەشێتەوە.*

پەخش (ن.) بڵاو، پرژاو، پەرش: *بەرنامەکە لە پەخشەکی راستەوخۆدا بوو.*

پەرەنگ (ن.) ١- لەرزانەی گوارە: *لە پەرەنگی گوارەکەی زانیم کە زێڕە.* ٢- زکڵ، سکڵ، پۆلوو، پەنگر، پشکۆی ئاگر.

پەرتەوازەیی (ن.) پەرەوازە، ئاوارەیی، لێکدووری: *ژیان بە پەرتەوازەیی ناخۆشە.*

**پەرتووك** (ن.) کتێب: *لە گوندی سێ ماڵ لە نزیك دیاربەکر بە کتێب دەڵێن پەرتوك..*

**پەرداغ** (ن.) پەرداخ، گلاس، کاسە: *پەرداغەك ئاوم بۆ بێنە.*

**پەردە** (ن.) قوماشێکە پەنجەرەی پێ دادەپۆشرێت و هەندێك جار دەرکەش.

**پەرژین** (ن.) تانۆك، تامان، پەرجان، تەیمان، بەرهەڵستەکە بەدەوری باخ و بێستان و شوێنەکدا دەیکێشن: *پەرژینەکمان بە دەوری باخچەکەماندا هێناوە.*

پەرستگا

**پەرستگا** (ن.) پەرستگە، شوێنی پەرستن: *لالش پەرستگای ئێزدییەکانە.*

**پەرشوبڵاو** (ئان.) دانانی شت بە بڵاوی و ناڕێکی: *کتێبەکانت بە پەرش و بڵاوی لەسەر مێز دامەنێ.*

تەلاری پەرلەمان

**پەرلەمان** (ن.) دەسەڵاتی یاسا دانانە لە وڵاتدا، کە نوێنەرەکان بە هەڵبژرادن لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن: *گەر تەمەنت گەیشتە هەژدە ساڵ دەتوانی دەنگ بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان بدەیت.*

**پەروەردە** (ن.) سەرپەرشتی، سەخبێر، بەخێوکاری: *پەروەردە کارەکێ پیرۆزو پێویستە.*

**پەروەردەکار** (ن.) بەخێوکار، سەرپەرشتیکار، ئەو کەسەی زارۆکان پەروەردە دەکات:

*مامۆستاکەمان گیانەکی بەرزی پەروەردەکاری تێدایە.*

**پەروەردەکردن** (چ.) بەخێوکردن، سەرپەرشتیکردن: *پەروەردەکردنی قوتابی ئەرکی مامۆستاوماڵەوەیە.*

**پەروەردگار** (ن.) یەزدان، خودا، خودێ، پەروەردگار بە هانامان هات.

**پەروین** (ن.) ١- ناوی ئەستێرەیەکە. ٢- ناوە بۆ مێینە: *پەروین مامۆستایەو کورسی فێربوونی کۆمپیوتەریش وەردەگرێت.*

**پەرۆش** (ئان.) پەرێشان، شەیدا، بەخەم، موشتاق: زۆر بە پەرۆشم بۆ دیدەنیت.

**پەری** (ن.) ١- زەری، حۆری، فریشتە، زۆر جوان: *لە جوانییا دەڵێی پەریی بەهەشتە*. ٢- ناوە بۆ کچان: *پەری قوتابییەکی زیرەکە.*

**پەرێشان** (ئان.) دڵ بە خەم: *کاتێ ئاوارە بووین حاڵمان پەرێشان بوو.*

**پەڕ** (ن.) ١- تووکی لەشی باڵندە: *لەشی باڵندە بە پەڕ داپۆشراوە.* ٢- پەڕی دەفتەر، کاغەز، قاقەز: *ئەم دەفتەرە (٦٠) پەڕە.* ٣- داوە تیژەکانی ژووژکو سیخوڕ.

**پەڕۆ** (ن.) پەڕۆک، پارچە قوماشی کۆن، بۆ دروستکردنی کلاشی هەورامی بەکاردێت: *ئەو پەڕۆیە بۆ پاکژکردنی مێز باشە.*

پەڕی گوڵ

**پەڕی گوڵ** (ن.) پەڕێ گوڵێ، پەلکەگوڵ، بەلگێ گوڵێ: *بەلگێن هەندەک گوڵان گەلەک دنازکن زوی دوەریێن.*

**پەڕینەوە** (چ.) دەربازبوون، لەم بەر بۆ ئەو بەر، تێپەڕبوون: *لە شەقامدا دەبێت بەسەر مێڵە تایبەتییەکانی پەڕینەوەدا بپەڕیتەوە.*

**پەز** (ن.) مەڕ: *ئەرکێ شڤانی چەراندنا پەزییە.*

**پەزو تەرش** (ن.) مەڕو مالات: *کوردستان پەزو تەرشی لێ بخودان دکرێت..*

**پەست** (ئان.) ١- غەمگین، پۆسیدە، داماو، تنگژی: *لەبەر چی وا پەستی؟* ٢- ناوی جۆرە پاسەکی کۆنە: *پەنجا ساڵەک بەر لە ئێستا خەلکی بە پەست هاتوچۆیان دەکرد.*

**پەستان** (ن.) پاڵەپەستۆ، تەوژم، تنگژین، نارەحەتی: *ئەوا لەهەموو لایەک پەستانی هەیە.*

**پەستی** (ن.) وەڕزی، دلتەنگی، بێزاری: *دەبێت یارمەتی نەخۆشان بدەین تاوەکو هەست بە پەستی نەکەن.*

**پەسند** (ئان.) چاک، باش، تەواو، دروست: *ئاخاوتنەکەت پەسندە.*

**پەشیمانی** (ن.) پەژیمانی، پەژێوان، پێشمانی، پاشگەز بوونەوە: *وریای خوێندنەکەت بە، ئەگینا پەشیمانی دادت نادات.*

**پەقین** (چ.) تەقین: *رۆکێتێن دوژمنی هاتن مەمی نەپەقین.*

**پەککەوتە** (ئان.) لەکارکەوتوو، بێ توانا، پیر، داماو، پەککەوتوو: *پەککەوتەکان لە ژیان بەدەر نین، ئەوەتا خولەکی راهێنانی کۆمپیوتەریان بۆ کراوەتەوە.*

**پەککەوتن** (چ.) لەکارکەوتن، وەستان، خراپ بوون: *بە پەککەوتنی ئامێرەکان رێژەی بەرهەمهێنان کەم دەبێتەوە.*

**پەل** (ن.) ١- دەستو لاق، پێ پرک: *پەلەکانی دواوەی بۆق لە پەلەکانی پێشەوەی درێژترن.* ٢- لکی دار: *لەناو باخچەکەدا پەلەدارەکی زۆر کەوتووە.* ٣- باڵی باڵندە: *باڵندەکە بە مەردوو*

پەلی دەفرێ. ٤- پارچە، پاژ، کەرت: پەلە نانەکم لەو نانە گەرمە بۆ لێبکەوە. ٥- گرووپ و تاخمەك یان دەستەیەك لە هێزو سوپا: ئازاد لێپرسراوی پەلەکەیان بوو. ٦- بزۆز، بەجموجۆڵ: منداڵەکی زۆر پەلیان هەیە..

**پەلامار** (ن.) ئێریش، هێرش، هەڵمەت: دزەکە لە ناو پەلاماری سەگەکە خۆی پێ نەگیرا و هەلات.

**پەلاماردان** (چ.) خۆ تێوەرکرن، هێرشبردن، هەڵمەتبردن.

**پەلەوەر** (ن.) باڵدار ، باڵندە، فرندە، پەرندە: دەبێت کێلگەکانی پەلەوەر چاودێری تەندروستییان لەسەر بێ.

**پەلکە زێڕینە** (ن.) کێلە ستێن، کەسك و سۆر، شەبەنگە ڕۆژ: پەلکە زێڕینە لە پاش بارانی بەهاراندا دەبینرێت.

**پەل هاوێشتن** (چ.) دەست بەسەرداگرتن، داگیرکردن، دەسەلات زیادکردن: لە سەردەمی داگیرکاریدا عوسمانییەکان پەلیان بۆ ڕۆژهەلات و بۆ ڕۆژئاوا دەهاوێشت.

**پەڵە** (ن.) ١- لەکە، شوێنەوار، نیشانە: مێشتا کراسەکە پەڵەکەی پێوە ماوە دەبێ بشۆردرێتەوە. ٢- تێر ئاو خواردنەوەی زەوی لە دوا مانگەکانی پایزدا.

**پەڵە هەور** (ن.) پنیا هەوری، پارچە هەور: فڕۆکەکە بەناو پەڵە هەورەکەدا ڕەتبوو.

**پەمبە** (ئان.) پەمبەیی، پەمە، پەمەیی، ڕەنگێ پیڤازی: کراسەکی جوانی رەنگ پەمبەیی لەبەردا بوو.

**پەمبی** (ن.) پەمۆ: پەمبی ل کوردستانا تورکیا گەلەك دچێتە چاندن.

**پەموو** (ن.) لۆکە، پەمبی، پەمی، پەمو: *پێخەفەکەم لە پەمۆ دروستکراوە.*

**پەمۆ** (ن.) بڕوانە: پەموو

**پەمۆدانە** (ن.) ناوکو دەنکی ناو پەمۆ: *ڕۆن لە پەمۆدانە دەردەهێنرێت.*

**پەمی** (ن.) بڕوانە: پەموو

**پەناهەندە** (ئان.) پەنابەر، ئاوارە بوو: *دوای ئارامبوونەوەی باروتۆخ پەناهەندەکانی دەرەوەی وڵات گەڕانەوە.*

**پەنجە** (ن.) تپل، پل، پت، قامك، تل، ئەنگوست: لەنێوان پەنجەکانی بۆقدا پەردەی تەنك هەیە یارمەتی مەلەکردنی دەدات لە ئاودا.

**پەنجەباز** (ئان.) شەڕخواز، قرنجیك هافێز: *منالی پەنجەبازم خۆش ناوێت.*

**پەنجەرە** (ن.) چوارچێوەیەکی سازکراو لە تەختە یان لە ئاسن یا لە ئەلەمنیۆم نێوەکەی بەتاڵە شووشەی تێدەگیرێت: *ماڵا مەگەلەك پەنجەرە تێدانە.*

**پەنجەمۆر** (ن.) مۆرا تبلێ: *نەخوێندەوارەکان لە جیاتی واژۆکردن پەنجە مۆر بەکاردەهێنن.*

**پەند** (ن.) ١- ئامۆژگاری، گۆتنێن مەزنان: *وەرە گوێ لە پەندەکانی داپیرەمان بگرین.*

**پەنگخواردنەوە** (چ.) بەرگیران، کۆبوونەوەی ئاو لە شوێنەك: *ئاوی زێی بچووك لە دوکان بەری گیراوەو پەنگی خواردۆتەوە.*

**پەنیر** (ن.) جۆرە پێخۆرەکە، کە لە شیر دروست دەکرێ: *پەنیر ژ شیرێ پەزو چێلان دهێتە چێکرن.*

**پەی** (ن.) ١- شوێن: بە پەی ئەو کەوتووە. ٢- لەبەر، بۆ خاتر: *پەی تۆ ئەم کارە دەکەم.* ٣- زانین، هەستکردن: پەی بەم زانستە نابا.

**پەیام** (ن.) ڕاسپاردە، نامە: *زەردەشت پەیامی وتەی چاكو*

*بیری چاک و رەوشتی چاکی بۆ خەڵک مێنا.*

**پەیامبەر** (ن.) ١- پەیامگەیێن، ئەوەی کە وەڵام و هەواڵ بۆ شوێنەکی دی دەبا: *برزۆ پەیامبەری شۆڕش بوو.* ٢- پێغەمبەر: *هەر میللەتێك پەیامبەری خۆی هەبووە.*

**پەیامبەری** (ن.) پەیامبردن، پەیامگەیێن، پەیامگەیاندن.

**پەیدا** (ئان.) خویا، ئاشکرا، دیار.

**پەیدابوون** (چ.) پەیا بوون، دروستبوون، دەرکەوتن، خویا بوون، ئاشکرا بوون: *پەیدا بوونی نووسین بۆ هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە.*

**پەیدا کردن** (چ.) بەدەست هێنان، پەیاکردن، وەدەستخستن: *پارەکەی بە ماندوو بوونی خۆی پەیدا کردووە.*

**پەیڕەو** (ن.) پێگیری، بەرنامەو دەستووری کار: *هەموو کارەك پەیڕەوی تایبەتی خۆی دەوێ.*

**پەیڤ** (ن.) وشە، ئاخاوتن: *بەڕێوەبەری قوتابخانەکە پەیڤی خۆی خوێندەوە.*

**پەیکەر** (ن.) ١- شێوەی کەسێك دەنوێنێت، پەیکەر بۆ کەسێك دەکرێت، کە کاری گرنگ و نایابی بۆ میللەت و مرۆڤایەتی کردبێت: پەیکەرێکی نایابی مەستوورەخانی ئەردەڵانی لە پارکی هەولێر دانراوە.. ٢- لەش، بەدەن، قالب: *لە تاقیکەی قوتابخانەکەمان ئێستە پەیکەری مرۆڤ هەیە.*

**پەیمان** (ن.) ١- بەڵێن، قەول، مەرج، شەرت و بەقا: *پەیمان بێ پەیمان تا ڕۆژی مردن هەرگیز نەوەستم لە خەباتکردن.* ٢- ناوە بۆ مێینە: *پەیمان یاسا زانەکا دیارە.*

**پەین** (ن.) ماددەیەکی کیمیاییە بە زەوی وەردەکرێ بۆ بەهێزکردنی شینایی، پاشماوەی ئاژەڵیش بە تایبەتی مەڕو بزن ئەو هێزەی تیایە وەکو پەین بەکاردێت.

**پەینی دەستکرد** (ن.) زبلیٚ دەستکری: ئەو پەینەی کە لە ماددە کیمیاییەکاندا دروست دەکریٚ.

**پەینی سروشتی** (ن.) زبلیٚ خۆڕسك، ئەو زبلەیە، کە لە پاشماوەی ئاژەڵی پیٚکدیٚت.

**پەیوەست** (ن.) پەیوەند، نووسانی شتەك بە شتەکی ترەوە، پیٚڤەگریٚدان: *ئاڵوگۆڕی شتومەك بە کاری بازرگانی پەیوەستە.*

**پەیوەندی** (ن.) پیٚوەندی، هاقلی، ناوبەری، نیٚوان: پیٚوەندی لە نیٚوان خەڵك پەیدا دەبیٚت، لەگەڵ یەك دەدویٚن، بۆ یەك دەنووسن‌و..: *ئەوان پیٚوەندیٚکی باشیان لەگەڵ دراوسیٚکانیاندا هەیە ڕیٚزیان لیٚدەنیٚن‌و میهرەبانانە لەگەڵیان دەجووڵیٚنەوە.*

**پتەو** (ئان.) موکوم، توندو بەند، قایم، ناو پڕ: *بناغەی خانووەکەیان بە بلۆکی پتەو داناوە.*

**پتر** (ئاك.) زیاتر، پرانی : *ڕۆژانە پتر لە دوو کاتژمیٚر دەخویٚنم.*

**پخ** (ن.) ١- وشەیەکە کتوپڕ بۆ ترساندنی یەکەك یان بۆ گاڵتە پیٚکردن و ئەنقەست بەکاردیٚت.
٢- دەنگیٚکە بۆ رادان‌و تیٚخوڕینی مەڕو بەرخ بەکاردیٚت.

**پراکتیك** (ن.) ڕیٚڕەوی جیٚبەجیٚکاری هەر کارەك، کرداری، کارەکی: *پرۆژەکە لە پراکتیکدایە.*

**پرەنسیپ** (ن.) بنەما، سەرەتا، شەنگست: *بەپیٚی چەند پرەنسیپەك ئەندامییەتیت قەبوڵ دەکریٚ.*

پردی دەلال

**پرد** (ن.) پر، ڕیٚڕەویٚکە لەسەر رووبارو چۆم‌و زیٚیان دروستدەکریٚت، بۆ ئەوەی بەسەریدا بپەڕینەوە: *پردی دەلال لە زاخۆ میٚژوویەکی کۆنی هەیەو دیمەنەکی جوانیشە.*

**پرزە** (ن.) ١- پاشماوەی ئالیكو ئالف، كە لە ئاخوڕی ئاژەڵدا بەجێ دەمێنێ: *پرزەكە بۆگەن بوو دەبێت فرێبدرێ.* ٢- لكە قامیشی بچووكو زراو: *ئەم تابلۆیە بە قەڵەمی پرزە نووسراوە.* ٣- هێزو توانای تاقەت: *زۆر ماندووم پرزەم لێبڕاوە.* ٤- پشكو بەش، ماف: *ھەموویان خوارد بوو، پرزەی منیشیان نەھێشتبوو.*

**پرژاندن** (چ.) برژاندن، بژارتن: *ماسی بە پرژاندن خۆشە.*

**پرس پێكردن** (چ.) راوێژ كردن: *پرسپێكردنی مرۆڤی گەورە پێویستە.*

**پرسیار** (ن.) پسیار، پرس، وتەیەك كە وەلامی پێویست بێت: *بە پرسیاران دەچیە شاران.*

**پرشاندن** (چ.) رەشاندن، پرژاندن

**پڕ** (ئان.) ١- تژی، گەلەك: *تانكێ مالا مە پڕ ئاڤ بوو.* ٢- زۆر: *بناری ئەم شاخە پڕە لە كوارگ.* ٣- تووڕەو بەرك: *دڵم لێت پڕ بووە.*

**پڕشادی** (ئان.) پڕكەیف، خۆشی، شادی: *سەیرانەكا پڕشادی بوو.*

**پڕشنگ** (ن.) تیرۆژ، تیشكی رۆژ: *پڕشنگی رۆژ لە نیوەڕۆدا بە هێزە.*

**پڕشنگدار** (ئان.) تیشكدار، درەوشەدار: *چرایەكی پڕشنگدار لە دوور دیار بوو.*

**پڕكردن** (ن.) تژیكرن، مشتكرن: *پڕ كرنا ڤێ قازانێ ل سەر تەیە.*

**پڕكردنەوە** (چ.) پڕكرنەڤە، تژیكرنەڤە، مشتكرنەڤە: *هەموو بۆشاییەكانم بە راستی پڕ كردەوە..* ٢- چوونەجێ، جێگرتنەوە: *شوێنێت جۆلێ نەبوو من پڕم كردۆتەوە.*

**پڕووكاو** (ئان.) بەو كەسە دەگوترێت، كە زۆر ماندوو و شەكەت بێت، یا دووچاری نەخۆشییەكی قورس بووبێت، یان *زۆر ترسا بێت.*

**پڕۆژە** (ن.) نەخشە و پلانەكی دارێژراو بۆ كارەك، بەرنامە، پڕۆسە:

حکومـەتی کوردسـتان بەتەمایە پـرۆژەی بنیاتنـانی پالاوگـەی نەوت لە بازیان جێبەجێبکات.

**پرۆسـە** (ن.) رێـڕەو و بەرنامـەی هـەر کـارەك: *پرۆسـەی خوێنـدن لـە ولاتەکـەمان زیـاتر گرنگـی پێدەدرێ.*

**پزیشك** (ن.) نۆشدار، نۆژدار، حـەکیم، دکتۆر، دختۆر: *چارەسەر کردنی نەخۆش کاری پزیشکە.*

**پژمـە** (ن.) بێهـنـژین، پنـژە، پشـمە: رووبەڕووی کەس مەپژمـە: *پژمە کردن دیاردەیەکی سروشتییە.*

**پستەکرن** (چ.) چرپەکردن، ورتەکردن، سـرتەکردن، پسەپسـکرن: *لـە کـاتی خوێنـدن پستەپسـت مەکەن.*

**پسـپۆڕی** (ن.) کارامـەیی، شـارەزایی، کارزانی: *ئـەم دکتـۆرە پسـپۆڕی لە چاو هەیە.*

**پسـمام** (ن.) کـوڕی مـام، ئـامۆزا: *پسمامێ من ئەندازیارە.*

**پش** (ن.) وشەی بانگکردنی پشیلەیە: *پش پش پشەکە وەرە.*

**پشت** (ئاك.) ١- دواوە، پـاش: *بەفرین لـە پشـت مـن دادەنیشـێت.* ٢- نـاوە بـۆ ئەندامـەکی لـەش لـە دواوە لە سـەر شانەوە تـا سـەر کەمـەر. ٣ پـەنا: *ئـەو پشـتی ئێمەیە.*

**پشتاوپشـت** (ن.) لـە نەوەیـەك بـۆ نەوەیـەك، دەمـاو دەم، نـەوە بەدوای نەوە، بابەلباب: *فۆلکلۆر پشتاو پشت دەمێنێتەوە یانیش دەگوازرێتەوە.*

**پشتە پەڕەکە** (ن.) پەڕێ پشتیێ.

**پشـتەڤان** (ن.) هاریکـار، پشـتەوان، یارمەتیدەر: *زبارە ب پشتەڤانیا ئێك و دوو دمێتەکرن.*

**پشتەڤانی** (ن.) پشتیوانی: *پشتەڤانی ئێوە زۆر گرنگە.*

**پشتی** (ئاك.) بڕوانە: پاش

**پشت بەستن** (چ.) ١- پشت ئالانـدن لـە پشـت: پشـت ببەسـتەوە بـا بـڕۆین. ٢- متمانـە کـردن، بـە کەسێك لـە کارێکدا، کـە تـۆ بـە

تەنیا پێت ئەنجام نادرێت: *بە پشت بەستن بە هێزی لاوان وڵات سەردەکەوێ.*

**پشت گوێ خستن** (چ.) فەرامۆشکردن، گوێ پێنەدان، بەهێندهەڵنەگرتن: *پشت گوێخستنی نەخۆش کارێکی مەترسیدارە.*

**پشتێن** (ن.) پشتبەند، پشتێند، شیتك، پژێن، ئەو دوو سێ مەترە قوماشەی لەسەر جلوبەرگی پیاوان و ئافرەتان لە کەمەر دەئاڵێندرێت.

**پشکنکاری** (ن.) بەدووگەڕان، لەدووگەڕان، لێگەڕیان، لەدویڤ گەڕیان.

**پشکنین** (چ.) ١- لێنێڕین، لێنۆڕین، بەدووگەڕان، لێگەڕیان: *پشکنین لە قازانجی هەموانە.*

**پشوو** (ن.) ١- هەناسە، بێهن، ئەو هەوایەی، کە لە دەم دەچێتە ناو سییەکەمان و دواتر دێتە دەرەوە. ٢- وچان، بێن، حەسانەوە، بێهن ڤەدان، ئیسراحەت: *ڕۆژانی شەممە پشووە بۆیە لە ماڵەوەم.*

**پشوودان** (چ.) حەسانەوە، بهێنڤەدان، ئیسراحەتکردن: *لە کاتی ماندووبووندا پشوودان پێویستە.*

**پشیلە** (ن.) پشیك، کتك، پسیلە: *پشیلە بەدوای مشکدا وێڵە.*

**پلاستیك** (ن.) باغە، ماددەیەکی تا ڕاددەیەك ڕەقە لە کۆمەڵێك پیشەسازی بەکاردێت: *پەنجەرەکە لە پلاستیك دروستکراوە.*

**پلان** (ن.) گەڵاڵەکاری، کەین و بەین، نەخشەڕێژی، بەرنامەڕێژی، ڕەنگرێژی: *هیچ کارەك بێ پلان سەرکەوتوو نابێ.*

**پلە کراو** (ن.) پلە کری، پلە بەند کراو، پلە پلە کراو.

**پلەی گەرما** (ن.) بەرزی و نزمی گەرما، کە کار دەکاتە سەر ئاو و هەوا: *لە کوێستانەکانی کوردستاندا پلەی گەرما نزمە.*

**پلك** (ن.) خالەت، پوور، خوشکی دایك یان باوك: *هەفتەی رابردوو بە سەردان چوومە ماڵی پلکم.*

**پلیکان** (ن.) پێسترك، پایسك، پێپیلکە، قادرمە، قاڵدرمە، پەیژە، پێبلکە، نەردوان: *بە پلیکانەدا سەرکەوتمە سەربان*

پڵنگ

**پڵنگ** (ن.) گیاندارەکی درندەی بەهێزو گۆشتخۆرە لە دارستانەکاندا دەژیت.

پنگوین

**پنگوین** (ن.) باڵندەیەکە سەر پشتی رەشەو لای سکیشی سپی. پنگوین وەکو ئادەمزاد قیتو قیت دەڕوات. پنگوین ناتوانێت بفڕێت، بەلاّم مەلە دەکات. پنگوین لە شوێنی سارد لە کەنار زەریا دەژی.

**پونگ** (ن.) پوینگ، پینگ، گیایەکی سروشتییە بۆن و تامەکی نەعناعی خۆشی هەیەو لە هەندێك جۆرە شیوی کوردەواریدا بەکاردەهێنرێ: *دۆینەی بە پوونگ خۆشە.*

**پویتەدان** (چ.) گرنگیدان: *پویتەدان بە پاکژی نیشانەی شارستانییە.*

**پویرت** (ن.) کوڵك: *خورییەکی لوولو ئاڵۆزە.*

**پویچ** (ئان.) ناڕێك، نابەجێ، بێبەرهەم: *کارێ پویچ نەکە.*

**پوور** (ن.) بڕوانە: **پلك**

پووره هەنگ

**پووره هەنگ** (ن.) شلّخە یان شرخەی مێش هەنگوین، کە هەموویان بەیەکەوە کۆدەبنەوە لە مێشەکی دی دەردەچن‌و بەیەکەوە هەڵدەکەن: *پووره هەنگەکەم بە چاکی داکرد.*

**پووزەڵ** (ن.) گیا لەبان: *کاکە ئەو پووزەڵانە هەڵقەنێنە.*

**پووش** (ن.) وشکە گیای دەشت‌و دەر، پویش، پیش: *پووش زوو گڕ دەگرێ.*

**پووشپەڕ** (ن.) کات و جەنگەی گیا دروونەوەیە، مانگێکی کەژی هاوینە (پووش پەڕ،گەلاوێژ، خەرمانان): *پووشپەڕ وەختی ڕاو نییە.*

**پوولەکە** (ن.) ١- پویلك، پوولەك، دانە وردەکانی پشتی ماسی: *لەشی ماسی بە پوولەکە داپۆشراوە.* ٢- ئەو دانە وردە بریقەدارانەی کە بۆ جوانی لە قوماش‌و جلوبەرگ دەدرێن: *نەسرین کراسێکی پوولەکەداری لەبەردابوو.*

**پۆرگ** (ن.) پرسك، بارگ، زیبکەی پڕ ئاو: *ئەو پۆرگەی لە دەستی هاتبوو تەقیوە.*

**پۆشاك** (ن.) نخێف، جلك‌و بەرگ، پۆشینەر، پۆشەر: *ئەم دوکانە تازە پۆشاکی جوانی هەیە.*

**پۆشەر** (ن.) بڕوانە: **پۆشاك**

**پۆشین** (چ.) ١- دەبەر کردن، کردنە بەر، بەرخۆ کرن: پێویستە *زستانان جلوبەرگی ئەستوور بپۆشین.* ٢- شاردن، داپۆشین، نخافتن، شاردنەوە، پۆشان: *شەرمینێ ژ شەرمادا رۆیێ خۆ پۆشی.*

**پۆل** (ن.) ١- کلاس، ژووری خوێندن: *لە پۆل خوێندن بە بێدەنگی دادەنیشم.* ٢- کۆمەڵ، دەستە، ریز: *لەوانەیە ئەو پۆلە باڵندە لەسەر چۆمەکە هەڵنیشن.* ٣- قۆناغی خوێندن: *لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بەیەکەوە بووین.*

**پۆڵا** (ن.) جۆرە ئاسنەکی رەقە، پیلا: *ئەم ئامێرە لە پۆڵا دروست کراوە.*

**پۆڵکە** (ن.) جۆرە دانەوێڵەیەکە، کەلیک: *مندەك پۆلکە هەنە ئەوێ بخوت گێژ ببیت.*

**پۆلیس** (ن.) هەیتە، دارۆغە، هێزی ناوخۆی دەوڵەت: *پۆلیس لە راژەی گەلدایە.*

**پۆلیسی ئاگرکوژێنەوە** (ن.) ئەو جۆرە هێزەیە، کە پەیوەندی بە باری فریاکەوتنەوە هەیەو لە کاتی کەوتنەوەی ئاگر بە دەزگای تایبەتییەوە بەرەو شوێنی رووداوەکە دەچن، تا فریای خەڵك بکەون.

**پۆلیسی فریاکەوتن** (ن.) جۆرەکی پۆلیسە لەکاتی رووداو و تەنگانەدا زوو فریای خەڵك دەکەون: *پۆلیسی فریاکەوتن هەمیشە لە ئامادە باشیدایە.*

**پۆلینکردن** (چ.) جوینکرن، بەش بەشکردن، ریز کردن: *جیهانی گیانەوەران بەسەر چەند جۆرێك پۆلین دەکرێت.*

**پیادەڕێ** (ن.) ئەو رێگەیەی رێبوار پێیدا دەڕوات.

**پیادەکردن** (چ.) جێبەجێکردن، پەیڕەو کردن: *پیادە کردنی مافی مرۆڤ بۆ هەموو کەسەك باشە.*

**پیاو** (ن.) ١– مرۆڤی نێر، مرۆ، زەلام: *پیاوی راستگۆ هەموو کەسەك خۆشی دەوێت* ٢– (ئان.) مەرد، ئازا، بە جەرگ: *کوڕەکی پیاوتان هەیە.* ٣– کامڵ، ئاقڵ، گەورە: *ئازاد بۆتە پیاو، بۆیە ئەوەی بۆی بکرێ ئاساییە.*

**پیت** (ن.) ١– فەڕو بەرەکەتو بە هێزی زەوی: *زەوییەکەی ئەو بەر بۆ دەغڵ زۆر بە پیتە.* ٢– دانەی ئەلفو بێی زمان، تیپ. ٣– ئەو دانانەی لە یاری ماتانێ (کەلانێ) دادەنرێنو کەلایان تێ دەگیرێ: *پیتەکەی ناوەڕاست کەوتووە راستی بکەوە.*

**پیتاك** (ن.) یارمەتی، کۆمەكو هاریکاری، دەست گیرۆیی: *خەڵکی هەولێر پیتاکیان بۆ لێقەوماوانی ئەنفالەکان کۆ کردەوە.*

**پیتاندن** (ن.) سازاندن، گونجاندن، چاککردن: *با دەبێتە هۆی پیتاندنی گوڵو رووەك.*

**پیتە** (ن.) کا، سڤی، کای هەرزنو چەڵتووکی برنج، توێکڵی چەڵتووك.

**پیترۆڵ** (ن.) گازی شل، نەوت، نەوتی خاو: *کەرکووك لە پیترۆڵدا دەوڵەمەندە.*

**پیتێن** (چ.) ئاڤز کرن، تێکەڵکردنی دوو شت تا بەرهەمەکی دی لێ پێك بێ.

**پیچکرنەڤە** (چ.) لەکار خستن، پووچەڵکردنەوە: *دڵسۆزان پیلانێن دوژمنان پیچکرنەڤە.*

**پیل** (ن.) ١– شانو مل: *دارەکانمان بە پیل گواستنەوە.* ٢– پاتری وشك: *گەلێك ئامێر بە پیل ئیشدەکەن.*

**پیلان** (ن.) ئاژاوە، بەرنامەو نەخشەی تەڵەکەبازیو فرتو فێڵ: پیلانگێڕان زۆر هەوڵیان دا کورد

لەناو ببەن، بەڵام پیلانەکانیان سەری نەگرت.

**پیر** (ئان.) ١- بە تەمەن، ژی درێژ، پیرێو،بەساڵاچوو: *پیاوی پیر شایستەی هاوکاریکردنە.* ٢- شێخی تەریقەت: گوێ لە ئامۆژگارییەکانی پیر شالیاری زەردەشتی بگرە. ٣- مەزاری پیاو چاکان: *ئەم ناوە پیرەکی لێیە.*

**پیرۆز** (ن.) هەر شتەکی پیرۆز بوو لای ئایینداران زۆر گرنگە، چونکە پێوەندی بە بیروباوەڕیانەوە هەیە: نابێت گاڵتە بە شتێ بکرێت کە پیرۆزە. ٢- ناوە بۆ مێینە: *پیرۆزێ ئەڤ ساڵە کۆلێژا ددانا خلاسکر.*

**پیری** (ن.) قۆناغەکا ژیانێیە، تەمەنی بە ساڵا چوون.

**پیرۆ** (ن.) سەکۆ، شۆستە: *من لەسەر پیرۆ پیاسە دەکەم.*

**پیس** (ئان.) ناخاوێن، نەپاک، چەپەڵ: *کتێبەکانت پیس مەکە.*

**پیستە** (ن.) چەرم: ئەم جەنتەیە لە پیستەی پڵنگ دروستکراوە.

**پیستە پەردە** (ن.) پەردەپیست.

**پیستە دڕکاوی** (ن.) پیستە ستری، وەکو ژیژك.

**پیشەسازی** (ن.) کارسازی، پیشەکاری، سنعات: *پەرەسەندنی ئابووری وڵات بە پیشەسازییەوە بەندە.*

**پێبەخشین** (چ.) پێدان، خەڵاتکردن: *ئەوەی مەتەڵەکە بزانێ خەڵاتەکی پێدەبەخشم.*

**پێبەند** (ن.) پابەند، پێوەند، پێبەست، سندم، کۆتو پێوەند: *تاوانبارەکە بە پێبەندییەوە بۆ بەندیخانە برا.*

**پێپلکە** (ن.) بڕوانە پلیکان.

**پێچەوانە** (ئان.) بەرەڤاژی، بەرەواژی، ئاوەژوو، بەروڤاژی، دژ: *لە بیرو ڕادا هیچ کات پێچەوانەی یەکدی نەبووین.*

**پێداڕۆیشتن** (چ.) بەناودا چوون، بە ڕێگادا ڕۆیشتن: *سوارەکان بە بناری شاخدا ڕۆیشتن.*

**پێدا گرتن** (چ.) رژدبوون، مکوڕبوون، سووربوون: بە *پێداگرتنی ئێمە نیازەکانمان جێبەجێکرا.*

**پێداویستی** (ن.) پێدڤی، پێتڤی، پێویستی، ئاتاجی: *پێداویستییەکانی ژیان لە زیادبووندان.*

**پێدڤی** (ن.) بڕوانە: پێداویستی.

**پێرێ** (ئاك.) دوو ڕۆژ پێشتر: *پێرێ لە سلێمانی بووم.*

**پێزانین** (چ.) ئاگادار بوون، هەستکردن، زانین: *ئەمەی تۆ کردت پێویستی بە پێزانین هەیە.*

**پێست** (ن.) ١ـ کەوڵی گیاندار: پەنیرو ژاژی لە پێستی ئاژەڵدا هەڵدەگیرێت . ٢ـ چەرم، توێژە ناسکەکەی سەر گۆشت: *لەگەڵ بەربوونەوەکە مەندەك پێستی دەستی ڕووشاوە.*

**پێسووتین** (چ.) پێ سووتان، شتێك بە شتێکی دی بسووتێ: چەندەها گوندێن کوردستانێ ب گازا جۆراو جۆر سۆتینە.

**پێش** (ئاك.) ١–بەرانبەر، بەرامبەر، بەردەم: *لە پێشم ڕاوەستە با جوان بتبینم.* ٢– بەر لە، پێش ئێستا: *پێش دوو کاتژمێر گەڕامەوە.*

**پێشانگا** (ن.) جێگەی ڕانان، ڕانگە، نمایشگا، جهێ نیشاندانا تشتان: *قوتابیانی پۆلی شەشەم پێشانگایەکی مونەرییان کردەوە.*

**پێشتر** (ئان.) لەمەو پێش، جاران، بەر لە ئێستا: *ئەو پێشتریش قوتابییەکی زیرەك بوو.*

پێشەوا قازی محەمەد

**پێشەوا** (ن.) ١– سەرۆك، سەرکردە، ڕێبەر: *قازی محەممەد لە مێژووی جووڵانەوەکانی کورد بە*

پێشەوا ناسراوە. ٢- ناوە بۆ نێرینە: *پێشەوا یاریزانەکێ بەرکەفتییە.*

**پێشکەفتن** (چ.) بەرەوپێش چوون، گەشەکردن، پەرەسەندن، پێشکەوتن، بۆ پێشەوە ڕۆیشتن: *پشتی راپەرینێ کوردستان پێشکەفتنەکا باش بخوڤە دیتییە.*

**پێشکەوتن** (چ.) بڕوانە: پێشکەفتن.

**پێشمەرگە** (ن.) ئەو کەسەیێ خۆ گۆڕی وەلاتێ خۆ دکەت، گۆڕیکەر، چەکدار، ڕزگاریخواز: *پێشمەرگە پارێزەری ولاتە.*

**پێشوازی** (ن.) بەپیرەوە چوون: *زۆر بە گەرمی پێشوازیم لە مامۆستاکەم کرد.*

**پێشوو** (ئاک.) ١- بەری، پێش ئێستا: *سالی پێشوو بە یەکەم دەرچووم.* (ن.) ٢- جۆرە زیندەوەرێکە، پێشکە، مێشوولە: *ئەو شوێنەی گۆماوی لێیە پێشووی زۆرە.*

**پێشێلکردن** (چ.) جێبەجێ نەکردن، بەزاندن، سەر پێچی کردنی پەیمان و بەڵێن: *پێشێل کردنی یاساکانی هاتوچۆ کارەکی ناشارستانییە.*

**پێڤەهاتی** (ئان.) لێهاتی، ژێهاتی: *سەردار ئەفسەرەکێ گەلەک شۆل پێڤەهاتییە.*

**پێکخۆشبوون** (چ.) بە ئێک شادبوون: *بەدیتنی وان گەلەک پێکخۆشبوون.*

**پێکڤە** (ئاک.) پێکەوە، بەیەکەوە: *با پێکڤە یاری بکەین.*

**پێکگەیشتن** (چ.) ڕووبەڕوو بوونەوە، دووچارهاتن، تووشهاتن، گەهشتنە یەک: *لە ڕێگادا پێکگەیشتین.*

**پێکۆلکرن** (چ.) هەوڵدان، تێکۆشان، بزاڤکرن: *پێکۆلکرن لە پێناو ژیاندایە. مرۆڤ ب پێکۆلکرنی سەردکەڤیت.*

**پێکئینان** (چ.) ١- پێکهێنان، سازاندن، دروستکردن،

چاککردن: *وەزارەتا مە چەند لێژنەیەك پێکئینان.* ٢- ئاشتکردنەوە: *ھەردوو بنەماڵێن خویندارمە پێکئینان.*

**پێکھاتن** (چ.) تەبا بوون، ڕێکەوتن: *زاناو دانا لەسەر ھەموو شتەکان پێکھاتبوون. ھەردوو برا پێکامتن کو پێکڤە بژین.*

**پێگەیشتن** (چ.) ١- کامڵبوو، گەورەبوو، نەشونماکردن: *ھەموو دارەکان پێگەیشتوون.* ٢- ھاتنە بەر، گەیین، ڕەسین، میوە لە کاتێکدا بۆخواردن دەست دەدا: *سێوەکان پێگەیشتوون.* ٣- ئامادەبوون، حازر بوونی خواردن: شیوەکە *پێگەیشتووە فەرموون دانیشن.*

**پێگەیشتوو** (ئان.) پێگەھشتی، کامڵ، گەورە، ڕەسیو: *منداڵی پێگەیشتوو بە ڕەفتاری دا دیارە.*

**پێنج گۆشە** (ئان.) ئەم پارچە زەوییە لە شێوەی پێنج گۆشەدایە.

**پێنج یەك** (ئان.) بەشێك لە (٥) بەش: پێنج یەکی مەڕەکانم فرۆشت.

**پێنڤیس** (ن.) پێنووس، خامە: ب ڤی پێنڤیسی ئەز دکارم جان بنڤیسم.

**پێنگاڤ** (ن.) شەقاو، ھەنگاو: کورد پێنگاڤ پێنگاڤ دکارێن خۆدا پێش دکەڤن.

**پێنووس** (ن.) قەڵەم، خامە: پێنووس چەکی سەردەمە.

**پێوان** (چ.) پیڤان، کاری بەراوردکردن بە پێوەرەکی دیاریکراو: مەتر یەکەی پێوانەی درێژییە.

**پێوەر** (ن.) پیڤەر، پیڤك، ئەو ئامێرەی پێوانی پێدەکرێ: تەرازوو پێوەری کێشە

**پێوەری خێرایی** (ن.) پیڤەرێ لەزێ.

**پێوەنووساندن** (چ.) پێڤە نویساندن، پێڤە گرێدان، پێکەوەلکاندن.

**پێویست** (ئان.) پێدڤی، شتێك کە زۆر گەرەك بێت، پێداویست: بەپێی پێویست بخەوە، کار بکە، نان بخۆ.

**پێویســـته** (ئــاك.) دڤێــت، پێدڤیـــه: پێویسته قوتابخانەکـەمان پـاك رابگرین.

**پێویستی** (ن.) پێداویسـتی، ئاتـاجی: پێویستی ماڵ هـەر لـە زیـادبوون دایە.

**تا** (ن.) ١- ئامرازی لێکدەر، کە دوو ڕستەی سادە لێکدەدات: ئەو بە ڕێگەوە بوو، تا ڕۆژهەلات.
٢- تای تەرازووو، پێ تەرازو: زیرەکی هەندێك قوتابی لە تای تەرازوو دانانرێ. ٣- تاوولەرز، جۆرە نەخۆشییەکە، کە پلەی گەرمی مرۆڤ بەرزدەبێتەوە: لەگەڵ سەر ئێشەکە تایەکی گەرمی لێبوو.

**تاتەخشت** (ن.) خشتی پانی وەك بەرد: دیوارەکە لە تاتە خشت دروستکراوە.

**تاتە شۆر** (ن.) ئەو تەختەیە، کە مردووی لەسەر دادەنێن، هەتا پێش ناشتنی بیشۆن، تەختی شویشتنا مریان.

**تاتە قوڕ** (ن.) شتێکە لە قوڕ بۆ نووسین خۆشکراوە: *مرۆڤی کۆن لەسەر تاتە قوڕ بە خەتی بزماری دەیاننووسی.*

**تاج** (ن.) کڵاوی پاشا: *لە مێژوودا زۆر ژن هەن، کە تاجی پاشایەتییان لەسەر داناوە.*

**تاجە گوڵینە** (ن.) دەسکە گوڵ، چەپکە گوڵ، دەستکە گوڵ: بە

*بۆنەی کۆتایی هاتنی ساڵی خوێندن تاجە گوڵینەکم پێشکەش بە مامۆستام کرد.*

**تاریك** (ئان.) تاری، شوێنێك بێ ڕووناکی بێ: *ژوورەکەمان زۆر تاریکە.*

**تاریکە شەو** (ئان.) شەڤا تاری، شەوەك مانگ لە ئاسمان هەڵنەهاتبیت و تاریك بێت.

**تازە** (ئان.) ١- نوو، نوێ: جلەکەی زۆر تازەیە. ٢- (ئاك.) ئێستا، هەنووکە، نووکە، نهۆ: *تازە ڕۆیشت.*

**تاسان** (چ.) واقوڕمان، سەرسوڕمان، کاسبوون، هوڕبوون، گێژبوون، حەپەسان، مەندەهۆشبوون: هەموویان بە دیتنی دیمەنەکە تاسان.

**تاساو** (ئان.) گێژبوو، هێندێك جار، کە دووچاری ڕووداوێك، یان کێشەیەك دەبیت، گێژو هوڕ دەبیت، نازانیت چۆن ڕەفتار بکەیت: دەکرێت بزانین بۆ وا تاساوی؟

**تاشەبەرد** (ن.) تەفشەبەر، بەردی گەورە، پانە بەرد، زەنار: *لەسەر تاشە بەردەکە دانیشتبوو.*

**تاشین** (چ.) تراشین: سەرتاشین کاری بەربەرە.

**تافتافکەرە** (ن.) تاقتاقکەرە، قژاوکە، تەتەك، باڵدارەکە شەو تا ڕۆژ دەڵێ توت توت: *تافتافکەرەکەم بەرەڵلا کرد.*

تاڤگە

**تاڤگە** (ن.) سویلاڤ، هەڵدێر، تافینە، ئاوەك، کە لە بەرزاییەك بێتە خوارەوە: *تاڤگەی گەلی عەلی بەگ ماوینە هەوارەکی خۆشە.*

**تاق** (ن.) ١– بۆشاییەكە لە نێو دیوار دروست دەكرێت، زۆرجار شێوەی لاكێشەیی، یان چوارگۆشەیی دەبێتو شتی لەناو دادەنرێت.٢– تاك، تەنیا، تەنها، تەنێ، بە تەنها، تەنیا: بە *تاقی تەنها ڕۆیشت.* ٣– لە ژمێریاریدا بە ژمارەی ١، ٢، ٣،..... دەڵێن تاق، یان تاك، كە لە بەرامبەریدا ٢،٤،٦،٨،... هەیەو جووتن. ٤– دان، تاف: *تاقی بەیانی ڕۆیشت.*

**تاقانە** (ئان.) ١– ئێكانە، تاكانە، خێزانێك كە یەك كوڕ وەیا یەك كچیان هەبێ پێیان دەگوترێت تاقانە هەروا چەند خوشكێك یەك برایان هەبێ یان چەند برایەك یەك خوشكیان هەبێت، دیسانەوە تاقانەن: *شیلان لە ماڵەوە زۆر خۆشەویستە، چونكە تاقانەیە.* ٢– بێ هاوتا: كتۆپاز لە ژێریدا نموونەیەكی *تاقانەیە.*

**تاقیكردنەوە** (چ.) جۆرە ئەزموونێكە بۆ ئەوەی بزانیت تا چەند شارەزایتو زانیاریت لەسەر هەر شتو هەر بابەتێكدا هەیە، ئەگەر سەركەوتنت بە دەست هێنا، ئەوا دبلۆمێكت دەدەنێ، بڕوانە: **دپلۆم.**

**تاقیگەه** (ن.) تاقیگا، ئەزموونگە: *دەچم بۆ تاقیگەه خوێن دەبەخشم.*

**تاقیكرن** (چ.) تاقیكردنەوە، ئەزموونكردن، جەڕباندن: *بەتاقیكردنەوە سەلمێنراوە، كە هەوا لەسەرەوە بۆ بنەوە پەستانی هەیە.*

**تاكو** (ئام.) ١– دا، تا، بۆ ئەوەی: *دەخوێنم تاكو سەركەوم.* ٢– ماوەی نێوان دوو شوێن، هەتا: *لە ماڵەوە تاكو ناوشار دوو كیلۆ مەتر دەبێت.* ٣– ماوەی كات: ژیلە تاكو نیوەی شەڤ دیوانی مەحوی خوێندەوە.

**تاڵ** (ئان.) ١- تامی ناخۆش، تەحل، تفت: *ئەم چایە تاڵە نەختێ شەکری تێکە.* تاڵ X شیرین.
٢- داو، موو: *چەند تاڵەکی لە پرچی هەڵوەریون.*

**تاڵان** (ن.) پوڕ، تاڵو، بڕدراو، دزراو: *ستاندنی ماڵو سامان لەهەر کەسێك بەزۆری، تاڵانە.*

**تاڵانکردن** (چ.) پوڕ کردن، بەزۆری لێ ستاندن: *دوژمنان هەردەم گوندێن مە تاڵان دکرن.*

**تاڵەبان** (ن.) تاڵەبان هۆزەکی کوردە لە کەرکوك: *شێخ رەزای شاعیر لە هۆزی تاڵەبانە.*

**تامکردن** (چ.) چێژ لێوەرگرتن: *چێشتەکەم تامکرد.*

**تانك** (ن.) دەبابە: ماشینەکی ئاسنی سەربازییە گوللە نایبڕێ، تۆپ و مەترەلۆزی لەسەرە: *دەبابەی دوژمن نامان ترسێنێت.*

**تاو** (ن.) ١- هەتاو، تاڤ: *چوومە بەرتاوێ.* ٢- گوڕ، هێز: *ئەسپەکە بە تاو هات.*

**تاوان** (ن.) گوناح، خەتا، سووچ، گونەھ: *تۆمەتبارەکە بێ تاوان دەرچوو.*

**تاوانبار** (ن.) گوناھبار، خەتابار، خەتاکەر: *تاوانبارەکە درایە دادگا.*

**تاوەر** (ن.) بورج، قوللە: *هەر فڕۆکەخانەیەك تاوەرەکی هەیە بۆ چاودێری.*

تاوس

**تاوس** (ن.) باڵندەیەکی گەورەیە، پەڕی باڵەکانی رەنگینن.

**تاویاد** (ن.) تاو لەرز، لەرزو تا: *مێشوولەی ئەنوفیلس تاویاد پەیدا دەکات.*

**تاویار** (ن.) تاوەر، تاوێرەك لە برێشکەو شتی تر، ئەوەی جارەك لە سێڵدا ببرژێت: *دایە*

*گیان تاوێرەك ئەستوورکم بۆ بېرژێنە.*

**تاوێر** (ن.) جۆرە بەردێکی پان و گەورەیە وەك چین و توێژاڵ لە نێو زەویدا دەردەکەوێت: *ئەو تاوێرە بەردانەی بەربوونەوە لا دران.*

**تایبەت** (ئان.) تاوبەت، دیاریکراو: *ئەز ب کارەکێ تایبەت چوومە هەولێرێ.*

**تایبەتی** (ن.) تاوبەتی، بژاردە: *دیارییەکا تایبەتی دێ بۆته منێرم.*

**تایبەتمەندی** (ن.) بژاردراو، خەسڵەت، ئەدگار، چۆنیەتی بارودۆخی هەرشتەك: *هەر چینێکی کۆمەڵ تایبەتمەندی خۆی هەیە.*

**تایە** (ن.) تای ئۆتۆمبێل: *هەموو ئۆتۆمبێلەك پێویستی بە تایەی سپێر هەیە.*

**تە** (ج.) ١- تۆ، تو، ئەتوو، جێناوی جودایە بۆ کەسی دووەمی تاك: *تە نان خوارد.*

**تەبا** (ئان.) گونجاو، کۆك، ساز، رێك: *ئازاد و نەوزاد لەگەڵ یەکتر زۆر تەبان.*

**تەبەق** (ن.) ١- سەلك، سەبەتە. *تەبەقەکا نانێ تەنك بۆمە ئینا.* ٢- نەخۆشییە تووشی قاچی ئاژەڵ دەبێت و لە رۆیشتن دەکەوێت. ٣- قات، نهۆم: خانیێ مە دوو تەبەقە.

**تەپۆڵکە** (ن.) گرك، زویرك، تەپۆکە، گردۆڵکە، گردەك زۆر بڵند نەبێت: *لە دەورووبەری بەردەرەش تەپۆلکە زۆرن.*

**تەختە** (ن.) دەپ، تەختەدار، دارەك کە داتاشرابێ: *دارتاشەکە مێزەکەی لە تەختەکە دروست کرد.*

**تەرازوو** (ن.) ١- تەرازوی، ئامرازی پێوانی شت، بۆ کێش و سەنگ بەکاردێت. ٢- کۆمەڵە ئەستێرەیەکن لە ئاسمان بەیەکەوەن، پێروو و تەرازوو.

**تەرزە** (ن.) تەگر، تەگەر، گلێرە، تەزرە، تەرگ، گژلۆك، گشك: *دوێنێ تەرزەیەکی زۆر باری.*

**تەری** (ئان.) تاریك: *شەڤا دی زۆر تەری بوو.*

**تەڕ** (ئان.) تەڕ پێچەوانەی وشکە، شتێ بە ئاو بێ، ئاوی پیا کرابێ: *لقە دارەکی تەڕ بێنە.*

**تەزوو** (ن.) ١- تەزنك، شیپ، موچڕك: *لەگەڵ مەواڵەکە تەزووی بە لەشدا هات.* ٢- وزە، ئەو هێزە خێرایەی بەناو تێلەکانی کارەبادا تێدەپەڕێ: تەزووی کارەبا رووناکیمان دەداتێ.

**تەسك** (ئان.) تەنگ، هەر کە تۆ ساڵ بە ساڵ گەورەتر دەبیت جلی ساڵانی پێشترت بۆ تەسك دەبێت: *جلی تەسك لەبەر مەکە.*

**تەسلیم بوون** (چ.) خۆبەدەستەوەدان، ئەگەر سەربازێك لەبەرەی شەڕدا هیچ جۆرە چەکێکی پێنەما، بە ناچاری تەسلیم دەبێت: *ئێمە تەسلیم بوون رەتدەکەینەوە.*

**تەشەنە** (ن.) بەلاڤە، دێرانەدی، گەورەبوون و بەرفراوانبوونی نەخۆشی یان برین: *لە کاتی چارەسەرکردنی بریندا دەبێت ئاگاداری بین نەبادا تەشەنە بکات.*

**تەشت** (ن.) دەفرێکی گەورەی دەو والای لێودارە، کە لە مس و فافۆن، یا ئەلەمنیۆم، یان پلاستیك دروستدەکرێ بۆ مەبەستی جیا جیا بەکاردێت: من رۆژە لە نێو تەشتی تایبەتی خۆی دەشۆم.

**تەعەداکردن** (چ.) تەعەدا وشەیەکی عەرەبییە بە واتای شەڕپێفرۆشتن، دەست درێژیکردن و داننەنان بە مافی ڕەوای تۆ دێت: *تەعەداکردنە سەر خەڵك پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤە.*

**تەعریب** (ن.) وشەیەکی عەرەبییە، بەمانای بە عەرەبکردن دێت: *بە عەرەبکردن سیاسەتەکی قێزەون بوو، کە ڕژێمی بەعس بەکاریدەهێنا.*

**تــەعریبکردن** (چ.) بــە عــارەبکردن: *دەبــێ پرۆســەی تــەعریبکردن پووچەڵ بکرێتەوە.*

**تــەڤ** (ئـان.) گشـت، هـەموو: کـورد ب *تەڤرا تێدەکۆشن.*

**تەق** (ن.) ١- دەنگی شت بەیەك وەیا بە ئـەرد کـەوتن. ٢- رەق، بـە تــەنیا: *نــانێکی رەق و تــەقی دەخوارد.*

**تەقانــدن** (چ.) پەقانـدن، تەرەقانـدن: *مــین تەقانــدن لــە کوردســتاندا بەردەوامە.*

**تەگــــەرە** (ن.) ئاســتەنگ، کۆســـپ، لەمپـــەر: *تەگـــــەرە مەخـــــەرە بەردەمم.*

**تەل** (ن.) تێل، وایەر، سیم: *دەست لە تەلی کارەبا مەدە.*

تەلار

**تـــــەلار**: (ن.) باڵەخانـــــە، کۆشـــــك، بینایەکی گەورە: *تـەلاری کـۆڕی زانیاری کوردسـتان لـە شـەقامی مەڵەبجەیە.*

**تەلەڤزیۆن** (ن.) هۆیـەکی راگەیانـدنی دیـتراوە: *تەلـەڤزیۆن هەواڵـەکان بەدەنگ و رەنگ بڵاودەکاتەوە.*

تەلیسکۆب

**تەلیسکۆب** (ن.) تەلیسکۆب دەزگایەکە بـۆ بینینـی ئەسـتێرەکان: بـە *تەلیسکۆب ئەستێرە دوورەکان باش دەبینین.*

**تەڵە** (ن.) تەڵهە، ئامرازێکە لە مـەتاڵ و تەختـە دروستدەکرێت، لـە نێـو

مالآندا بە زۆری بۆ مشك گرتن بەکاردێت.

**تەڵەمشك** (ن.) تەڵەی مشك، ئامێرەکی بچووکە بۆ گرتنی مشك بەکاردێت: *مشکەکە بەتەڵەکەوە بوو.*

**تەم** (ن.) تەمو مژ، دومان، تومان: *لە رۆژی تەمدا راندەی بینین کەم دەبێتەوە.*

**تەماشاکردن** (چ.) سەیرکردن، زەین دان، روانین، تێڕامان، بەرێخۆدان، مێزکرن: *تەماشای کتێبەکەت بکە بزانە چۆن دەخوێنمەوە.*

**تەمەن** (ن.) ژی، عەمر، عومەر، ماوەی ژیان: *یاخوا تەمەنت درێژ بێ.*

**تەمبەڵ** (ئان.) تەوەزەل، کارنەکەر، زەغەل: *مرۆڤی تەمبەڵ کەس حەز ژی ناکەت.*

**تەمسیل** (ن.) نواندن، زارڤەکرن: *من حەزم لە کاری تەمسیلە.*

**تەمووز** (ن.) تیر مەه، ناوی مانگی (٧) حەوتەمی سالی زاینییە: *لە مانگی تەمووز گەشت دەکەم.*

**تەن** (ن.) ١- لەش، بەدەن، قالب، جەستە: ٢- پێوانەیەکە قورسایی پێ دەکێشرێت: *تەن، هەزار کیلۆ گرامە.*

**تەناهی** (ئان.) ئارامی، رەحەتی، هێمنی، ئاشتی، بێدەنگی، لەسەرخۆ: *ب ئاشتی و تەناهی ژیان خۆشە.*

**تەندروستی** (ن.) ساخلەمی: *بنکەی تەندروستی لە زۆربەی گوندەکاندا کراوەتەوە.*

**تەنگاڤی** (ئاك.) تەنگانە، ناخۆشی، ئالۆزی، بەرتەنگی، تەنگاوی، کاتی تەنگو چەڵەمە: *مرۆڤی باش دەمێ تەنگاڤیان نیار نبیت.*

**تەنگانە** (ن.) بڕوانە: تەنگاڤی

**تەنگەبەر** (ئان.) تەسك: *کۆلانە کۆنەکان تەنگەبەرن.*

**تەنگ پێهەڵچنین** (چ.) زۆر بۆ هێنان، بێ دەرەتان کردن، هەراسان کردن: *تەنگم پێهەڵچنی تا ئاشکرایکرد.*

**تەنها** (ئان.) تنێ، تەنیا، تەنێ، بەتەنێ، تەنیا، تاك: *تەنها خۆم چووم.*

**تەنیا** (ئان.) بڕوانە: تەنها.

**تەوار**(ن.) بازی مێ: *تەوارەکە لە شوێنی خۆی هەڵنیشت.*

**تەواوکردن** (چ.) بنهێنان، کۆتایی پێهێنان، جێبەجێکردن، تەمامکردن، تەفاقکرن: *تەواو کردنی خانووەکە زۆری خایاند.*

**تەوەر**(ن.) ١- دارەکی کوڵدارە لە کونی بەرداشی سەر ڕووی ئاسن گیردەکرێو بلووسکی تێ هەڵدەکێشرێت: *تەوەری ئاشەکە نەچەسپاوە.* ٢- ئەو بنەما گشتییەی، کە باسێکی دیاریکراوی لەسەر دەخولێتەوە: *تەوەری باسەکەمان لەسەر منداڵە.*

**تەوژم** (ن.) نهێم، پێل، گوڕ، توندو زۆرو هێزدار: *بایەکی بە تەوژم هەڵیکرد.*

**تەون** (ن.) تەفن، چنین: *کارگەی تەونی هەولێر کوتاڵی چاکی دروستدەکرد.*

**تەویلە** (ن.) گۆڤ، شوێنی وڵاخی بەرزەیە (ئەسپو ماینو ئێستر): *ئەسپەکانی لە تەویلە هێنانە دەر.*

**تەیارە** (ن.) فڕۆکە، باڵەفڕ: *بڕوانن منداڵینە تەیارەی واتان دیوە.*

**تبل** (ن.) پەنجە، ئەنگوست، قامك، پل: *من تبلا خۆ پاقژ کر.*

**ترپە** (ن.) دەنگی کەوتنی شتەك یان دەنگی پێ، پێژن: *گوێم لە دەنگی ترپەی پێی بوو.*

**ترسناك** (ئان.) بەترس، مەترسیدار: *جادەیەکی ترسناکە پێویستە هێواش بڕۆی.*

**ترسنۆك** (ئان.) بێوورە: *ئەگەر دایك منداڵەکەی خۆی بەترسو لەرز*

*گەورەکرد، منداڵەکە ترسنۆک دەردەچێت.*

**ترووپکە**(ن.) ١- دۆندی کێو، لووتکە، کلیڤانگ، گوپیتک: *ترۆپکی قەندیل بەرزە.* ٢- بڵندترین شوێن لە دار: *باڵندەکە بەسەر ترۆپکی دارەکەوە هەڵنیشت.*

**ترومپا** (ن.) پەمپ، ئامرازەکە ئاوی پێ لە بیر دەردەهێنرێ، هەروا نەوتیشی لە بەرمیلەوە پێ دەردەهێنرێت.

**تروووکان** (چ.) ١- لێکدانی هەردوو لا پێڵوی چاو، چاڤ نقاندن، قوچاندنی چاو: *بە چاو تروووکانێک گەیشتە لام.* ٢- لێکبوونەوە، شکان، تەقین، ترکین: *هەموو هێلکەکان تروووکان.*

**تروووکاندن** (چ.) لێکردنەوە، شکاندن، تەقاندن.

ترۆپک

**ترۆپک** (ن.) بڕوانە: **ترووپکە**

**تری** (ن.) ترێ، تەری، هەنگور، میوەیەکی شیرین و خۆشە: *دۆشاو لە ترێ دروستدەکرێ.*

**تریشکە** (ن.) تریسکە، برووسکەی هەور، بریسی: *لە بەهاران تریشکە هەور دەبینرێ.*

**ترێ** (ن.) بڕوانە: **تری**

**تشت** (ن.) شت، چشت: *تشتەك نەما باسی نەکەین.*

**تکا** (ن.) هیڤی، نزا، پاڕانەوە، داوا: *تکام وایە ئاگاتان لە وانەکانتان بێ.*

**تکان** (چ.) ڕژان: *گۆزەکە ئاوی لێ دەتکا.*

**تکەل** (ئام.) دگەل، ل گەل، لەگەڵ: *تکەل تۆدا دەچین بۆ بازاڕ.*

**تو** (ج.) بڕوانە: **تە**

**توانا** (ن.) شیان، هێز، تاقەت، وزە: *توانام هەیە بەسەر ئەم گردە بکەوم.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**توانەوە** (ن.) تاوانەوە، حەلبوون، بوژین، بهوژین، برێتییە لە گۆڕانی ماددە لە دۆخی رەقییەوە بۆ دۆخی شلی بە وەرگرتنی گەرمی پێویست: *لەگەڵ دەرکەوتنی خۆری بەهار بەفری چیاکانیش دەتوێتەوە.*

**توانست** (ن.) توانا، هێز، تاقەت: *توانستی ئێمە هەر ئەوەندەیە.*

**تورەڤان** (ئان.) نقیسەڤان، رەوشەنبیر، وێژەوان: *جەلادەت بەدرخان تورەڤان بوو.*

**تورکمان** (ن.) کۆمەڵێکە سەر بە گەلانی تورک زمان. لە سەدەی یازدەی زاینیدا لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بە رێگەی ئازەربایجانەوە هاتوونەتە وڵاتی کوردەواری‌و لە سەدەی چواردەدا هێندێکیان لە کەرکوك‌و باشووری کەرکوك نیشتەجێبوون.

**تورکیا** (ن.) *دەوڵەتەکە دەکەوێتە باکووری کوردستان.*

**توند** (ئان.) دژوار، موکوم، بەهێز: *بە گوریسەکی توند قایمیان کرد.*

**توندوتیژ** (ئان.) ئازار بەخش، تووڕەوتوند، بە زەبر: مرۆڤی توندوتیژ لە ژیاندا سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت.

**توندوتیژی** (ن.) ئازاربەخشی، تووڕەیی، زەبروزەنگی: بەکارهێنانی توندوتیژی دژ بە منداڵ کارێکی ناڕەوایە.

**تووتن** (ن.) ڕووەکەکی گەلاداره لە پیشەسازی جگەرە بەکاردێت: تووتنا بەری گارەی یا بناڤو دەنگە.

**توور** (ن.) ١- تڤر، جۆرە ڕووەکەکی زستانییە لە ژێر گڵدا سەرك دەکات‌و پەلك‌و لاسکەکەشی دەخورێ. ٢- توورەکە، تویرك، ئەوەی لە کۆڵ دەکرێ‌و کاڵاو خۆراکی تێدەکرێ.

**توورەگە** (ن.) بڕوانە: **توور**

**تووش** (ئان.) ١- هەوای زۆر ساردو بارانـاوی: *ئـەمڕۆ ئـاو و هـەوا*

تووشە. ٢– مرۆی بەدفەڕو بێ ئاکار: *خۆت لە کەسانی تووش لا دە*. ٣– گیانداری گاز گرو لەقە هاوێژ: *ئەسپەکە تووشە*.

**تووك** (ن.) ١– پویرت، مووی پێستی ئادەمزاد، قژی سەری مرۆڤ، ئەگەر یەکێك مووی زۆر بوو دەڵێن تووکن، بە مووی لەشی سەگیش دەگوترێت تووك. ٢– دوعای خراپ، نزای خراپ، نفین: *تووك لە خەڵك مەکە*.

**توون** (ئان.) ١– خواردنی تیژ. ٢– (ن.) ئاگردان، جەهەننەم. ٣– دۆڵاو شیوی قووڵاو زۆر. ٤– توونی حەمام، شوێنی ئاگرەکەی.

**توێژ** (ن.) ١– سەرتی، سەرتوی، سەرتوو، چەورییەکی تەنکە دەکەوێتە سەر ماست: *ماستی ئەوجارەمان توێژی کەمبوو*. ٢– قەتماغەی برین: *برینەکەم هێشتا توێژی نەگرتووە*. ٣– بەشەك لە کۆمەڵ: *پێویستە توێژی لاوان زێترگرنگییان پێبدرێت*.

**توێژین** (چ.) لێکۆڵینەوە، ڤەکۆلین: *توێژین خویا دکەن کە مرۆڤێ نیاندرتال ل کوردستانێ ژیایە*.

**توێژینەوە** (چ.) لێکۆڵینەوە، ڤەکۆلین، دیراسەکردن: *کەلانی جیهان بە توێژینەوە پێشکەوتن*.

**توێکڵ** (ن.) بەرگی سەرەوە، قەپێلك، توێژ، تیڤل، قەلپیچك: *گوێز ناوکەکەی دەخوری توێکڵەکەشی بۆ سووتاندن لە زستانان زۆر باشە*.

**تۆ** (ج.) تە، تو: *تۆ پیاوەکی زیرەکی*.

**تۆپ** (ن.) ١ـ چەکێکی گەورەی شەڕە، کە گوللەی گەورە دەخوات لەسەر ماشێن و زرێپۆش و تانك دادەنرێت و شوێنی دووری پێ تۆپ باران دەکەن: *دوژمن سەر سنووری تۆپ بارانکرد*. ٢– جۆرە ئامێرێکی یاریکردنە شێوەیەکی خڕی هەیە، دەتوانیت یاری پێبکەیت، وەکو تۆپی پێ، تێنس، بالە، سەبەتە، دەست: *من حەز لە یاری تۆپی پێ دەکەم*. ٣– بەستەیەك قوماش لە کارخانە مۆری لەسەر

دەدرێت: *بازرگانەکە سێ تۆپ کوتاڵی فرۆشت.*

**تۆپك** (ن.) گوپیتك، لوتکە، کلیڤانك: *کورد بەرەو تۆپکی سەرکەوتن دەڕوات.*

**تۆپین** (چ.) مردار بوون، بۆ ئەو ئاژەڵانە بەکاردێت، کە گۆشتیان ناخورێت، وەك سەگ، پشیلە، گورگ، بەراز و.....: *گوێدرێژەکەمان تۆپی.*

**تۆران** (چ.) تووڕە بوون، رق هەڵسان، زیزبوون، سڵبوون، زویربوون، بەجێهێشتن، واز هێنان: *تۆران سیفەتەکی ناشرینە.*

**تۆمار** (ن.) ئەو پەڕاوەیە زانیاری تێدا تۆمار دەکرێ، سجل: *ناوم لە تۆماری قوتابخانە نووسراوە.*

**تۆو** (ن.) تۆڤ، تۆ، تۆم: *رووەکە گوڵدارەکان بە تۆو زۆر دەبن.*

**تیپ** (ن.) ١- کۆمەڵ، دەستە، گرۆپ: *تیپەکەمان یەکەمی پاڵەوانییەکە بوو.* ٢- پیت، دانە دانەی ئەلفوبێ.

**تیرە** (ن.) بەشەك لە هۆز، تایەفە، عەشیرەت، خێڵ: *تەرخانی تیرەیەکی هۆزی جافە.*

**تیرمەه** (ن.) بڕوانە: تەموز.

**تیشك** (ن.) تیرۆژك، تیرۆژ، تیرێژ: تیشکی خۆر لە نیوەڕۆیان بە راستی دێتە خوارەوە.

**تیمارکردن** (چ.) دەرمانکردن، چارەسەرکردن: نەخۆشەکەیان زۆر بە باشی تیمارکرد.

**تێبینی** (ن.) ئاقڕ، سەرنج، ئاوڕ: *تێبینم کرد، کە خۆیان لە قەرەی باسەکەدا.*

**تێپەڕبوون** (چ.) دەربازبوون، بۆرین، ئاودیوبوون، ڕەتبوون، تێپەڕین: *ئەوان دوێنێ بەم گوندە تێپەڕ بوون.*

**تێدابوون** (چ.) لەناودابوون، لەنێودابوون، دناڤدابوون: *لەناو یارییەکەدا بووین، کە مات و ماوارەکەیان کرد.*

**تێر** (ئان.) ١- پێچەوانەی برسی: *مرۆڤ ژ خوارنا منگڤینی تێرنابیت.* ٢- تەسەل، تەواو، تۆخ:

*تابلۆکەی بە ڕەنگی تێر نەخشاند.*

**تێری تێژ** (ئان.) زۆرو پڕ: *هەندی خوارد تێری تژ بوو.*

**تێز** (ن.) ١- کونی لای چەخماخی تفەنگ: *تێزی تفەنگەکە گەورەبوو.* ٢- پەلە، لەز: *بە تێز هات.*

**تێشت** (ن.) نانی بەیانی: من تێشت خارییە.

**تێقە** (ئاک.) لەناودا.

**تێکۆشان** (چ.) هەوڵدان، تەقەلاکردن، کۆششکردن، خەباتکرن: سەرکەوتن لە تێکۆشان دایە.

**تێکەلاو** (ن.) تێکەل، ئاوێتە، لێکدراو: ئەو قوتابخانە سەرەتاییە تێکەلاوە.

**تێکەلاو کراو** (ئان.) تێکەلکری، ئاوێتەکراو، لێکدراو.

**تێکچوون** (چ.) ١- ئالۆز بوون، گرژ بوون، پشێوی. *ڕەوشا ساخلەمیا وی تێکچوو.* ٢- شکان، لەکارکەوتن: *تێکچوونی ئۆتۆمبێلەکەی مۆی نەهاتنێتی.*

**تێکدان** (چ.) ١- وێرانکرن، کافلکرن، خاپوورکردن، لەبەینبردن: *گوندێ مە لسەر دەستێ ڕژێما بەعس هاتە تێکدان.* ٢- تێکەلاوکردن، تێکفەدان، تێکەلکرن: چایەکەی *تێکداو خواردییەوە.* ٣- شێواندن: *تۆ کارەکەی ئێمەت تێکدا.*

**تێکردن** (چ.) ١- کردنی شتەک بۆ ناوشتەکی تر: *تارا خەریکی برنج تێکردنە.* ٢- درۆکردن، پێوەنان: *ئاگات لێبێ زۆر بڕوای پێ نەکەیت تێ دەکات.*

**تێهەڵدان** (چ.) ١- هافێتن، فڕەدان، هاوێشتن. ٢- دەرکردن: *نەهێشت دانیشێ تێیهەڵدا.* ٣- لێدان: *بە شەق تێیان هەڵدا.*

**جا** (ئام.) دەسا، ئەوە، ئیتر، ئەوجا، ئەمجا، کەواتە، کەوابوو، ئەڤجا: *جا من نایەم، بزانم چی دەکەن؟*

**جـــادە** (ن.) شـەقام، ڕێگا: *لـە کـاتی پەڕینەوەتـدا لـە جـادە بەسـەر هێڵەکانی پەڕینەوەدا بڕۆ.*

**جار** (ن.) کـەڕەت، گـەڕ، کـات، هـەل: *ئـەو هـەتا نووکـە گەلـەك جاران هاتیە مالا مە.*

**جاران** (ئان.) وەختـێ خۆ، لەپێشـوو، کاتی ڕابردوو: *جاران ئەو کاتانـە بەفرەکی ئەستوور دەباری.*

**جارەکا دی** (ئاك.) گاڤـەکا دی، هەلـەکا دی: *جارەکا دی بزڤرِم دێ هێمە نك وە.*

**جارجـــار** (ئـاك.) جاروبـار، ناوەنـاوە، جاریەجار، جارجارە، ماوەماوە، بـە هەڵکـەوت، جـار نـا جـار، بەڕێکـەوت، بـەپێی پێویسـت: *جارجار سەرمان لێدەدا.*

**جاروبار** (ئاك.) بڕوانە: **جارجار**

**جارێۆتـــەر** (ئـاك.) جـارەکی دیکـە، جارەکـــا دی: *بڕیـــاری داوە جارێۆتەر یاری بە ئاگر نەکات.*

**جـــارێ** (ئـاك.) ١- جـارەك، یـەکجار: *توخودێ جارەکێ وەرە ماڵمـان.* ٢- هێشـــتا، ئێســـتا: *جـــارێ نـەهاتووە، بـەڵام زۆری پێنـاچـێ دەکات.*

**جـــــاڕدان** (ن.) ئاگاداركردنـــــەوە، بانگراهێشـــــتن، راگەیانـــــدن: *جاڕدانەكـــەی ئاســـایش بـــۆ هۆشیاربوونەوەی خەڵكی بوو لە كاری بەد.*

**جاڕز** (ئان.) وەڕەز، بێـزار: *زۆر قسەت كرد منت جاڕز كرد.*

**جاڵجاڵۆكـــــە** (ن.) داپیرۆچـــــكە، تەڤنپیرك، دام داپیرۆكـە، كاكڵە موشـــان، پیرۆشـــك: *تـــەونی جاڵجاڵۆكە تەنكە.*

**جـــام** (ن.) ١– قـــاپ، تـــاس، دەفـــری بچووكی كانزایی یان شووشەیی: *جامـــە ئـــاوەكم بـــدێ.* ٢– شووشەی ئاوێنە: *خۆی لە جامی پەنجەرەكە دیتەوە.* ٣– كـاس: *یانەكـــەمان جـــامی خولەكـــەی بەدەســـتهێنا.* ٤– شووشـــەی پەنجـەرە: *جـامێ پەنجـەرا مـە گەلەك پاقژە.*

**جـامێر** (ن.) جوامێر، خاس، خۆشمرۆڤ، ئـــازا: *مرۆڤـــی جـــوامێر خۆشەویستە.*

**جان** (ئـان.) ١– دەلال، رەنـد، شـۆخ، بەدەو، خشۆك، زیبا، قەشـەنگ، جوان، خنجیلانـە: *مـن بووكـەكا جان كری.* ٢– ناوە بۆ مێیینە.

جانتا

**جانتـــا** (ن.) بـاوڵی، بـاول، چـەمەدان، سندوقەكی دەسكدارە كەلوپـەلی تێدەنـــدرێ‌و بـــە دەســـت هەڵـــدەگیرێت: *جانتاكـــەم هەلگرت.*

**جەباری** (ن.) هـۆزێكی كوردی شـاری كەركوكە.

**جەربـەزە** (ئـان.) ئـازا، دلێـر: *ئـازاد منداڵەكی جەربەزەیە.*

**جەرگ** (ن.) جگـەر، ئەندامـەكی لەشـی مرۆڤ و گیانەوەرە.

**جەژن** (ن.) جەشـن، جێـژن، بۆنـەیـەكی خـــۆش، رۆژی خۆشـــیو

ئاهەنگگێران: *نەورۆز بۆنەیەکی خۆشەو جەژنی نەتەوەییمانە.*

جەلالی (ن.) عەشیرەتەکی باکووری کوردستانن: *جەلالی خێڵەکی ناودارن.*

جەماوەر (ن.) کۆمەڵ، خەڵك، پرانیا خەلکێ، حەشامات: *تا جەماوەر پشتوپەنا بێ سەرکەوتن مسۆگەرە.*

جەنەو (ئاك.) لە نوێ، ژ نۆڤە: جەنەو با دەست بەکار بین.

جەنگ (ن.) شەڕ، هەرلو لێکدان: *باشووری کوردستان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بە عێراقەوە لکێنرا.*

جەنگاوەر (ن.) شەڕکەر، سەرباز: *براکەم جەنگاوەرەکی ئازا بوو.*

جەو (ن.) جۆ، جۆرە دانەوێڵەیەکە. لە جۆ نانی جۆ دروست دەکرێت، بۆ ئەو کەسانە بە سوودە، کە دووچاری نەخۆشی شەکرە بوون.

جەهەننەم (ن.) دۆزەخ، دۆژە: لە ئایینی ئیسلامدا بەهەشت و دۆزەخ هەیە، هەر کەسێکی کاری چاك بکات دەچێتە بەهەشت (جەننەت) هەر کەسێکیش بەدکار بێت دەچێتە دۆزەخ (جەهەننەم).

جریدبازی (ن.) جریتبازی، جریدانێ، یاریو غار کردن بە ئەسپ: یاری جریدبازی لەم ئاهەنگەدا ساز دەکرێ.

جریوە (ن.) ١- ویچە ویچ، جیکەجیك، دەنگی مەل: *جریوەی باڵندە چەند خۆشە.*

جڤاك (ن.) کۆمەڵ: *جڤاکا کوردی جڤاکەکا پێشکەفتییە.*

جگە (ئام.) ژبلی، بێجگە، جیا: جگە لە من هەموویان چووبوون بۆ ئاهەنگەکە.

جگەر (ن.) بڕوانە: جەرگ

جل (ن.) ١- جلك، بەرگ، پۆشاك، جلوبەرگ: دەستەجلەکی تازەی بەبۆنەی نەورۆزەوە کڕیوە. ٢-

پارچەیەکی چنراوە شەوانی زستان لە پشتی (گا، کەر، ئێسترو ئەسپ) دەکرێت: *ئەسپەکە جل کە ئەوجا سواری بە.*

**جلدروو** (ن.) دروینکار، بەرگدروو.

**جلك** (ن.) بڕوانە: **جل**.

**جلوبەرگ**

**جلوبەرگ** (ن.) بڕوانە: **جل**.

**جموجۆڵ** (ن.) نەسرەوتن، لقلقین، دانەکاسان، هاتنو چوون، بزووتنەوەی زۆر: *لەم ڕۆژانەدا بازاڕ جموجۆڵی کەوتۆتێ.*

**جندی** (ئان.) ١- جوان، کەلەش، نازدار: *ئاسکەکی جندیم دیت.*
٢- باش، ڕێك، چاك.

**جوان** (ئان.) بڕوانە: **جان**

**جوانی** (ن.و.) خەملی، ڕازاوە: *جوانیا بەهارێ دەرکەڤت.*

**جودا** (ئان.) جوداهی، جیاواز، جیا: *بیروڕای من لەگەڵ تۆدا جودایە.*

**جوداهی** (ن.) جیاوازی: د ناڤبەرا هەردوو تیپێن ڕکابەر جوداهی چنە؟

**جودایی** (ئان.) بڕوانە: **جوداهی**

**جوگرافیا** (ن.) زانستەکە پەیوەندی بەزەوی و ئاسمان و هەرچی تیایاندایەو یان تێیاندا دەژیت، هەیە: *جوگرافیای کوردستان لە بەشی جوگرافیادا دەخوێندرێ.*

**جوغرد** (ن.) شوێنێکە قامیشەڵانو چڕ بێت، جهێ لەڤەن لێ هەبن: *کەروێشکەکە لە جوغردەکەدا خۆی شاردەوە.*

**جوڵان** (چ.) لڤین، بزوین، هەژان: *منداڵەکە هەردەم لە جوڵاندایە.*

**جومگە** (ن.) گەه، گێ، ئەو شوێنەی دوو ئێسك بەیەك دەگەن، گرێچك: *جومگەی ئانیشکی ژاندەکات.*

جۆ (ن.) بڕوانە: جەه.

جۆر (ن.) چەشن، تەرز، ڕەنگ، شێوە: *زۆر جۆر ترێمان هەیە.*

جۆر بە جۆر (ئان.) هەمەجۆر، ڕەنگاوڕەنگ، جۆراوجۆر، چەند جۆرەك، هەمەلایەن، هەمەچەشن، چەندڕەنگ: *چەند كەلوپەلەكی جۆربەجۆری بۆ بابەتەكە ئامادە كردووە.*

جۆراوجۆر (ئان.) بڕوانە: جۆر بەجۆر.

جۆڕ (ن.) جهۆر: *جۆڕی كەرەكە نوێیە.*

جۆگە (ن.) جۆگەلە، جۆگا: *ئاڤا جۆگێ گەلەكا زەلالە.*

جۆلانە

جۆلانە (ن.) جولاندك، هێزك، هێزۆك، گوریسی بەدارەوە كراو بۆ

جووجە

جووجە (ن.) جووجەڵە، باڵداری بچووك، جووچكە: *ئاگادار بە ئاو بەجووجەكان بدە.*

جووجەڵە (ن.) بڕوانە: جووجە.

جوولان (چ.) بڕوانە: جوڵان.

جووڵە (ن.) فزە، هەژان، لڤین، بزاڤ، بزووتن، تەكان: *ئەم دارە بە بایەكەوە دەجووڵێ.*

جوون (چ.) ١- جوین، جوتن: *دەبێت پاروو پێش قوتدان باش بجوورێ.* ٢- جوێن، جڤین، خەبەر، جوین، قسەی ناشیرین، كە بە یەكەك دەگوترێ: *كوڕم جوون بە كەس مەدە.*

لێنیشتن‌و خۆهەژاندن، جۆرە یارییەکی منداڵانەیە.

**جۆم** (ن.) ئاودڕ، کەندەك، کە ئاو دروستی کردبێ: *لە جۆمەکە پەڕیمەوە.*

**جە** (ن.) جێگە، شوێن، شوون، جێگا، جێ: *کوردستان جە وارێ کوردانە.*

**جەکێ مەزن** (ن.) عەردەکی مەزن، جەکی بەرفرە، جێگایەکی گەورە: *ڤێ خواندنگەهێ جەکێ مەزن بخۆ ڤەگرتییە.*

**جیابوونەوە** (چ.) دوورکەوتنەوە لە یەکتر، جودابوونەوە، جیاوازبوونەوە: کە گەیشتینەوە ئاو دێ لە یەك جیابووینەوە. بڕوانە: جوداهی.

**جیاواز** (ئان.) جودا، جیا: زیندەوەرەکان لەشێوەو ڕەنگ و قەبارەیاندا جیاوازن.

**جیڕ** (ئان.) گۆشتێك نەجووڕێت دەڵێن: جیڕە، چڕە.

**جیکجیك** (ن.) دەنگی مەلو جووچکە، جیو جیو، دەنگی جووجەڵە: جووجەکان جیك جیکیان خۆشە.

**جیهان** (ن.) ١- دنیا، گێتی، عالەم: *هەموو جیهان سەیری یارییەکانی مۆندیال دەکەن.* ٢- ناوە بۆ مێینە: *جیهان قوتابییەکی لێهاتووە.*

**جیهانگیری** (ن.) دنیاگەری، بە جیهانی بوون: *باملۆزی بە جیهانیبوون هەڵیکردووە.*

**جیهانی** (ئان.) عالەمی، گێتی: *تەپا پێی یارییەکا جیهانییە.*

**جیوجیو** (ن.) بڕوانە: **جیکجیك.**

**جێگا** (ن.) بڕوانە: **جە.**

**جێگە** (ن.) بڕوانە: **جێ.**

**جێگیر** (ئان.) بنەجە، ئۆقرەگرتوو: *ڕەوەندەکان لە یەك شوێن جێگیر نین.*

**جێگیرکردن** (چ.) سەلماندن، چەسپاندن: کورد بە بەڵگە جێگیریان کردووە کەرکوك کوردستانییە.

**جێناڤ** (ن.) جێناو، ڕاناو: ئەو وشەیە لە ڕستەدا دەتوانێت جێگەی ناو بگرێتەوە: من، ئێمە، تۆ، ئێوە، ئەڤ، خۆم...

چ (ج.) چی : ئێوه به چ زەوی دەکێلن؟

چا (ن.) ١– چای، گەڵای ڕووەکی چایه و جۆره خواردنەوەیەکی گشتییه: *چایەکی خۆشی دامێ.*
(ئان.) ٢– باش، چاك: *چا هات.*

چاپکاری (ن.) چاپەمەنی، ئەو شتانەی، که له چاپ دەردەچن: *لەم ڕۆژانەدا چاپکاری بەرەو پێش چووه.*

چاپووك (ئان.) توندوتۆڵ، چوست، زیرەك، چەلەنگ، گورج و گۆڵ: *ئەو زۆر چاپووکه*

چاتر (ئان.) چاکتر، چێتر، باشتر: *چاتر وایه زوو بخەوی.*

چاخ (ن.) سەردەم، تاف، کات، زەمان: *ئێمه ئێستا له چاخی نوێو ئینتەرنێت و جیهانگیری دەژین.*

چادر (ن.) ١– خیوەت، خێمه، ڕەشماڵ، تاوڵ: *ئاوارەکان هێشتا لەژێر چادردا دەژین.* ٢– پەرده، ئەو بەرگەی بەسەر ئۆتۆمبێل دادەدرێت. ٣– ئەو پارچه قوماشەی ژن سەرتاپای لەشی پێ دادەپۆشێت.

**چار** (ن.) ١– دەرەتان، چارەنووس، چارەسەری: *چار چییە ئەگەر وابێ؟* ٢– رووبەندی ژن، پەچە، پێچە: *دەموچاوی خۆی بە چار (چارشێو) داپۆشیبوو.* (ئان.) ٣– ژمارە چوار، چوار: *ئەنکم چار چیرۆکی خۆشی بۆ گێرامەوە.*

**چارەسەرکرن** (چ.) ١– رزگارکردن: *بریندارەکەیان زوو چارەسەرکرد.* ٢– کۆتایی پێهێنان، چارەسەرکردن: *کێشەکە چارەسەرکرنەکی بە پەلەی دەوێ.*

**چارەسەری** (ن.) رزگاری، کۆتایی: *ئەو چارەسەرییەی، کە باسی دەکەی لە جێی خۆیەتی.*

**چارچۆپ** (ن.) ١– چوارچێوە، چوار دەور، دەوروبەر، چارچۆڤە: *ئایا وێنەی خۆت لە چارچۆپە گرتووە؟* ٢– ئەو دارەیە، کە بەفری سەر خانووی پێ رادەمالرێت.

**چارۆکەدار** (ن.) شتەك چارۆکی بەسەردا درابێ: *کەشتی چارۆکەدار بەهۆی باوە دەروات.*

**چاڤ** (ن.) چاو، دیدە: *چاڤێ وی کەلەکێ سۆر بی!*

**چاڤدێر** (ئان.) چاودێر: *لە هەر پۆلێکی قوتابخانەدا چاڤدێرەك هەیە.*

**چاڤدێری** (ن.) چاودێری: *چاڤدێری زیرەکی دڤێت.*

**چاڤدێریکرن** (چ.) چاودێریکردن: *چاڤدێریکردنی پەککەوتەکان ئەرکە.*

**چاك** (ئان.) باش، قەنج: *ئەم قوتابییە لە وانەکانی چاکە.* ٢– بەشی خوارەوەی کراسی ژنانە.

**چاکە** (ن.) باشی، قەنجی: *چاکە لە خراپە باشترە.*

**چاکی** (ن.) باشی، قەنجی: *باپیران گۆتییە چاکی بکەو ب ئاڤێدا بەردە.*

**چاگە** (ئاك.) لەوێ، ئەوێ، ئەوێندەرێ: *چاگە سێ رۆژ مامەوە.*

**چالاك** (ئان.) چاپوك، چوست، بەكار، چەلەنگ: *منداڵی چالاك خۆشەویستە.*

**چالاكی** (ن.) چەلەنگی، بزاڤ، چوستی، جموجۆڵ: *بە چالاكییەكانی خۆمان ئاینده دەنەخشێنین.*

**چالاو** (ن.) چالاڤ، گەراڤ: *باڵندەكان لەسەر چالاوەكەدا ئاو دەخۆنەوە.*

**چالگە** (ن.) بڕوانە چالاو.

**چاندن** (چ.) رواندن، چەقاندن: *چاندن لە هەڵكەندن باشترە.*

**چاو** (ن.) بڕوانە چاڤ.

**چاو ئەندازە** (ن.) دیمەنێكی دڵڕفێن، دیمەن، چاوگە، بەرچاو: *تاڤگەی سۆلاڤ تاڤگەیەكی چاو ئەندازە.*

**چاوەڕوانی** (ن.) چاوەنۆڕ، چاڤەڕێ، كەسێك بەتەمای شتێك بێت و چاوە چاوی بۆ بكا: *چاوەڕوانی ژیانێكی خۆشم.*

**چاوەڕێكردن** (چ.) چاولەڕێگابوون، چاوەڕوانی كردن: *چاوەڕێكردن ناخۆشە.*

**چاوپاك** (ئان.) چاوێنی ناكا، چاڤ پاقژ، چاوی كەسێك كە بە خراپە تەماشای شتی خەڵكی دیكە نەكا، دژی چاو پیس: *چاوم پاكە چاوێنی ناكەم.*

**چاوپێكەوتن** (چ.) چاڤ پێكەڤتن، دیدار لەگەڵ كردن، بینین، دیتن: *چوون بۆ دیدەنی كەسێك چاوپێكەوتنە.*

**چاوتێبڕین** (چ.) ١- لێ ورد بوونەوە، لێ مۆڕ بوونەوە، سەیر كردن، مێز كرن: *بە تەواوی چاوی تێبڕیبووم.* ٢- تەماع تێكردن، مرخ لێخۆشكردن، بە تەمای داگیر كردن: *دوژمنان چاویان بڕیوەتە سامانی وڵاتەكەمان.*

**چاوچنۆك** (ئان.) چاو برسی، بە ئیرەیی، بە تەماع، قرچۆك، رەزیل: *چاوچنۆكی باش نییە.*

**چاودێریكردن** (چ.) لبەردانان، زێرەڤانی كرن: *چاودێریكردنی كۆمەڵایەتی پێویستە.*

**چــاوگ** (ن.) بەشـێکە لـە بەشـەکانی ئاخاوتن وەك: نووسین، نوسـتن، رۆیشتن، کردن،.....

**چاولێکنان** (چ.) ١-چاو داخستن، چاو چــوقان، چــاڤ نقانــدن، چــاو قوچـاندن: *دایکەکـە منداڵەکـەی بـە چـاو لێکنانـەوە لـە بـاوەش دانا.* ٢- مردن.

**چاویلکە** (ن.) عەینەك، چـاوك، چـاڤك، بەرچاڤك: *چاویلکەی نەنکم کۆن بووە.*

**چەپ** (ن.) لای بەرامبـەر راسـت: *هـۆڵی تاقیکردنەوەکان لە دەستەچەپی ژووری بەڕێوەبەرە.*

**چەپڵە** (ن.) دەست لێکدان، چـەپرە، دەسـت قـوتین: *منداڵــەکان چەپڵەیان بۆ من لێدا.*

**چــەپڵەڕێزان** (ن.): چـەپڵە لێـدانی بەکۆمەڵ: *وشیار بەچەپڵە ڕێـزان پێشوازی لێکرا.*

**چەتر** (ن.) سـەیوان، سهوان: *رۆژانـی باران چەتر لەگەڵ خـۆم دەبەمـە قوتابخانە.*

چەخماخە

**چـــەخماخە** (ن.) بریقـەی برووسـکە، تـرووسـکەی برووسـکە: *بـەهاران هەور لە چەخماخە دەدات.*

**چەخماخساز** (ئان.) وەستای خەنجەرو چــەك: *وەســـتا رەجـــەب چەخماخسازێکی بەناوبانگ بوو.*

**چــەراندن** (چ.) لەوەڕانـدن: *مـەرکیبا پەزێن خۆل زۆزانا چەراندن.*

**چەرخ** (ن.) ١- تایەی عارەبانەی کۆن، چـەرخە. ٢- رۆژگـار، زەمانـە: *ئـاخ لـە دەسـت ئـەم چـەرخە نارێکە.* ٣- سەد ساڵ، سـەدە: *نـالی لـە چـەرخی نۆزدەهەمـدا ژیـاوە.* ٤- ئامرازێکـە چـەقۆو شتی دیکـەی پـێ تیـژ دەکرێت: *چەقۆیەکەی لە چەرخ داوە.* ٥- ئــامرازی ئــاگر پێکــردن: *تەباخەکەی بە چەرخ داگیرساند.*

٦- ئەو ئامرازەی لەسەر بیر دادەنرێ بۆ هەڵکێشانی ئاو.

**چەرخاندن** (چ.) سووڕان: *چەند جارێك بە دەروی یاریگاکەوە چەرخەی لێدا.*

**چەرمە** (ئان.) ١- سپی، چەرمی: *سەگە چەرمەکە لەگەڵ رانە مەڕەکە بەرە بۆ لەوەڕ.* ٢- لەڕو لاواز: *مانگایەکانت زۆر چەرمەیە.*

چەروان

**چەروان** (ن.) لەوەڕگا: *د بهارێدا چەروان شین دبیت*

**چەسپ** (ن.) ئەو ماددەیەی شتێك بە شتێکی دییەوە دەنووسێنێ، سرێش: *وێنەکەم بە چەسپ قایم کردووە.*

**چەسپاو** (ئان.) خۆجە، جەوی، خۆگرتوو، راوەستاو: *هەموو باڵندەکان پلەی گەرمییان چەسپاوە.*

**چەشە** (ن.) ئەو نانو گۆشتەی لەسەر تەڵە دابندرێت بۆ راوکردنی مەلو ئاژەڵ.

**چەشەکرن** (چ.) ١- دەڤشرین کرن، چێژکردن. ٢- راهێنان، وەکو تاژی چەشەکردن بۆ راو.

**چەفتە** (ن.) ١- دەرسۆك، دەسرۆك، چەفیە، رەفتە: *چەفتەیەکی لەسەر ئاڵاندووە.* ٢- بنە مێو، کە لە لکەدار خۆی دەئاڵێنێ.

**چەق** (ن.) بنگەه، چینگ، ناوەڕاست، ناڤەند: *بازاڕە نوێیەکەی هەولێر لە چەقی شاردایە.*

**چەقەڵ** (ن.) تۆڕی، توورك، توورگ، تدیری: *چەقەڵەکە مریشکەکەی خوارد.*

**چەقۆ** (ن.) چەقو، کێرك، کێرد: *سێوەکەم بە چەقۆ لەتلەتکرد.*

**چەك** (ن.) ١- تفەنگ، خەنجەر، دەمانچەو.....: *ئەو چەكێ بملێ ویڤە برنۆ بوو.* ٢- پارە، ئەو كاغەزەی كە لە بانكەوە بڕە پارەكەی لە بەرامبەردا دانراوە، كاغەزی حەوالە: *باوكم چەكەكەی بردە بانك بۆ پارە وەرگرتن.* ٣- خشلی زێڕ: *چەكێن بویكا مە گەلەك جوانن.*

**چەكدار** (ئان.) چەكهەلگر، بە چەك، سەرباز، پێشمەرگە: *پێشمەرگە چەكدارەكی بەناوبانگە.*

**چەكداری** (ن.) چەكهەلگری: *چەكداری نایاسایی دیاردەكا خرابە.*

**چەكمە** (ن.) پێلاوەكی چەرمی لاسك درێژە، جزمە: پۆتینی درێژ تا ئەژنۆ: *چەكمە لە كاتی سەرماو قوڕو بەفرو باران لەپێ دەكرێت.*

**چەكهەلگرتن** (چ.) تفەنگ یا دەمانچە وەیا چەكی دی هەلگرتن، خۆئامادە كردن بۆ شەڕ: *لە پێناوی نیشتمانا چەك هەلدەگرین.*

**چەلەنگ** (ئان.) زیرەك، چالاك، چاپووك، بەكار، شۆخ و ڕێك: *شێروان كوڕەكی چەلەنگە.*

**چەم** (ن.) ١- چۆم، دارستانی قەراغ ئاو و رووبارەكان: *لەناو ئەو چەمەدا گیانداری كێوی زۆرە.* ٢- زەوی و زار: *چەمێ مە گەلەكێ ب خێرو بێرە.*

**چەماندن** (چ.) خوار كردنەوە، داهێنانەوە: *من ئەڤ تێلە چەماند.*

**چەماوە** (ئان.) چەمیای، خولاوە بوو: *بۆچی سەری هەر چەماوەیە.*

**چەمەبۆر** (ن.) كێلگەیەكی پیترۆڵە لە كەركوك.

**چەمچەماڵ** (ن.) قەزایەكە سەر بە پارێزگای كەركوكە.

**چەناگە** (ن.) چەنە، ئەرزینگ، چەه، بەشێكە لە روومەتت و كەوتۆتە ژێر دەمت.

**چەند** (ئام.) چقاس، چەندی، چەنێ: *بەفرل چەند جها بارییە؟*

**چەندین** (ئام.) زۆر، گەلەك: *لە ئەشكەوتی هەزار مێرد چەندین كەرستەی كۆن دۆزراونەوە.*

**چەنگ** (ن.) باڵ، دەست، لەپ: *ئەڤ زارۆكە ب چەنگا رێڤە دچیت.*

**چەنی** (ن.) ١– دەرزی دروومان: *چەنییەكە بێنە با كراسەكەم بدوورم.* ٢– لەگەڵ، پێكرا: *من چەنی تۆ دەچینە هەورامان.* ٣ – بۆچی، لەبەر چی: *چەنی وات كرد؟*

**چەهچەهە** (ن.) دەنگی باڵندە، دەنگی بولبول: *چەهچەهەی بولبول مەستی كردم.*

**چەو** (ن.) ١– شویشە بەرك، وردە بەرد، چەوت، چەقڵ، زیخ. ٢– چاو، چاڤ.

**چەوا** (ئام.) چۆن، كوو: *چەوا ئەڤ كار چێبە؟*

**چەواشە** (ئان.) ١– دژ، پێچەوانە: *راستییەكە چەواشە مەكە.* ٢– سەر لێ شێواو: *ئەسپەكە چەواشە بوو.*

**چەوان** (ئام.) چۆن، كو، چەوا، چاوان، چتوڤا، چاوا: *تو چەوان هاتی بۆ هەولێر؟*

**چەوت** (ئان.) ١– شاشی، هەڵە، خراپ، لار، خەلەت: لەم رستانە چەوتەكان راست بكەرەوە. ٢– چەو، وردكە بەرد، چەقل: ئەم كۆنكریتە چەوتەكی باشی تێكراوە.

**چەور** (ئان.) ئەگەر چێشتت لێناو رۆنت زۆر تێكرد، بەو خواردنە دەڵێن چێشتی چەور.

**چەوری** (ن.) چەڤری، چەورایی، دوونگو بەزوو پوون: *زۆر خواردنی چەوری خراپە.*

**چەوسێنەر** (ن.) داگیركەر، ستەمكار : *رژێمە یەك لە دوای یەكەكانی عێراق چەوسێنەر بوون.*

**چتوڤ** (ئام.) وتەی پرسیار لە چۆنیەتی شت: *كاكە چتوڤی؟ واتە چۆنی؟*

**چرا** (ن.) لەمپە، رۆناكی، گلۆپ، فانۆس، لالە: *لە كاتی نووستندا چرایەكە كزدەكەم.*

**چرک** (ئاو.) پیس، چڵك، قرێژ: *جلوبەرگم چرکن بووە.*

**چرمسین** (چ.) سیسبوون، چورچبوون: *داری باخەکان لەبەر بێ ئاوی چرمسین.*

**چرۆ** (ن.) بشکۆژ، خونچە، کروکە: *دارەکان تازە چرۆیان دەرکردووە.*

**چریکە** (ن.) دەنگی تیژی بەرز، چریکەچریك، چریکەی لە دوای یەك: *لە بەیانیان چۆلەکەکان چریکەیان دێت.*

**چڕ** (ئاو.) ١- لەپاڵ یەك، سفت، تێکڕا، ناڤئێکڕا: *دارو درەختەکانی ئەم دارستانە چڕن.* ٢- قایم، مکوم، توندوبەند، چیڕ، دژوار: *مرۆڤەکێ چڕە نامێتە رایێ.*

**چڕنۆك** (ن.) پەنج، نینۆکی تیژی باڵندەو هەندێك ئاژەڵ: *چڕنۆکێ بازکەلەك تیژن.* ٢- دەموچاو بریندار کردن، ڕنۆك: *دەموچاوی مەمووی چڕنۆکە.*

**چڕی** (ن.) بەیەکدا چوو، پڕی، دارستانی پڕ: *تا بەرەو خوار بچین چڕی دارستانەکە کەم دەبێتەوە.*

**چغ** (ن.) چخە، وشەیەکە بۆ دەرکردنی سەگ: *چغ چغ سەگەکە نەکەی پەلاماری کەوەکە بدەی.*

**چقلەگ** (ن.) چڵەك، چقل: *چقلەگ دارم شکاندووە.*

**چکۆڵە** (ئاو.) بچکۆڵە، گچکۆکە: *ئەوسا زۆر چکۆڵە بوو.*

**چلمێرانە** (ئاك.) ١- جوامێرانە: کوردستان جهێ چلمێرانە. ٢- ناڤێ دارەکێ ستویرە دانا بەر دەرکەهی بۆ پێڤەدان و گرتنێ: *دارێ چلمێرانە دارەکێ راست و ستویرە.*

چلوورە

**چلوورە** (ن.) ١- ئەو ئاوەی بە سەرما دەیبەستێت و بە گوێسەبانەوە

دەری ئەشـــکەفتدا شۆڕدەبێتەوە، گلیك، گلیزە: *لە زستانانـدا چـلوورە بـە گوێسەبانانەوە شۆڕ دەبێتەوە.*

٢- بەستەنی، دۆندرمە: *چلوورە خواردن بە هاوین خۆشە.*

**چڵك** (ن.) پیسایی، پیساتی، کرێژ، قرێژ، گەمار: *کراسی هەموو چڵك بوو.*

**چڵکن** (ئان.) بەقرێژ، پیس، پۆخڵ: *شەرمە مرۆ چڵکن بێت.*

**چڵم** (ن.) کلمیش، ناوی خەستی کەپوو، پیسایی ناو کەپوو: *دەبێت بە پەڕۆی تایبەت چڵم لە کەپووت پاك بکەیتەوە.*

**چڵمن** (ئان.) بە کەسێك دەگوترێت، کە چڵمی زۆر بێتە خوارەوە.

چنار

**چنار** (ن.) ناوی دارەکا قەد بەرزە: *بەژنا تە دار چنارە.*

**چناران** (ن.) گوندێکە لە دۆڵی خەلەکان: *چناران گوندەکی خنجیلانەیە.*

**چنراو** (ئان.) راچنی، تەنراو، رێستراو: *بلوزەکەم چنراوە.*

**چنگەڕنێ** (ن.) چنگە کرێ، چنگ لە زەوی گیرکردن بۆ سەرکەوتن لە لێژایی و هەوراز: *بە چنگەڕنێ سەرکەوتم.*

**چنین** (چ.) تەون، فەهاندن، راچنین: *کارگەی رستن و چنین لە هەولێر هەیە. چنینی مافوور دابێکی کوردەوارییە.*

**چوارچرا** (ن.): گۆڕەپانەکە لە مەهاباد: *لە گۆڕەپانی چوار چرادا کۆماری کوردستان جاڕدرا.*

**چوارگۆشە** (ن.) شێوەیەکی ئەندازەییە چوار لای وەك یەکەو یەکسانە: *ڕووبەری ماڵەکەمان سێ سەد مەتر چوارگۆشەیە.*

**چوار وەرزی ساڵ** (ن.) چوار کەژی ساڵ، بەهارو هاوین و پایزو

ئا ئە ب پ ت ج **چ** ح خ د ر ز ژ س ش ع غ ف ڤ ق ك گ ل م ن ھ و ی

زستان: *ئاووھەوای كوردستان چوار وەرزی ساڵ خۆشە.*

**چوارین** (ن.) چوار خشتەكی هۆنراوە، جۆرە شیعرەكە لە چوار نیو دێر- دوویەیت- پێكدێت: *چوارینەكانی بابا تاھیری ھەمەدانی كۆنترین چوارینەی كوردین.*

**چونكە** (ئام.) چونكی، لەبەر ئەوەی، چونكو: *تۆ پێدەگەیت، چونكە خۆت ماندوو دەكەیت.*

**چونكی** (ئام.) بڕوانە: چونكە.

**چوون** (چ.) ١- ڕۆیشتن: *كوڕەكە بە پەلە چوو.* ٢- وەك، یەكسان، هاوتا، هاوشان: *ھەردوو قوتابی لە زیرەكیدا چوون یەكن.*

**چوونەوەیەك** (چ.) گرژبوون، چوونەیەك، دناڤ ئێكداچوون، ھەڵقرچان، كەمبوون.

**چۆرتم** (ن.) گیرو گرفت دروستكردن، ئاستەنگ: *كاكە چیتر چۆرتم بۆ خەڵكی دروست مەكە.*

**چۆڕاو** (ن.) دێراندن، دڵۆپە: *كوندەكە چۆڕەی لێوە دێ.*

**چۆك** (ن.) ئەژنۆ، زرانی: *ھەر مرۆڤەكێ دوو چۆك ھەنە.*

**چۆلەكە** (ن.) كێشكە، پاساری، كیژۆڵە، چویچك، تێشك: *خۆتان لە چۆلەكە دووربگرن نەكە توشی پەسیوی باڵندە بن.*

**چۆڵ** (ئان.) شوێنێكە كە ئاوەدانی تێدا نەبێ، بەیار: *من جھێن چۆڵێو بەیار نەڤێن.*

**چۆن** (ئام.) چەوا، كو، چلۆن: *چۆن سنوورت بڕی؟*

**چۆنیەك** (ئان.) وەكیەك، وەكھەڤ، پێكچووی: *دەبێ ھەموومان چۆنیەك تێبكۆشین.* ئەم دوو قەڵەمە چونیەكن.

**چیا**

**چیا** (ن.) ١- شاخ، كێو، كەژ: *چیاكانی كوردستان بڵندو سەركەشن.* ٢- ناوە بۆ نێرو مێ.

**چیدی** (ئاك.) چیتر، چیدیکە:: *چیدی دوژمن بۆی ناچێتە سەر.*

**چیرۆك** (ن.) سەرگوزشتە، هەکایەت، حکایەت، سەربردە: *باپیرەگیان چیرۆکێکی دیمان بۆ بگێرەوە.*

**چیچـــك** (ن.) چـۆلەکە، کێشــکە، پاساری: *دەنگێ چیچکان گەلەك بێ خۆشە.*

**چیمەن** (ن.) ١- شوێنی تەڕو بە ئاو و سەوزە: *گەشتێکمان لەناو ئەو چیمەنەدا کرد.* ٢- فریز، ئەو گیایەی لەناو باخچەو پارکەکاندا دەبینـــرێ: *پارکەکـــە بـــە چـــیمەنێکی جـــوان رووپـــۆش کراوە.* ٣- نـاوە بـۆ مێینـە. ٤- ناوی گوندێکی سەر بە پارێزگای کەرکوکە.

**چیمەنتۆ** (ن.) کۆنکریت، تێکەڵەیەکـە لـە خـۆڵو بـەرد لـە کارگـە دروســـتدەکرێت، کەرســـتەکێ ئاڤاهییە: *کارگەی چیمەنتۆ لە سەرچـــنارو تاســـلووجە دامەزراوە.*

**چین** (ن.) ١- تەخە، توێ، لا: *زەوی لە چەند چینێك پێکهاتووە.* ٢- گروپ، کۆمەڵەیەك، توێژ: *چینی مـەزار پێویسـتی بـە هاوکـاری هەیـە.* ٣- چـین: سـین، نـاوی وڵاتێکی گەورەیـە لـە کیشـوەری ئاسـیا: *ژمـارەی دانیشـتووانی چین لە ملیارەکی زیاترە.*

**چـینەکردن** (چ.) دانـە هەڵگرتنـەوەی باڵندانـە لـە نێـو لمو خۆڵـدا: *مریشکەکە لە نێو خۆڵی کۆڵان چینە دەکات.*

**چێژێ** (ئاك.) ماوەیەك، بێهنەك: *چێژێ لنك تە دمینم.*

**چێشــت** (ن.) خـوارن، تێشـت، ئـاش، شـیو: *نیوەڕۆیـان زۆر چێشـت دەخۆم.*

**چــــێکردن** (چ.) دروســـتکردن، دامەزراندن: *من کەپرەك بۆ خۆ چێکر.*

**چـێکردنەڤە** (چ.) ئەگـەر شـتێك شـکا بـــوو، چـــاکی بکەیتـــەوە چێکردنەڤەی پێدەڵێن.

چێکرن (چ.) بڕوانە چێکردن

چێڵ (ن.) مانگا، چێل، چێر: چێڵ *ئاژەڵێکی بەسوودە.*

چێنەر (ئان.) رەزڤان، ئەو کەسەی دارو درەخت و شینایی دەچێنێت.

حاجیلـه (ن.) ١- گوڵـەکی سپی نـاو زەردە: *حاجیلـە دەرمـانی لێ دروسـتدەکرێت.* ٢- گیایـەکی تاڵـە بـە زۆری لـە نـاو دەغڵـدا دەڕوێ.

حادیسـه (ن.) وشـەیەکی عەرەبییـە، ڕووداو، ڕوویـدان: *ڕەچـاوکردنی ڕێنماییەکانی هاتوچۆ حادیسـەی ئۆتۆمبێل کەمدەکاتەوە.*

حەپەسـان (چ.) واق وڕمـان، سـەر سـوڕمان، بـەهتین، مـاتبوون، سەرسـام بـوون: *لـە ترسـان حەپەسابوو.*

حەپین (چ.) حەپاندن، وەڕین، ڕەوین، حەپەحەپی سەگ: *شوانەکە لـە حـەپینی سـەگەکان بە خەبـەر هاتەوە.*

حەز (ن.) ویسـت، ئـارەزوو، هـەوەس: حەزو ڤیانا مە گەلەکە.

حەزکردن (چ.) خواسـتن، بـەهیوابوون، ئارەزوو خواستن، ویسـتن: *حـەز کـردن شـتەکە و شـیان شـتەکی دی.*

حەسـانەوە (چ.) ڤەهوسـیان، بێهنڤەدان، پشوودان، بێندان: *لە پـاش مانـدوو بـوون حەسـانەوە پێویستە.*

**حەشاردان** (چ.) شاردنەوە، ڤەشاردن، مەلاسدان، پەنهانکردن، ونکردن بە ئەنقەست: *خۆ حەشاردان یارییەکی کۆنی کوردەوارییە.*

**حەفتانە** (ئاك.) هەفتانە، هەموو هەفتەیەك، لە حەوت رۆژ جارێك: *ئەم گۆڤارە حەفتانەیە.*

**حەلوا** (ن.) جۆرە خواردنێکە لە ئارد و رۆن و شەکر دروستدەکرێت: منداڵ حەزی لە خواردنی حەلوایە.

**حەوش** (ن.) حەسار، حەوشە، گۆرەپانی ناو ماڵ یان پێش ماڵ: *چەند بنە دارێك لە حەوشەکەی ماڵماندا هەیە.*

**حکومەت** (ن.) فەرمانڕەوایی، میری، دەسەلات: *ئێمە پشتگیری لە هەنگاوەکانی حکومەتی کوردستان دەکەین.*

**حوزەیران** (ن.) شەشەمین مانگی ساڵی زاینییە، جۆزەردان: *تاقیکردنەوەکانمان لە مانگی حوزەیران دەستپێدەکەن.*

**حیرفەت** (ن.) وشەیەکی عەرەبییە، هەر کەسێکی لە بوارێکدا شارەزایی پەیدا کردو لێهاتوویی نواند دەبێتە حیرفەتی ئەو کەسە، وەك ئاسنگەر، زێڕگەر، دارتاش و....

خاپاندن (چ.) دسەردابرن، فێڵلێکرن، فریــودان، خەڵەتانــدن، تــەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن: *ئەم نامێینە خاپاندن.*

خــاپوور (ئــان.) وێــران، کــاول: *ماتوونەتــە ســەر ولاتــەکی خاپوور.*

خــــاپوورکردن (چ.) وێرانکــــردن، کاولکردن: *چەندەها جار دنیاتی کورد خاپوور کران*

خاچــا ســــوور (ن.) رێکخراوەکــی ناحکومیی جیهانییە لە کاروباری زینــدانیان و دیلــەکانی جــەنگ دەکۆڵێتەوە: *رێکخراوی خاچی ســوور بارەگــەی لــە زۆربــەی ولاتــانی جیهاندا هەیە.*

خاریٚ (ئاك.) خواریٚ، خــوارەوە: *مــن ل گوندیٚ خاریٚ تو دیتی.*

خاڤ (ئان.) بێدەستوبرد، خاو، سست: *هنــدەك کــەس ب خــوە خــاڤ و سستن.*

خــاك (ن.) ١- گــڵ، خــۆڵ، ئــاخ: ٢- زەوی: *ئەم دەشتە خاکەکی بە پیتە.* ٣- زێد، ولات، نیشتمان، شــوێنی لــە دایکبــوون: *خــاکی باب و باپیرانمان بە هــەموو دنیا نادەم.*

**خاکە لێوە** (ن.) ناوی یەکەم مانگی سەری ساڵی کوردییە: *لە مانگی خاکەلێوەدا سەفەر دەکەم.*

**خاکماڵ** (ن.) خاکەناز، مەڕك: *بە خاکماڵەکە باخچەم چاکرد.*

**خاڵ** (ن.) ١- نوختە، نوقتە: *دوای هەموو رستەیەك دەبێت خاڵەك دابنرێت.* ٢- برای دایك: *خاڵم کوڕەکی ماوتەمەنی منی هەیە.* ٣- نیشانە، هێما: *خاڵەکی جوانی لەسەر روومەت هەیە.* ٤- دابەشکردنی بابەتەك بۆ چەند لقەك، دانە دانە: *لە ئەنجامی باسەکەمان دەگەینە ئەم خاڵانە.*

**خاڵۆزا** (ن.) زارۆکێت خاڵی، منداڵەکانی برای دایك، خارزا، خوارزا، خاڵزا: *ئازاد خاڵۆزای منە.*

**خاڵۆژن** (ن.) ژنخاڵ، ژنی خاڵ: *خاڵۆژنم مامۆستایە.*

**خامە** (ن.) بڕوانە: پێنووس.

**خامەبڕ** (ن.) قەڵەمبڕ، قەڵەم دادەر، نووککەر، قەڵەم تراش: هەر یەکە پێویستە *خامەبڕی خۆی هەبێت.*

**خامۆشی** (ن.) بێدەنگی، کپی، کزی: *بە بیستنی هەواڵەکە هەموو خامۆشی دایگرتن.*

**خان** (ن.) ١- وتەیەك بۆ گەورەیی، گەورە پیاو و ژن، نازناوی دەسەڵات: *کەریم خانی زەند چەند ساڵەك حوکمی ئێرانی کرد.* ٢- خانوو، ماڵ: *خانە کۆنەکەیان نەماوە، یەکەکی دیکەیان کڕیوە.* ٣- *لە کۆندا رێبوار خۆی و ولاخەکەی تێدا دەحەواندەوە.*

**خانەقینی** (ئان.) کەسەك خەڵکی شاری خانەقین بێت: *شەهید لەیلا قاسم کچەکی ئازای خانەقینی بوو.*

**خانەنشین** (ن.) کارکەنار، گردەنشین، هەر فەرمانبەرەك تەمەنی گەیشتە سەرووی شەست ساڵ

دەتوانێت هیچی دی کارنەکاتو بۆ خۆی خانەنشین بێتو مووچەیەکیشی بۆ ببڕدرێتەوە.

**خانزاد** (ن.) ١- خانەزاد، خانەزادە، لە خانان: *ماڵەکی خانزادن.* ٢- ناوە بۆ مێینە. ٣- ناوی ژنە دەسەڵاتدارەکی کوردستانە لە میرنشینی سۆران: *قەلاتی خانزاد وا لە بانەمانە.*

**خانگە** (ن.) ماڵ، خانوو: *خانگەکەمان لە کەرپووچ دروستکراوە.*

خانوو

**خانوو** (ن.) بڕوانە: **خانگە**.

**خانووبەرە** (ن.) ناڤمال، خانوو لەگەڵ کەلوپەلەکانی ناوی: *خانووبەرەیەکی خۆشیان هەیە.*

**خانی** (ن.) بڕوانە: **خانگە**، **خان**، **خانوو**.

**خاو** (ئان.) ١- سستو بێهێز، نەڕۆ: *چونکە خاوە لە ڕۆیشتن زوو ناگاتە جێ.* ٢- نەکوڵاو، نەبرژاو: *گۆشتەکە هێشتا خاوە.* ٣- نەڕێسراو، بەنی تەواو بانەدراو: *هێشتان خاوە، جوان بایدە.* ٤- خۆش نەکراو، چەرمی خۆش نەکراو: *چەرمی خاو دوای خۆشکردن بۆ زۆر پیشەسازی بەکار دەهێنرێت.* ٥- کەرستە سەرەتاییەکان، بنەما: *کارگەکە لە شوێنێکی باشە، چونکە کەرستەی خاوی زوو پێدەگات.* ٦- (ن.) جۆرە گیایەکی بۆن خۆشە.

**خاوەن** (ن.) خودان: *من خاوەنی ئەم زەویانەم.*

**خاوەندارییەتی** (ن.) موڵکدارییەتی، بەخاوەن بوون: *خاوەندارییەتی مافی هەموو مرۆڤەکە.*

**خاووخێزان** (ن.) ئەندامێن ماڵێ، ئەندامێن فامیلێ، ئەندامێن

خێزانیٚ، مالٚو مندالٚ: *برام خاوەن خاوخێزانە.*

**خاوێن** (ئان.) پاکژ، بژوین، تەمین، پاک، پاقژ: *هەمیشە دەستەسرەکەم خاوێنە.*

**خاوێنکردنەوە** (چ.) پاکژکردنەوە، پاکردنەوە، پاقژکرنەڤە: *خاوێنکردنەوەی پۆلەکە لە ئەستۆی ئێمەشدایە.*

**خاوێنتر** (ئان.) پاکژتر، پاقژتر، پاکتر: *من لە تۆ خاوێنترم.*

**خاوێنترین** (ئان.) پاکژترین، پاقژترین، پاکترین: *ئەو خاوێنترین قوتابییە لە قوتابخانەکەمان.*

**خاوێنکراو** (ئان.) پاکژ کراو، پاکژ کری: *ئەم ژوورە خاوێنکراوە.*

**خاوێنکرن** (چ.) پاقژکرن، پاکژکرن، پاککرن: *خاوێنکرنا خاندنگەهێ شۆلێ مە هەمیایە.*

**خاوێنی** (ن.) پاکژی: *خاوێنی لە باوەڕەوەیە.*

**خایاندن** (چ.) پێچوون، کات پێچوون: *خولی زمانی کوردی دوو مانگی خایاند.*

**خەبات** (ن.) ١- کۆشش، تێکۆشان، هەوڵ: *لە پێناو سەربەخۆیی کوردستان هەموومان لە سەنگەری خەباتین.* ٢- ناوی ڕۆژنامەیەکی کوردییە لە باشووری کوردستان دەردەچێت: *خەبات ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیە.* ٣- ناوی شارۆچکەیە: *خەبات لەسەر ڕێگای مووسڵ.* ٤- ناوە بۆ نێرو مێ.

**خەباتکردن** (چ.) خەباتکرن، تێکۆشان، هەوڵدان، بەرگریکردن، خەبتان، خەبتین، جەنگین.

**خەباتگە** (ن.) جهێ خەباتێ، مەیدانا خەباتێ، شوێنی خەباتکردن.

خەباتی چەکدارانە (ن.) پێشمەرگایەتی، خەبات بە شەڕ:

*کورد خەباتی چەکدارانەی لە پێناو مافەکانیدا بە ڕەوا زانیوە.*

**خەبەر** (ن.) ١- جنێو، جوێن: *خەبەردان کاری مرۆڤی باش نییە. زارۆکێ خەبەر بێژ کەسێ نەڤێت.* ٢- وشەیەکی عەرەبییەو واتای هەواڵ دەبەخشێت.

**خەبتین** (چ.) خەباتکردن، تێکۆشان: *ئەم بۆ ئازادییا وەلاتی دخەبتین.*

**خەتا** (ن.) گوناه، گونەه، تاوان، سووچ: *بێ خەتا کەس لۆمەی ناکات.*

**خەتیرا سەرهلدانێ** (ن.) چەخماخەی ڕاپەڕین: *خەتیرا سەرهلدانێ ل ڕانیە دەست پێکر.*

**خەرجی** (ن.) مەزاخ، پارەی ڕۆژانە، مەسرەفی ڕۆژانە: *قوتابی پێدڤی خەرجییا ڕۆژانەیە.*

**خەریك** سەرقاڵ، مەشغوڵ، بە کارەوە مژوڵ بوون: *کە ئەو هات خەریکی نووسینی نامەیەك بووم.*

**خەزا** (ن.) غەزا، جەنگەکی پیرۆز: *خەزا کردن لە پێناو نیشتماندا پیرۆزە.*

**خەزاڵ** (ن.) ئاسك، مامز، غەزال: *خەزال ئاژەڵەکی گەلەك جوانە.*

**خەزان** (ن.) هەڵوەرین، پەلك لێبوونەوە، وەرزی پایز: *وەرزی خەزان بەسەرچوو.*

**خەزانی** (ن.) هەژاری، نەبوونی: *خەزانی دەردەکی گرانە.*

**خەزایی** (ن.) غەزایی، جۆرە مەلەکە: *خەزایی کلۆ خۆرە.*

**خەست** (ئان.) تیر، پەیت، توند: *ماستاوی خەست و سارد لە نیوەڕۆی هاوینان بەتامە.*

**خەستەخانە** (ن.) نەخۆشخانە، خەستێ: *پزیشك لە خەستەخانە کاردەکات.*

**خەسیەت** (ن.) ساخلەت، سەخلەت، خەسڵەت.

**خەلەسوورکردن** (چ.) دەخل پاکژ کرن ژ کایێ، شەنە کردنی دەغڵ: *سەپانەکە لەخەلەسوورکردندایە*

**خـەلیا** خولیـا، شـەیدا، مـەراق: *مـن خـەلیای خوێندنـەوەی چـیرۆکی کورتم.*

**خـەلات** (ن.) ١- پاداشـت، دیـاری: *بـەهۆی یەکـەم بوونیـەوە خەلاتـەکیان پـێ بەخشـی.* ٢- *ناوە بۆ نێرو مێ.*

**خـەلاتکردن** (چ.) دیـاری پێـدان، پاداشـتکردن: *مامۆسـتا لـە خـەلاتکردنی قوتابییەکانـدا بەشداریکرد.*

**خـەڵك** (ن.) جـەماوەر، پرایـی مرۆڤەکان،عـەوام: *د ئامەنکێـدا گەلەك خەڵك ئامادە ببوون.*

**خەڵووز** (ن.) رەژووی، رەژوو، زوخـاڵ: چای بە خەڵوز تامی خۆشە.

**خەڵووزی بەردین** (ن.) رەژی بـەردین، زوخـاڵی بـەردین بـۆ سـووتان و پیشەسـازی بـەکار دێـت: *شـەمەندەفەری جـاران بـە خەڵووزی بەردین کاریدەکرد.*

**خـەمڵ** (ئـان.) جـوان، رازاوە، رەوش: *کوردستان بخەملێ و خۆشە.*

**خەملانـدن** (چ.) ١- رازاندنـەوە، جـوانکردن: *بووکەکـەیان بـاش خەملانـدبوو.* ٢- قرسـاندن، قەبلاندن، تـەخمین کـرن، لـە سـەنگدان: *خانووەکـەیان بـە هەشتا ملیۆن دینار خەملاند.*

**خـەنی** (ئـان.) گەشـکە: *لـە خۆشـی سەرکەوتن خەنی بوون.*

**خەو** (ن.) نووستن، نڤستن: *پێویستە زوو بخـەوین تـا بـەیانی زوو هەڵسین.*

**خەواڵوو** (ئان.) چاو بە خەو، کەسێك لە خەو هەڵسابێت، بەلام ئاگای لە خۆی نەبێ و چاوی هەڵنەیێ: *مێندە خەواڵوو مەبە.*

**خـەوتن** (چ.) نڤسـتن، نوسـتن: *لـە گەرمان لەسەر بان خەوتین.*

**خەوش** (ن.) عەیب، خـەش، کەماسـی، کێماسـی، بە گەرد: *مەڤالەکەم وەك زێڕ بێ خەوشە.*

**خـەون** (ن.) ١- شـتێ، کە لە خـەودا دەبینـرێ: *ئـازاد خەونـەکی*

خۆشی دێ. ٢- ئاوات: کەی ئەو خەونەم دێتە دی.

**خەیاڵ** (ن.) سەودا، ئەندێشە، دالغە: *بە خەیاڵ سەفەرم کردبوو. مێندە لە خەیاڵدا مەژی.*

**خراب** (ئان.) خراپ، وێران، تێکچوو، ناشیرین: *هاوڕێیەتی مرۆڤی خراپ مەکە.*

**خراپەکاری** (ن.) کاری ناپەسەند، بەدکاری: *خراپەکاری ئەنجامی باش نییە.*

**خراپی** (ن.) ناپەسەندی، بەدی، ناشیرین: *خراپی لە قوتابی ناوەشێتەوە.*

**خرۆشان** (چ.) تێکەڵو پێکەڵ بوون، وروژان، تێکچوونی بارودۆخ، گرژ بوون: *بەهۆی ئەو بارودۆخەی مەبوو وڵات خرۆشا.*

**خز** (ئان.) لووسو خلیسك، حلی: *ئاگات لە خۆ بێ ئەو شوێنە خزە.*

**خزمەتگوزاری** (ن.) پاژەگوزاری، خزمەتکاری: *شارەوانی خزمەتگوزاری پێشکەش بەهاوڵاتییان دەکات.*

**خزمەتکردن** (چ.) بەردەستی کردن: *خزمەتکردنی یەککەوتە پێویستە.*

**خزێو** (ئان.) لێژ: *ئەم زەوییە خزێوە جێگای خزانە.*

**خستن** (چ.) هاوێشتنە خوار، کەواندن، فڕێدان، بە زەوی دادان: *دارەکانمان بە وەستایی خستە خوارەوە.*

**خشت** (ن.) ١- کەلپیچ، کەرپووچ: *دیوارەکەمان لە خشت دروست کراوە.* ٢- (ئان.) ڕێك، بێ زیادو کەم، تەواو، پڕاو پڕ: *باڵای خشت لە باڵای من دەچێ.*

**خشتە** (ن.) بەرنامە: بۆ ڕێکخستنی کاتەکانم خشتەیەکم داناوە.

**خلبیش** (ن.) ناوی گوندێکە لە پارێزگای دهۆك: *گوندڕێن خلبیشێ بناڤ و دەنگن.*

**خم** (ن.) هەش، بەری گیایەکی ڕەنگ نیلییە پێدەڵێن خمو بەنی پێ

شین دەکەن: *بەنەکەم لە خم نایەوە.*

**خمخانـه** (ن.) دوکانی رەنگرێژی، خومگەر، خمگەر: *جلوبەرگەکانم بردە خمخانە بۆ رەنگکردن.*

**خنجیلانـه** (ئان.) ژیکەڵە، قەشەنگ، جوان، ناسك، رێکوپێك، جان، خشکۆك، بەدەو، رەند، زیبا، قشت: *ئامەنگەکی خنجیلانەم سازکرد.*

**خو** (ج.) خۆ، ئەو: *ئاواز ب خۆ دچە قوتابخانێ.*

**خوا** (ن.) خودا، خودێ، یەزدان، پەروەردگار.

**خواحافیزی** (ن.) ماڵئاوایی، دوعاخواستن، بخاترا وە: *بەبێ خواحافیزی ماڵەوەی بەجێهێشت.*

**خوارن** (ن.) خواردن، خۆراك: *مە خوارنەکا خۆش چێکربوو.*

**خواستن** (چ.) داوا کردنی شتەك لە شوێنەك یا لە یەکەك بۆ ماوەیەك: *خواستنی کتێب لە کتێبخانە دەبێت.*

**خوان** (ن.) ١- سینی، سفرە، مێزی نان خواردن.

**خودان** (ن.) خوەیی، خاوەن، خێو، ساحێب، خانەخوێ: *خودانێ فێ خوارنگەهێ مرۆڤەکێ گەلەك مەردە.* ٢- خوا، یەزدان، خودا: *هەر خودێ خودانێ مەیە.*

**خودانکرن** (چ.) بەخێوکردن، بە خاوەن کردن، بە ساحێب کردن: *ئەڤ ماڵە بخودانکرنا مریشکا دژین.*

**خودایی** (ئان.) یەزدانی، خوایی: *بەمرەکەی خوداییە.*

**خودێ** (ن.) بروانە: خوا.

**خورە** (ن.) میکرۆب: *خورە بە چاو نابینرێت.*

**خورما** (ن.) بەری دارێکی بەرزە لە شوێنی گەرمو شێدار دەڕوێت: *سرکە لە خورما دروست دەکرێت.*

**خوری** (ن.) هری مەڕو بزن: *چاکەتەکەم لە خوری چنراوە.*

**خوڕە** (ن.) دەنگی ئاو و شتی شل، کە بڕێژرێ: *سیروان رووبارەکی خوڕەدارە.*

**خوساندن** (چ.) نماندن، لە ئاودا نەرمکردن، ئەگەر تۆ برنج پێش لێنانی لە ناو ئاو بکەیت، بەو کارە دەڵێن خوساندن.

**خولانەوە** (چ.) زڤرین، لێکزڤرین، سووڕانەوە، چەرخان: *چەند جارەك لەسەر بازنەکە خولانەوە.*

**خولبوونەوە** (چ.) خلۆربوونەوە.

**خولدانەوە** (چ.) بڕوانە: **خولانەوە.**

**خولگە** (ن.) ئەو هێڵەی ،کە شتێك بەسەریدا دەسووڕێتەوە، مەدار: *رۆژو مانگ لە یەك خولگەدا دەخولێنەوە.*

**خولمەت** (ن.) خزمەت، پێویستی، ئیش: *خولمەتا خۆ بۆ من بێژە دا بۆتە بکەم.*

**خوڵقان** (ن.) دروستبوون، ئافەریدە بوون: *لە دایكو باوکێکی رووناکبیر خوڵقاوم.*

**خوم رەنگ** (ن.) خم رەنگ، هەش رەنگ: *کراسەکەم لە خوم رەنگی ناوە.*

خوناو

**خوناو** (ن.) ١- خوناڤ، ئاونگ، شەونم: *بولبول بەیانیان خوناوی سەر پەڕی گوڵ دەخواتەوە.* ٢- *ناوە بۆ مێینە.*

**خوە** (ن.) ئارەقەی لەش: *بەردەوام لەشم ئارەقە دەکا.*

**خویا** (ئان.) ئاشکرا، روونو دیار: *یا خویایە، کو بهارا ئەڤ ساله دێ گەلەکا خۆشبیت.*

**خوێن** (ن.) خوین، خوون، هوون، خین، پێویستییەکی سەرەکی لەشی مرۆڤە: *مرۆڤ و باڵندەو*

*مەمکدارەکان گیانەوەری خوێنگەرمی نەگۆڕن.*

**خوێن بەربوون** (چ.) داڕسانی هەر شوێنێك، خوێن لێهاتن، خوێن کەوتنەوە، خوێنڕسیان، خوێنپژان: *لەگەڵ کەوتنە خوارەوەی خوێنی لە لووتی بەربوو.*

**خوێندەوار** (ئان.) کەسێك بزانێ بخوێنێتەوەو بنووسێ، خویندەڤان: *ڕۆناك خوێندەوارە.*

**خوێندکار** (ئان.) فێرخواز، قوتابی، خویندەڤان: *برام خوێندکاری کۆلیژی پزیشکییە.*

**خوێندن** (چ.) ١- خۆندن، خاندن، چوونە قوتابخانە، چوونە مەکتەب، یەکێك گەر بخوێنێت ڕوو لە قوتابخانە دەکاتو پسپۆری لە پیشەیەك یان بابەتێك پەیدا دەکات. ٢- چڕین، گوتن: *دەمەو بەیانییان کەو باش دەخوێنێت.*

**خوێندنەوەی سەربەخۆ** (ن.) خوێندنەوەی ئازاد کە لە پرۆگرامی خوێندن دا نەبێ: *خوێندنەوەی سەربەخۆ زانیاری خوێندکار زیاددەکات.*

**خوێندنگا** (ن.) فێرگە، قوتابخانە، شوێنی وانە لێ خوێندن: *کوڕەکەم لە خوێندنگایەکی ئامادەییە.*

**خوێندنی تەوزیمی** (ن.) خوێندنی بە زۆری، خوێندنی بە ئەرك: *لە کوردستاندا خوێندنی تەوزیمی بەسەر هەر منداڵەکی تەمەن شەش ساڵدا سەپێندراوە.*

**خوو** (ن.) ١- ڕەفتار، نەریت، خوە: *لەگەڵ ئێمە خوو ڕەوشتی باشە.* ٢- فێ، گەشکە، جۆرە نەخۆشییەکە: *دیسان خووی گرتووە.* ٣- خولیا: *خووی بە خوێندنەوە گرتووە.*

**خوو ڕەوشت** (ن.) ئاکار، ڕەفتار، نەریت: *سالار خوو ڕەوشتەکی جوانی هەیە.*

**خوونەریت** (ن.) هەڵسوکەوت، ڕەفتار، نەریت: دەست درێژکردنە سەر *ماڵی خەڵك خوونەریتەکی خراپە.*

**خۆ بەخش** (ئان.) فیدا کار، خۆبەخت، لە خۆوە بەبێ پارە، لە ڕێگای مەبەستەك، خۆبەختکەر: *گیانی خۆی لە پێناو کوردستاندا بەخشی.*

**خۆ بەخشین** (چ.) خۆ دە پێناونان، مردن لە ڕێگای مەبەستەك، خۆبەخت کردن، خۆفیداکردن: *هەموومان خۆبەخشین لە ڕێی وڵات.*

**خۆ ڕێبەری** (ن.) خۆبەڕێوەبردن، حوکمی خۆ کردن، خود موختاری: *لە ساڵی ١٩٩١ەوە کورد خۆی خۆی بەڕێوەدەبات.*

**خۆبەخت** (ئان.) گۆریکەر، فیداکەر، خۆبەخش.

**خۆبەختکەر** (ئان.) پێشمەرگە، خۆگۆریکەر: *ئێمە خۆبەختکەری وڵاتین.*

**خۆپیشاندان** (چ.) چینێك، کۆمەڵە خەڵکێك بۆ داواکردنی کارێك یان بۆ نارەزایی دەربڕین لە شتێك دەچنە سەرجادەو کۆمەڵێك دروشم هەڵدەگرن و بەرەو شوێنی مەبەست دەچن.

**خۆر** (ن.) ڕۆژ، هەتاو: *کە خۆر هەڵات دنیا ڕووناك دەبێتەوە.*

**خۆڕازاندنەوە** (چ.) خۆخملاندن، خۆجوانکردن: *پێش دەستپێکردنی ئاهەنگەکە خۆی ڕازاندەوە.*

**خۆراك** (ن.) خوارن، خواردەمەنی، ئازووقە: *خۆراك پێویستییەکی بەردەوامی گیاندارانە.*

**خۆڕاگر** (ئان.) خوددار، بێهن فرە، بە ئارام، پشوو درێژ، بە حەوسەڵە: *کورد لە بەرامبەر نەهامەتییەکانی زەمانە خۆڕاگر بووە.*

**خۆڕسك** (ن.) خۆرست، سروشتی، لە خۆوە شین بوو، بە خۆ هەی:

*منکڤینیێ خۆرسکی دەرمانێ گەلەک دەردانە.*

**خۆرسکی**(ئان.) سروشتی: *دار بەروو روەکەکی سروشتییە.*

**خۆزگە** (ن.) کاشکی، خۆزی، خازی، خۆزیک، بریا: *خۆزگە کورد دەولەتی خۆی هەبووایە.*

**خۆش** (ئان.) ١- بەتام، چێژی پەسەند: *مەنجیر میوەیەکی خۆشە.* ٢- ئاو و هەوای بێ تەموژو بێ بارانو نەساردو نە گەرم: *ئەمڕۆ رۆژەکەی خۆشە.* ٣- (ئاک.) خێرا، باش: *ئەسپەکەم خۆش دەڕوا.* ٤- مەشرەب خۆش، کەسەکی بە کەیفو زەوق، قسە خۆش: *مرۆیەکی خۆشە.*

**خۆشتڤی** (ئان.) خۆشەویست: *مرۆڤێ مەرد کەسەکێ خۆشتڤییە دناڤ جڤاکێدا.*

**خۆشتن** (چ.) خۆ شوشتن، خۆخاوێنکردنەوە، سەر شویشتن: *خۆ شتن لە گەرمای هاویندا فێنکت دەکاتەوە.*

**خۆشڕەو** (ئان.) بزاڤخۆش، بە غار، خێرا لە رۆیشتن: *ئەسپەکی خۆشڕەویان هەیە.*

**خۆشگوزەرانی** (ن.) ژیانێکی خۆش، کامەرانی، شادیو بەختەوەری: *کارکردن مۆیەکە بۆ خۆشگوزەرانی.*

**خۆشووشتن** (چ.) بڕوانە: **خۆشتن**.

**خۆشویستن** (چ.) حەز لێکردن، حەباندن، ڤیان، ئەگەر تۆ شتێك یان کەسێکت بە دڵو بە گیان ویست ئەوە خۆشەویستییە.

**خۆشی** (ن.) شادی، کامەرانی، بەختیاری: *لە گەشتەکەدا زۆر بە خۆشی رامانبوارد.*

**خۆگرتوو** (ئان.) چەقیو، توندبوو، رەق، مەیبو: *دارەکی خۆ گرتووە بەرەکەی تا کاتەکی درێژ دەمێنێ.*

**خۆڵ** (ن.) ئاخ، گڵ، خاك: *سەری خانووەکەیان بە خۆڵ گرتووە.*

**خۆڵەمێش** (ن.) خولی، مشكی، ئەگەر تۆ شتێك بسووتێنی، هەر تەنیا خۆڵەمێشی لێ دەمێنێتەوە.

**خـۆم** (ج.) مـن، ئـەز: *خـۆم ڕۆیشـتم كارەكەم جێبەجێكرد.*

**خۆنیشاندان** (چ.) خۆ نواندن: *دوژمن بۆ كەشروفش خۆی نیشان دەدات.* بڕوانە: **خۆپیشاندان.**

**خۆهەڵواس** (ئان.) خۆهەلاویس، كەسەك كە خۆی بە كەسەكی دەسەلاتدار هەڵبواسێ بۆ پشتگیری و هاوكاریكردن.

**خێر** (ن.) ١- ماڵ و سامان: *كوردستان وەلاتەكێ پڕ خێرە.* ٢- قازانج و دەستمایە: *ئەم كارەم خێری زۆرە بۆیە دەستبەرداری نابم.* ٣- كاری چاكە: *خێرت دەگا یارمەتی ئەم پیرە بدە تا دەپەڕێتەوە.*

**خێرا** (ئان.) بلەز، بەپەلە، زوو، گورج و گۆڵ: *لە ڕاكردن بە دوای تۆپدا یاریزانەكی خێرایە.*

**خێرایی** (ن.) پەلەو لەزی، لەزوو بەز: *خێرایی لە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل پەیڕەو مەكە.*

**خێزان** (ن.) ١- ماڵ و منداڵ، لەدایك و باوك و منداڵ پێكدێت، هێندێك جار داپیرەو باپیرەش لەنێو خێزاندا هەن: *خێزانەكی بەختەوەرن.* ٢- هاوسەری ژیان، ژن: *نازدار خێزانی سەردارە.*

**خێزاندار** (ئان.) ١- خاوەنی ماڵ و منداڵ: *ئەلۆ خێزاندارە.* ٢- خاوەن ژن: *هاوكار خێزاندارە.*

**خێزك** (ن.) خەتێكی بچووك، كە لە نێوان دوو وشە یا دوو ڕستە دادەندرێت.

د (ئام.) ل، له: د *پاشەرۆژیدا من دڤێت ببمە مامۆستا.*

دابارین (چ.) باران بارین. بەرەو خوار هەڵڕژان، کۆبوونەوەی چەند کەسەك یا چەند گیاندارەك بەسەر شتەکدا: *خەڵکەکە برسی بوون بەسەر خۆراکدا دابارین.*

دابەزین (چ.) هاتنەخوار، لە سواری دابەزین، کەمبوونەوەی نرخی شتومەك: *نرخی کالا لە دابەزیندایە.*

دابەشکردن (چ.) بەشکردن، بەخشینەوە، پارڤەکرن، لێکڤەکرن، پارچە پارچە کردن، هەر یەکەو بەشی خۆی بدرێتیٚ: *یارمەتییەکەیان بەسەر هەژاراندا دابەش کرد.*

دابونەریت (ن.) دام و دەستوور، عادەت: *شایی رەشبەڵەك دابونەریتەکی کوردەوارییە.*

دابینکردن (چ.) پێکهێنان، مسۆگەر کردن، فەراهەمکردن، جێبەجێکردن : *حکومەت هێمنی و ئاسایش بۆ خەڵك دابین دەکات.*

داپاچین (چ.) لق و قەد برین: *من دارەکانم داپاچین.*

**داپچڕاندن** (چ.) ١- ڤەچڕاندن، دڕاندن، لێکردنەوە: هەر یەکەو بەشی خۆی لە دارەکە *داپچڕاند.*
٢- دەموچاو زەق بوونەوە: کە دیتمی دەموچاوی داپچڕا.

**داپۆشراو** (ئان.) نخافتی، سەر گرتی، شاراوە بەهۆی سەرپۆش، پۆشراو، سەرگیراو: *ئێمە خواردنی داپۆشراو دەخۆین.*

**داپۆشین** (چ.) نخافتن، شاردنەوە، سەرگرتن: *کە خواردن هەڵدەگیرێت دەبێت داپۆشرێ.*

**داپیر** (ن.) نەنك، دایکی باوك، دایکی دایك، نەنە، نەن، داپیرە: *داپیرا من ژنکەکا رێبەر بوو.*

**داپیرە** (ن.) بڕوانە: **داپیر.**

**داتاشین** (چ.) داتراشین، داکڕاندن، لێکردنەوەی تەختە، دار، لە سەرەوە بۆ خوارەوە.

**داچوون** (چ.) ڕۆچوون، شتێك بە قوڵاییدا ببەیتە خوارەوە داچوونی پێدەڵێن.

**داخۆ** (ئام.) ئاخۆ، داخوا، ئایا: *داخۆ کارەکەم بۆ دەکات؟*

**داخاز** (ن.) داخوازی، هیڤی، هیوا: *داخازا من سەرکەڤتنا تەیە.*

**داخازکرن** (چ.) داوا کردن، ویستن: *هەر تشتەکێ تە دڤێت تو دشێی داخاز بکەی.*

**داخوازی** (ن.) داواکاری، پێویستی، داخازی: *دەبێ گوێ لە داخوازییەکانی منداڵ بگیرێت.*

**دادە** (ن.) خوشکی گەورە: *دادە گیان من تۆم خۆش دەوێت.* ٢- دایك: دۆی دادە رژا.

**دادوەری** (ن.) یەکسانی: *پێویستە حکومەت دادوەری کۆمەڵایەتی بسەپێنێت.*

**دار** (ن.) ١- درەخت: *لە ژێر سێبەری دارەکە دانیشتم.* ٢- سامان، دارایی: *دارونەداری ئەوەندە بوو.*

**داربەڕوو** (ن.) دار بەڕی: *دار بەڕوو لە کوردستان زۆرە.*

**دارستان** (ن.) جەنگەڵ، لێڕ، لێڕەوار: *دارستان سامانەکی سروشتییە دەبێت بپارێزرێن.*

**دارگەزوان** (ن.) دار کەزان، دار قەزوان، قەسکوان: *دارەکە لە جێگا ساردەکان دەڕوێت.*

دارلاستیك

**دارلاستیك** (ن.) بەرتەڤك، ڤوسك، پارچە دارێکە لە شێوەی Y دایەو پارچە لاستیکێکی پێوە چەسپێندراوە، بە هۆی دارلاستیکەوە دەتوانیت شتی بچووك خێراو توند بهاوێژیت، بۆ وێنە بەردێکی گچکە.

**داروبار** (ن.) دارودرەخت: *ئەم هاوینە داروبار بەری باشی گرتووە.*

**دارودەڤی** (ن.) دارو دەوەن: *گوندەکەمان دارودەڤیی زۆرە.*

**دارودرەخت** (ن.) بڕوانە: داروبار.

**دارشتن** (چ.) ١- دانان: *بناغەی خانووەکانمان دارشت.* ٢- شێوازی نووسین: *من لە نووسینی دارشتن زۆر بە توانامە.*

**داشۆرگە** (ن.) شوێنەك کە بە ئاو رامالرابێ لە سەرەوە بۆ خوارەوە: *لە بەهاران داشۆرگە لە چیاکان پەیدا دەبێت.*

**داکەوتوو** (ئان.) داکەڤتی، قوپاو: *کاریتەکانی خانووەکە داکەوتوون.*

**داکوتان** (چ.) ١- داهێلان، چەقاندن: *سینگەکەی باش داکوتا.* ٢- دانیشتن، مانەوە، خۆ بەعارد دادان: *کە گەیشتنە ئاواییەکە ماوەیەکی باش لەوێ دایانکوتا.*

**داکۆ**: بۆ ئەوەی، تا وەکو، تاکو: *ئەو باش دخوینیت داکۆ ئەنجاما باش بدەست بهێنێت.*

**داگرتن** (چ.) ١- پڕ کردن، تژیکرن، داپۆشین: *زستانان بەفر چیاکان*

*دادەپۆشێ.* ٢- هێنانە خوار: *زوو بارەکەیان داگرت.*

**داگیرسان** (چ.) هەڵبوون، پێبوون: *لە کوردا بۆ ڕووناکایی شەو قەندیلە دادەگیرسێنرا.*

**داگیرکەر** (ئان.) خۆ بسەردادا، دەستبەسەر داگر، دوژمن: *داگیرکەرانی کوردستان هێشتا چاویان لە خێروبێری ئەم وڵاتەیە.*

**دامان** (چ.) هێندەک کەس، کە دووچاری کێشەیەک دەبن و بۆیان ناکرێت چارەسەری بکەن و واقیان وڕدەمێنێت و دەستەوسان دەبن بەرامبەر بەم بارەو بارانی دی هاوشێوە دەڵێن دامان.

**داماو** (ئان.) کەساس، لێقەوماو، بەدبەخت، ماتبوو، سەرگەردان، دامای: *داماو نازناوی مێژوونووس و ڕۆژنامەنووس حوسێن حوزنی موکریانییە.*

**دامـاوی** (ن.) دامایی، کەساسی، بەدبەختی، سەرگەردانی.

**دامەزراندن** (چ.) جێگیرکردن، توندکردن، دانان، خستنەکار: *ئازاد پار لە زانکۆ دەرچوو، پێویستی بە دامەزراندنە.*

**دامەن** (ن.) ١- داوێن، دامێن: *کراسەکی دامەن بە نەخشی لەبەرە.* ٢- (ئاک.) خوار، بەر: *ماڵیان لە دامەنی گوندەکەیە.*

**دامرکاندن** (چ.) خامۆشکردنی ئاگر، هێور کردنەوە، نەمانی گڕی ئاگر، سەکناندن، فەمراندن: *پیاوانی ئاگرکوژێنەوە زوو ئاگرەکەیان دامرکاندەوە.*

**دامرکێن** (ئان.) تەناکەر، دامرکێنەر، ئەو کەسەیە ئاگر، ئاکۆکی، کێشەو... دادەمرکێنێت.

**دامودەزگا** (ن.) ١- یەکە ئیدارییەکانی وڵات و دەوڵەت، داوو دەزگا: *دامودەزگاکانی حکومەت بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستن.* ٢- کەلوپەل، پێداویستی:

*دوکانەکەی بە دامودەزگاوە فرۆشتووە.*

دان (چ.) ١- پێدان، بەخشین: *من پارەی ئەو یاریانەم پێدان.* (ن.) ٢-دانەوێڵە: *دانم بۆ بولبولەکان کڕی* ٣- تۆو، دنك: *گەنمی ئەم ساڵ دانی باش گرتبوو.* ٤- ددان: *دانەکانم بە قلچە و هەویری ددان دەشۆم* ٥- نیوەی ڕۆژێك، ژەمی خواردن: *ئەمڕۆ زۆر بێ مێز بووم تەنیا دانێك کارم کرد. مرۆڤ ڕۆژێ سێ دانێن زادی دخوت.*

دانا (ئان.) ١- زانا، هۆشیار، وریا، شارەزا، تێگەهشتی: *باوکی میوا دانا بوو.* ٢- ناوی کوڕانە: *دانا لە وانەکانی زیرەکە.*

دانایی (ن.) شارەزایی، وریایی، زانایی: *بە دانایی خۆیەوە گەیشتۆتە ئەو پلەیە.*

دانەوە (چ.) پێدانەوە، وێدانەوە، گەڕاندنەوە: *دانەوەی پارەی خەڵکی لەکاتی خۆیدا ڕەفتارەکی جوانە.*

دانەوێڵە (ن.) دان، تۆڤ، دەخلودان، ئازووقەی وشك لە گەنمو جۆو نیسكو نۆكو.....: *دانەوێڵە سەرەکیترین خواردنی مرۆڤە.*

دانکوت (ن.) داندۆك، دانەقوت: *دانکوت خواردنەکی فۆلکلۆرییە.*

دانهێرك (ن.) گەنمە کوتا: *دانهێرك خواردنەکی کوردەوارییە.*

دانیشتن (چ.) ١- ڕونیشتن، نیشتن: *لە ژێر سێبەری دارەکە تاوێ دانیشتین.* ٢- وازهێنان: *ئێستا دانیشتووم کارناکەم.*

دانیشتوو (ن.) ئاکنجی: *ژمارەیەکی زۆری کورد دانیشتووی وڵاتانی بێگانەن.*

دانیشتووان (ن.) ڕوونیشتووان، نیشتەجێیان، ئاکنجییان: *دانیشتووانی کورد لە کوردستان نزیکەی ٤٠ ملیۆن دەبن.*

**داو** (ن.) داوەدەزوو، تاڵەمووێك، تەڵە، تا، داڤ: *کۆلارەکە بەرەڵا بوو، چونکە داوەکەی پسا.*

**داوا** (ن.) ١- داخازی، ویستن: *داوای لە باوکی کرد تا دیارییەکی بۆ بهێنێ.* ٢- شەڕو قەزاوەت، هەرا: *چ داوایەکت لەگەڵ ئێمە مەیە باسی بکە.*

**داوەت** (ن.) گۆڤەند، شایی، ئاهەنگ، زەماوەند: *ل داوەتا ئازادو شیرنێدا مە ئێکدو دیت.*

**داوەڵ** (ن.) داڵەهۆ، داوڵ، داڵۆ، داهۆڵ، هەلامەت، شتێکە لە شێوەی ئادەمی زاد لە دار دروست دەکرێت و لە نێو شینایی دادەنرێت بۆ لێ سڵەمینەوەی باڵندە.

**داوودەرمان** (ن.) هۆکاری چارەسەری: *پزیشك داوودەرمانێکی زۆری بۆ نووسیوم.*

**داوودە** (ن.) هۆزێکی کوردی کەرکوکە.

**داهات** (ن.) بەرهەم، قازانج، سوود، دەرامەت: *کەنمی ئەمساڵ داهاتی زۆر بوو.*

**داهاتوو** (ن.) داهاتی، ئاییندە، پاشەڕۆژ: *لە داهاتوو بە فرۆکە سەردانی یەکتر دەکەین.*

**داهاتی** (ئاك.) بڕوانە: **داهاتوو.**

**داهێنان** (چ.) ١- دۆزینەوەو دروستکردنی شتێ، کە پێشتر نەبووە: *کارەبا لەلایەن ئەدیسۆنەوە داهێنرا.* ٢- شانە کردنی پرچ: *بەیانیان پرچم دادەهێنم.*

**داهێنەر** (ئان.) داهێنەر، دۆزەرەوە: *گراهام بێل داهێنەری تەلەفۆنە.*

**دایباب** (ن.) دایك و باوك: *ئەم منداڵانە دایبابیان مامۆستان.*

**دایە** (ن.) هۆدا، دایك، ئۆدە، دایکە، دادە، *لە باری بانگکردنی دایك دەگوترێت دایە.*

**دایەنخانە** (ن.) دایەنگا: شوێنی بەخێو کردنی منداڵی ساوا:

کوڕو کچەکەم ناردوونەتە دایەنخانە.

**دایك** (ن.) داك، دا، نۆدە، دایە، دییا: *نیشتمان دایکی گەورەمانە.*

**دایکە** (ن.) بڕوانە: دایە.

**دایکینی** (ن.) دایکێتی: *مامۆستاکەمان مۆڵەتی دایکێتی هەیە.*

**دەبا** (ئام.) ١- با، دەی، یاڵلا: *دەبا بچینەوە، درەنگە.* ٢- دەبووایە: *دەبا ئەوشەو لێرە بن.*

**دەحل و دار** (ن.) بیشەو دڕکو دار: *ئەم دەحەل و دارە لە باخچە دەربهێنە.*

**دەرامەت** (ن.) دەستکەوتەکە لە سروشت یان لە کارکردن دەست دەکەوێت. بەروبوومی زەوی، داهات: *کوردستان دەرامەتی گەنم و جۆی زۆرە.*

**دەرەکی** (ن.) لاوەکی: *لەوانەیە مامۆستا لە تاقیکردنەوەکەدا پرسیارەکی دەرەکی بێنێ.*

**دەرەوە** (ئان.) دەرێ، دەرڤە: *لە دەرەوە دەتبینم.* ٢- هەندەران، تاراوگە، دەرەوەی وڵات: *باوکم بە یەکجاری لە دەرەوە گەڕاوەتەوە.*

**دەربازبوون** (چ.) ١- ڕزگاربوون: *لە مەترسی دەرباز بووین.* ٢- تێپەڕبوون: بەسەر پردەکە *دەرباز بوون.*

**دەربازکردن** (چ.) پەڕاندنەوە، قورتارکردن، ڕزگارکردن: *من تۆم لە ناخۆشی ڕزگار کرد.*

**دەربەدەر** (ئان.) ئاوارە، پەناهەندە، دوورەوڵات، بێخودان: *ئەوەی لە وڵات دەربەدەرە هەمیشە خەمی گەڕانەوەیەتی.*

**دەربەدەری** (ن.) ئاوارەیی، بێ جێو ڕێ: *من دەربەدەریم دیوە، بۆیە دەزانم چەند قورسە.*

**دەرچوون** (چ.) ١- دەربازبوون: *دەرچوون لە تاقیکردنەوە دڵشادمان دەکات.* ٢- *هاتنە دەرەوە*، چوونە دەر، *دەرکەفتن: هێندێك جار دەرچوون لە ماڵەوە پێویستە.*

**دەرد** (ن.) نەخۆشــی، ئــازار، کوڤــان: *ئەنفلونزا دەردەکی گرانە.*

**دەردان** (چ.) ١- لابردن و خاوێنکردن، پاڵاوتن: *ئەم بیرە پێویستی بە دەردان هەیــە.* ٢- دەڵانــدن، هێنانە دەرەوە: *بەو تایە لەشم ئارەقەیەکی زۆری دەرداوە.*

**دەردەسەری** (ن.) زەحمەتی، نەهامەتی، نەخۆشی، چەرمەسەری، ئەرکی گــران و قــورس: *مــە گەلــەك دەردەسەری دیتینە.*

**دەرداو** (ئان.) دەرهاڤێژتی: *ئەو بیرە دەرداوە.*

**دەرزیــــك** (ن.) ١- شــرنقە، دەرزی: *برینپێچی دەرزیکەك بۆ من دانا.* ٢- دەرزی دوورمــان: *ئــەز دێ کراسێ خۆ ب دەرزیکێ دروێم.*

**دەرفــــەت** (ن.) هــەل، مــاوە، کــات، فرسەت، دەلیڤە: *دەرفەت هەیە ببم بە پارێزەر.*

**دەرفــــەت ڕەخســــاندن** (چ.) هــەل وەدەستهێنان، هەل قۆستنەوە: *ئەگــەر دەرفــەتم بــۆ بڕەخسێت کاری خۆم دەکەم.*

**دەرکەفتن** (چ.) ١- دەرچوون، ڕۆیشتن: *دگــەل بــانگێ سپێدێ ژ مــال دەرکەفت.* ٢- بە گوێ نەکردن: *ژ ئاخاڤتنا دیا خۆ دەرناکەفیت.*

**دەرکەوتن** (چ.) هاتنە دەر، پەیدابوون، دەرکــەفتن: *ڕۆژ لــە پــەنای چیا دەرکەوت.*

**دەرگــــا** (ن.) دەرکــا، کــاپی، قــاپی، دەرکــە، دەروازە: *لەدوای خۆت دەرگاکە داخە.*

**دەرگــــۆش** (ن.) لانکــە، بێشــکە: *مــن زارۆیێ خۆ خستە دەرگۆشێ.*

**دەرمــــان** (ن.) هــەر ماددەیــەك بــۆ چارەســـەریا نەخۆشـــییان بــەکاربهێت دبێــژنێ دەرمــان، هۆیــەکانی چارەســـەری: *زۆر بــەکارهێنانی دەرمــان پەســەند نییە.*

**دەرمــــانکردن** (چ.) چارەســـەرکردن، تیمــارکردن: *برینەکــەیان زوو بۆ دەرمان کردم.*

دەروازە

**دەروازە** (ن.) ١- دەرۆك، دەرگای سەرەتا و گەورە: *شاری ئامێدی دوو دەروازەی سەرەکی تێدایە.* ٢- چوونە ناو: *هەموو پەرتووکێك دەروازەی هەیە.*

**دەرووەست** (ن.) تاقەت، دەرەقەت: *دەرووەستت نایەم*

**دەرهێنان** (چ.) هێنانەدەر، دەرئانین، دەرهانین: *ئازاد نەوزادی لە ئاوەکە دەرهێنا.*

**دەریا** (ن.) زەریا، ئاوەکی ئێجگار زۆرە کە ئەمبەرو ئەوبەری دیار نەبێت کەشتیو پاپۆڕی بەسەرەوە دەگەڕێ: *دەریای سپی ناوەڕاست کەوتۆتە نێوان سێ کیشوەر.*

**دەریاچە** (ن.) گۆم، گۆل، زرێبار: *من لە دەریاچەی دوکان مەلەوانیم کردووە.*

**دەرێخستن** (چ.) ١- دەرخستن، دەرکردن: *مە دوژمن ژ کوردستانێ دەرێخستن.* ٢- دەرهێنان، بڵاو کردنەوە: نووکە *گەلەك گۆڤارێن زارۆکا دهێنە دەرێخستن.*

**دەزگا** (ن.) ئامێر، ئامراز: *ئاسایش دەزگایەکە بۆ پاراستنی خەڵك.*

**دەزوو** (ن.) دەزی، دەزگ، مەچیر، تاڵی ڕێسراوی بارێك.

**دەسەڵات** (ن.) هێز، شیان، توانا، فەرمانڕەوایی، مافی بەکارهێنانی هێز بۆ دەست بەسەرداگرتنی هەڵسوکەوتی کەسانی دیکە: *وەرگرتنی قوتابی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرە.*

**دەسەڵاتدار** (ئان.) هێزدار، خاوەن دەسەڵات، بە دەسەڵات: کورد *لە کوردستاندا دەسەڵاتدارە.*

**دەست** (ن.) ئەندامێکی لەشە، کە لەسەری پەنجەوەیە تا سەرشان: *هەموو مرۆڤێك دوو دەستی هەیە.*

**دەستە** (ن.) ١- چەپکە گوڵ، دەسکە گوڵ. ٢- کۆمەڵە کەسێك، کۆمەڵە دارێك.

**دەستەبەر** (ئان.) ١- ناچار: *قەرزار دەستەبەرە قەرزەکە بداتەوە.* ٢- یارمەتیدەر، هاریکار، گەر تۆ کارێکی گرانت کەوتە سەر هاوڕێکەت هێندێکی وەخۆ گرت، ئەوا دەستە بەرتە.

**دەستەبەرکردن** (چ.) دابینکردن، مسۆگەرکردن: حکومەت مێمنی *بۆ خەڵك دەستەبەر دەکات.*

**دەستەجل** (ن.) جل و بەرگی تەواو، قاتی تەواو: دایکم دەستە *جلەکی کوردی بۆ کڕیم.*

**دەستە خوشك** (ن.) دوو کچ یا زیاتر هاوەڵی یەکبن و ڕێز لە یەکتر بنێن و یەکتریان خۆشبوێت.

**دەستەسڕ** (ن.) دەستسڕ، دەستماڵ، کەفیك: *بۆ خاوێنکردنەوە دەستەسڕێك هەڵبگرە.*

**دەستەواژە** (ن.) دەستە پەیڤ، قسە، فرێز، گرێ: *دەستەواژەی جوان بۆ ئاخاوتن بەکاربێنە.*

**دەستبەجێ** (ئاك.) زوو زوو، یەکسەر: *ئەم منالە نەخۆشە دەستبەجێ بیگەیەننە لای دکتۆر.*

**دەستپاك** (ئان.) دژی دەست پیس، ڕاستگۆ، باوەڕ پێکراو: *منداڵی ژیر دەبێت دەستپاکبێت.*

**دەستپێك** (ن.) سەرەتا، پێشەکی: *دەستپێکی وەرزشیم لە تیپەکی میللی بوو.*

**دەستپێکردن** (چ.) دەستکردن بە ئەنجامدانی کارێك، دەستکردن: *دەستیان بە دامەزراندنی کارگەکە کردووە.*

**دەست تەنگی** (ن.) هەژاری، دەست کورتی، نەبوونی: *دەست تەنگی دەردەکی گرانە.*

**دەست ڕەنگینی** (ن.) وەستایی، لێزانی، پسپۆڕیی، کارزانی: *بە دەستڕەنگینی خۆی بووەتە ئەو وەستایە.*

**دەستڕۆیشتوو** (ئان.) دەوڵەمەند، خوا پێداو، کاربەدەست: *زانا پیاوەکی دەست ڕۆیشتووە.*

دەستشۆر

**دەستشۆر** (ن.) دەستشۆ، جێگەی دەست لێ شووشتن، حەوزێکی بچووکە بە دیوارەوە لکاوە، بۆرییێک یان دوو بۆڕی ئاوی لەسەرە، دەتوانرێت دەستو دەموچاوی لەسەر بشۆیت.

**دەستقوتان** (چ.) چەپڵەلێدان، چەپڵەڕێزان، دەست لێکدان: *دەست قوتان و ئافەرین بۆ قوتابی زیرەکە.*

**دەستکەوت** (ن.) دەسمایە، قازانج، داهات: *ئەمڕۆ دەستکەوتم باشبوو.*

**دەستکرد** (ئان.) کاری دەستی، دەستکار، پێچەوانەی سروشتی: *ئەم مافوورە دەستکردی دایکمە..*

**دەستکورت** (ئان.) هەژار، نەدار: *باوکی هەژار زۆر دەستکورتە.*

**دەستگیرکردن** (چ.) گرتن، بەندکردن: *ئاسایش چەند تاوانبارەکی دەستگیرکرد.*

**دەستلێدان** (چ.) دەستکاریکردن، گۆڕین: *دەست لێدانی تەلی کارەبا بڤەیە.*

**دەستواڵ** (ن.) ١- دەست بەتاڵ، دەست ڤالا، دەست خالی: *بە دەستی واڵاوییەوە چوو بووم.* ٢- بێکار، بێ ئیش: *مرۆڤ نابێت*

دەستوالا بێت، دەبێت بە دوای *کاردا بگەڕێت.*

**دەستوبرد** (ئان.) گورج و گۆڵ: *کاکە دەستوبرد بە لە کارەکەت.*

**دەستوور** (ن.) ١- ڕێوشوێن، داب، یاسا، قانونی بەڕێوەبردنی دەوڵەت: *دەستوور بالاترین قانونی وڵاتە.* ٢- شێواز، نەریت: *کورد دەستوورەکی جوانی میوانداری هەیە.*

**دەستێوەردان** (چ.) خەریك بوون لەگەڵ کاریّ، خۆتیّ هەڵقورتاندن، دەست خستنە ناو کارەك، ماتێیکرن: *کەس بۆی نییە دەست لە کاروباری خەڵکی وەربدات.*

**دەسك** (ن.) دەستك، چەپك: *دەسکە گوڵەکی بۆ بە دیاری هێنابووم.* ٢- لە هەر شتێك ئەو شوێنەی دەستی تێدەگیریّ: *دەسکی کووپەکەی شکاندم.*

**دەشت** (ن.) زەوی ڕاست و چۆڵ دوور لە ئاوایی، شوێنی تەختی چۆلی ڕووتەن: *دەشتی قەراج بە گەنم بەناوبانگە.*

**دەشتایی** (ن.) دەشتانی، ناوچەیەکی تەخت و پان و بەرین: *تا بەرەو باشوور بڕۆین دەشتایی زیاتر دەبێت.*

**دەشتەکی** (ن.) خەڵکی دەشتیّ، لادێیی، چۆڵ نشین: *بە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری هەولێر دەڵێن دەشتەکی.*

**دەف** (ن.) تەختەیەکی بازنەییە دیوەکی بە چەرمی مالات دیوەکەی دیشی بە زنجیری کورت کورت دادەپۆشریّ وەك ئامێرەکی مۆزیکی کاری پیّ دەکریّ: *دەروێش بە دەف زیکردەکات.*

**دەفژەن** (ئان.) ئەوەی دەف لیّ دەدات: *زۆربەی تیپی مۆسیقا دەفژەنیان تێدایە.*

**دەفتەر** (ن.) ١- پەڕاو، کاغەز: *دەفتەرەك بکڕە بۆ ڕێزمان.* ٢- کاغەزی جگەرە تێکردن.

**دەفــــر** (ن.) ئامــان، قــاپو قاچــاخ: *شێوەی ئاوی دەفر بە گۆڕانی دەفرەکە دەگۆڕێت.*

**دەڤ** (ن.) دەم، زار، دەو: *ئـــەم هـــەر ڕۆژێ دەڤ و ددانێن خۆ دشۆین.*

**دەڤەر** (ن.) ناوچە، ئاقار، شوێن، جێ: *دەڤەرا بەروارێ بالا ب سیڤا بناڤ و دەنگە.*

**دەگمەن** (ئان.) بژارە، دانسقە، نایاب، زۆرکەم، شتەك، کە پەیدا بوونی کەم بێ، یان دەستکەوتنی گران بێت: *کتێبێکی دەگمەنە.*

**دەلاقە** (ن.) کولین، کونێکی بچووکە لەسەر دیوار لەلای میچ دەکرێت، بۆ روناکیو دەرچوونی دووکەڵ: *ماڵەکەمان یەك دەلاقەی هەیە.*

**دەلوە** (ن.) دۆلك، دۆلکە.

**دەم** (ئـاك.) ١- کـات، وەخـت: *دەمـی نیـوەڕۆ بـوو هاتمـەوە.* ٢- ناوی ئەندامێکی لەشی مرۆڤـە، دەم، دەڤـ: *پشـتی نـان خـارنێ دەمێ خۆ باش بشۆ.*

**دەمەك** (ئاك.) ماوەیەك: *دەمەك بەر لـە ئێستا هاتمەوە.*

**دەمژمێر** (ن.) کاتژمێر، سەعات: *وانـەی یەکەم لە کاتژمێر هەشت دەست پێدەکات.*

**دەمودەســــت** (ئـــاك.) دگافێـــدا، دەملەدەســــت، یەکســــەر: *دەمودەست فریایان کەوتین.*

**دەمیلـــە** (ن.) دەڤـك: *هـەموو کـەلای ڕووەکەکان دەمیلەیان هەیە بۆ هاتوچۆی هەوا.*

**دەنك** (ن.) ١- ندك، زلك، دانەی هـەر شـت: *بـە قـەد دەنکـە نیسـکەك گەورەیـە.* ٢- نـاوکی میـوەو خواردن.

**دەنکە** (ن.) بڕوانە: دەنك

**دەنکـدەنك** (ئـاك.) دانـە دانـە: *دەنکـە هەنارەکانی دەنکدەنك هەڵبژارد.*

**دەنـگ** (ن.) ١- هـەر چییەك بـە گـوێ ببیسـترێ: وەك دەنگـی مـرۆڤ دەنگی باڵندە: *دەنگـی کـەو زۆر خۆشـــە.* ٢- خەبـــەر، بـــاس،

هەوال: پێشتر دەنگی ئەوە *هەبووکە دێیتەوە.*

**دەنگدان** (چ.) ١- بەشداری هەڵبژاردن: *لە هەڵبژاردنی پەرلەمان دەنگدان ئازادە.* ٢- خەڵك ئاگادار کردنەوە، بانگکردن: *تا دەنگم نەدا منی نەدیت.*

**دەنگوباس** (ن.) هەواڵ، نوچە، باس‌و خواس، خەبەر: *شەوانە گوێ لە دەنگوباسی ناوخۆ رادەگرم.*

**دەنووك** (ن.) دم، نیکل، نکل، دەندووك: *باڵندەکان دەنووکیان هەیەو ددانیان نییە.*

**دەوار** (ن.) رەشماڵ: *کۆچەرەکان لە کوێستانەکان دەوار هەڵدەدەن.* ٢- رەشە وڵاخ، کەر، ماین، ئەسپ، ئێستر.

**دەوەن** (ن.) تەراش، پنچکە دار، شەتڵ: *هەر دەوەنە دەبێتە دار.*

**دەور** (ن.) ١-دەورە، چوار دەورە، دەوروبەر: *قوتابخانەکەمان بەچەند باڵەخانەیەك دەوری گیراوە.* ٢- رۆڵ: *خەڵك لە رێگارکردنی شاری هەولێردا دەورەکی سەرەکی بینی.* ٣- پێداچوونەوە: *هەموو رۆژێ وانەکان دەور دەکاتەوە.*

**دەوروبەر** (ن.) چواردەور، دەوروپشت، دوورماندوور: *خزمەکانیشمان هەر لەو دەوروبەرەن.*

**دەوروپشت** (ن.) بڕوانە: **دەوروبەر.**

**دەوڵەت** (ن.) ١- سنوورەکی سیاسی دیاریکراوە کە فەرمانڕەوایی تێدایە، مەرجی دەوڵەتیش هەبوونی چەند شتەکە لەوانە (خاك، گەل، حکومەت، سەروەری): *کورد مافی خۆیەتی دەوڵەتی هەبێت.* ٢- مەڕو ماڵات، سامان‌و دارایی: *خاوەن دەوڵەتە یەکی ناکەوێ.*

**دەوڵەمەند** (ئان.) زەنگین، ساماندار، هەبوو، هەیی: *کوردستان وەلاتەکێ دەوڵەمەندە ب کانزایێن خۆڤە.*

**دەولەمەندی** (ن.) زەنگینی، مەبوونی، ساماندداری: *دەولەمەندی بۆ هەموو کەس وەکو یەك نییە.*

**ددان** (ن.) دیان، دان: ئامرازەکی ناو دەمی مرۆڤە بۆ جوین بەکار دێت: *رۆژی دوو سێ جار ددانم دەشۆم.*

**ددان هاتن** (چ.) پەیدابوون و دەرکەوتنی ددان: *وشیاربە گەزەت لێ نەدا، ددانی هاتووە.*

**ددانی شیری** (ن.) ددانی کاتی، ئەو بیست ددانەی یەکەمجار لەناو دەمی مرۆڤ دروست دەبن: *منداڵەکە هێشتا ددانی شیری نەهاتووە.*

**ددانی هەمیشەیی** (ن.) ددانی تەمەن، ددانی ژێری، (٣٢) ددانەکەی دوای تەمەنی شەش حەوت ساڵی، ئەو ددانانەن لە دوای کەوتنی ددانی شیری دەردەکەون: *ددانی هەمیشەیی ئەگەر بکەون نایەنەوە.*

**دراو** (ن.) دراڤ، پوول، پەرە، پارە: *دۆلار دراوەکی بەنرخە.*

**دراوسێ** (ن.) هاوسێ، ماڵاوسێ، جیران، هەفسێ، کەسەکە، کە ماڵی لە ماڵتەوە نزیك بێت: *نەکەی دراوسێت بێزار بکەی.*

**درەخت** (ن.) داروبار، دار: *لە کوردستاندا درەختی بەردار زۆرە.*

**درەوشان** (چ.) تەیسین، بریقان، تریسکەدار: *زێر لەبەر هەتاو دەدرەوشێتەوە.*

**درەوشەدار** (ئان.) تەیسۆك، بریقەدار، تریسکەدار: *جلێکی درەوشەدارە.*

**درز** (ن.) دەرز، تیك، قەڵشی: *درزەکە تا دێت گەورە دەبێت.*

**دروارکەر** (ئان.) بەرگدروو: *باوکم دروارکەرەکی باشە.*

**دروارێتی** (ئان.) بەرگدروێتی.

**دروست کرن** (چ.) رێکخستن و پێکهێنان، چێکرن: *پارەیەکی*

زۆرم چوو لە دروست کردنی خانووەکەم.

دروستکردن (چ.) بڕوانە: دروستکرن.

دروستی (ن.) ڕێکی، ڕاستی، ساخلەمی: بۆ دروستی لەشت پێویستە زۆر ئاگاداری خۆت بی.

دروشم

دروشم (ن.) دریشم، ئارم، نیشانەیەکی دیاریکراو، داوای سەرەکی: هەر حکومەت و هەر ڕێکخراوەك دروشمی تایبەتی خۆی هەیە.

دروێنە (ن.) درەو بە داس، دروونە: جاران دروێنە بە داس دەکرا.

درۆ (ئان.) درەو، قسەی ناڕاست: درۆ کردن کردەوەیەکی پەسەند نییە.

درۆزن (ئان.) ئەوکەسەی کە درۆ دەکات: درۆزن هەمیشە ریسوا و شەرمەزارە.

درهەم (ن.) جۆرە دراوێکە لە دراخمای یۆنانییەوە هاتووە: جاران دینارێکی عێراقی بیست درهەم بوو.

درێژ (ئان.) پێچەوانەی کورت: ژیان ڕێگایەکی درێژە.

درێژخایەن (ئان.) زۆر وەخت گر، دوورو درێژ، بەردەوام، گەر پرۆژەیەکت بە دەستەوە بوو، بۆ ئەنجامدانی ماوەیەکی زۆر پێویست بوو، دەڵێن پرۆژەکە درێژ خایەن بوو.

دڕك (ن.) ستری، ئەستووری، چقڵ، دڕوو، دڕی: مەبە دڕك لەبەر پێی کەس.

دڕکە پەتك (ن.) موریکێن پشتێ، دەماری دڕکاوی، پەتی دڕکاوی،

مەغزی درکاوی، درکە پەتك ئەندامەکی گرنگی لەشی مرۆڤە.

درندانە (ئاك.) وەحشییانە، نارەوایانە، بێ بەزەییانە: *دوژمنانی کورد درندانە کوردیان قڕ دەکرد.*

درندە (ئان.) زۆردار، هۆڤ، ستەمکار، شێر، پڵنگ، گورگو...هەر جانەوەرێکی گۆشتخۆر درندەیە.

دز (ئان.) بەو کەسە دەگووترێت، کە کاری دزی دەکات.

دزراو (ئان.) ئەو شتەیە، کە لەلایەن دزەوە براوە.

دزی (ن.) کاری دزین: *مرۆڤی بەدکار دزی دەکات.*

دزیکەر (ئان.) ئەو کەسێ دزییان دکەت: *دزیکەر ریسواو شەرمەزارە.*

دزین (چ.) بردن بە نهێنی: *دزین لە مرۆڤی ژیر ناوەشێتەوە.*

دزێو (ئان.) ناشیرین، بێزراو، کرێت: *مێژین لێدانی شوفێر کارەکی دزێوەو ناژیارییە.*

دژ (ئان.) ١- پێچەوانە: *دژی من مەبە.* ٢- (ن.) قەلا، کۆنگرە: *لە شارە دێرینەکانی کوردستاندا دژی قایم دروستکراوە.*

دژەتەنەکان (ن.) دژەلەش.

دژەرەوانی (ن.) دژی زکچوونێ: *دکتۆر دەرمانی دژەرەوانی پێدا.*

دفن (ن.) کەپوو، لووت، پۆز: *دفن بلندی خۆیەکێ خراپە.*

دکتۆر (ن.) ١- پزیشك، نۆژدار: *پشتیوان دکتۆری مەناوە.* ٢- کەسەك کە دوا پلەی خوێندنی بالای بریبێ پێی دەگوترێ دکتۆر.

دگەل (ئاك.) لەگەلێ: *لەگەلێ باوکم دەچم بۆ سەیران.*

دل (ن.) دلێ، ئەندامی کاری ژیانی مرۆڤ، کە سەرچاوەی خوێن و سوورەکەیەتی: *دلێ خوێن پالێ دەدات بۆ بەشەکانی لەش.*

دلڤەکەر (ئان.) دلگیر، خۆش، دلخۆشکەر: *شەقلاوە هاوینەهەوارەکی دلڤەکەرە.*

**دلۆڤان** (ئان.) دۆست، خۆشەویست، میهرەبان، بە بەزەیی: *دەیکا مەڤاڵ من گەلەکا دلۆڤانە.*

**دلێر** (ئان.) مێرخاس، مێرچاك: *ئێمەی دلێر تێیدەکۆشین.*

**دلۆڤانی** (ن.) میهرەبانی، بەزەیی پێداهاتنەوە: *بە دلۆڤانی ڕەفتار لەگەڵ قوتابییان بکە.*

**دڵتەزێن** (ئان.) ڕووداوی زۆر ناخۆش، غەمناك: *کارە خۆ کوژییەکەی یەکی شوباتی ٢٠٠٤ لە هەولێر ڕووداوەکی دڵتەزێن بوو.*

**دڵپاك** (ئان.) ١- بێ فرتوفێڵ، بێ گرێ، دڵسۆز: *مامۆستاکەمان نموونەی مرۆڤی دڵپاکە.* ٢- ناوە بۆ هەردوو توخم.

**دڵپاکی** (ن.) بێ فڕو فێڵی، میهرەبانی، دڵسۆزی: *بە دڵپاکییەوە لەگەڵ قوتابییان بدوێ.*

**دڵخۆش** (ئان.) دڵشاد، کەیفخۆش: *بەهاتنت دڵخۆش بووم.*

**دڵخۆشکەر** (ئان.) شتێ، کە دڵت خۆش کات: *ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ دڵخۆشکەر بوو، بەڵام جێبەجێ نەکرا.*

**دڵ ڕەڤ** ( ) دڵ ڕفین، سەرنج ڕاکێش: *تۆم خۆشدەوێت و دڵی منت ڕەڤاند.*

**دڵڕفێن** (ئان.) خۆشی، سەرنج ڕاکێش، ناسك، دڵبەر، دڵ پێی خۆشە: *هاوینە هەوارەکانی کوردستان دڵڕفێنن.*

**دڵسۆز** (ئان.) ١- خەمخۆر، مشورخۆر، دلسۆز: *جەماوەر بۆ نیشتمان دڵسۆزە.* ٢- خاوەن بەزەیی: *دایکم میهرەبانە.* ٣- ناوە بۆ هەردوو توخم.

**دڵسۆزی** (ن.) دڵپاکی، بەزەیی، خەمخۆری: *دەبێت قوتابیان بە کیانی دڵسۆزییەوە پێ بگەن.*

**دڵشاد** (ئان.) دڵخۆش، بەختەوەر، بەختیار: *کە تۆم دیت زۆر دڵشاد بووم.* ٢- ناوە بۆ نێرینە: دڵشاد قوتابییەکی چالاکە.

**دڵشکاندن** (چ.) دڵڕەنجاندن، بێ دڵی کردن: *دڵشکاندنی خەڵك کارەکی باش نییە.*

**دلگــران** (ئـان.) دلتـەنگ، تـووڕە. بـە کەسـێك دەڵـێن، کـە تـووڕەو تووش و هەردەم خەفەتبار بێت.

**دڵنیا** (ئان.) ١- بێ خەم، کەسەکە بێ گومانـە، یەکـدڵی لـە کارەکـدا، پشتڕاست: *دڵنیابە سەرکەوتوو دەبـی.* ٢- نـاوە بـۆ هـەردوو توخم.

**دڵـــۆپێن** (چ.) دڵـۆپین، دڵۆپانـدن: *دڵـۆپێن ڕێگایـەکی باشـە بـۆ خاوێنکردنەوەی ئاو.*

**دم** (ن.) نکل، دندوك، دمك: *کوترەکە دمی شکاوە.*

**دندك** (ن.) دەنك، ناوك، تـۆو: *دندنکی شووتی خۆشە.*

**دنیا** (ن.) جیهان، گـەردوون، دنـێ: *لە بەهاراندا دنیا رەنگین دەبێت.*

**دوا ڕۆژ**(ئـاك.) ئاینـدە، پاشـە ڕۆژ: *دوا ڕۆژی ئەو نەوەیە ڕووناکە.*

**دواستوون** (ن.) ستوینا دومـاهیێ: *من دوا ســـــتوونی گۆڤارەکـــــە دەنووسم.*

**دوان** (چ.) ١- قسـەکردن، ئاخـاوتن، ئـاخفتن، گفتوگـۆکردن: *ئـەم دوانەت لەجێی خۆی بوو.* ٢- (ئـان) ژمـارە دوو: *دوان لـە قوتابییەکان هاتنە لام.*

**دوانـــدن** (چ.) وە ئاخـاوتن خسـتن، هێنانـە قسـە، دەنگدان: *بە زۆر دواندم.*

**دواوە** (ئـاك.) پشـتەوە، پشـتێ، پشتەوە: *رستەکە کەوتۆتە دێڕی هەرە دواوە.*

**دوای** (ئاك.) پاشـین، بـە دوا: *پشیلەکە دوای مشکەکە کەوت.*

**دوڕندە** (ئان.) بڕوانە: دڕندە.

**دوژمن** (ن.) نەحەز، نەیار: *دوژمـن هیچ کـات نـەڤێت ئـەم ب ئاشـتی بژین.*

**دوگان** (ن.) دەریاچەیەکە لـە سـنووری پارێزگەی سلێمانی، بـەهۆی ئـەو بەسـتەی، کـە لـە بـەردەم ئاوەکــەی کــراوە، بۆتــە سەرچـاوەیەك بـۆ بەرهـەمهێنانی کارەبا.

**دوماهی** (ئاک.) کۆتایی، دوایی: *ئەمڕۆ دوماهی بە تاقیکردنەوە هات.* دوماهیکەتا خێر بێت.

**دوماهیك** (ئان.) بڕوانە: **دوماهی**.

**دوێنــێ** (ئـاک.) دوهــی، دونــێ، ڕۆژی ڕابـردوو، ڕۆژەك پێشـتر: *دوێنــێ یادی ڕۆژنامەگەری کوردی بوو.*

**دووبەرەکی** (ن.) کێشەو هەرا لەناو یەك هۆزو گەلدا، نـاکۆکی، هـەڤڕکی: *ئـامێین دووبـەرەکی بکەوێتــە نێوانمان.*

**دووچــــاربوون** (چ.) ئــــالوودەبوون، تووشـبوون، گیرۆدەبـوون: *ئـای چۆن دووچاری داوی تۆ بووم.*

**دوور** (ئاک.) دویر: *مالا من ژ قوتابخانێ دوورە.*

**دووربین** (ن.) ١- دویـربین، ئامێرەکـە شــتی دوور نزیــك دەکاتــەوە: *لەسـەر گردەکـەوە بـە دووربـین ســەیری ئــەو دەوروبــەرەمان دەکـرد.* ٢- کەسـەك تەماشـای ئایندە بکات لە ژیانیدا: *پیاوێکی دووربینە.*

**دوورگە** (ن.) گزیرتە، گراڤ، شوێنەك کە هەر چوار دەوری ئاو بێت: *کەس بە تەنیا لەم دوورگەیە ناژیت.*

**دووز** (ن.) شارەکی کوردستانە سەر بە پارێزگای کەرکوکە.

**دووزەلــــە** (ن.) جـــۆرە ئــامێرێکی موزیکییــە، قامیشــێکی بــاریکی کورت لەناو قامیشێکی گـەورەتر دەنرێـت، بـە قامیشـە باریکەکـە دەگوترێت دووزەلە.

**دوو ســـبەی** (ئــاک.) دوو بــەیانی، دوو ڕۆژی دی: *دوو ســبەی دەچــمە سلێمانی.*

**دووکەڵ** (ن.) دویکێـل. کـادین، کـادو، کــادی: *زۆری دووکــەڵ ژینگــە پیس دەکات.*

**دووگ** (ن.) دونگ، دوینگ، پاشەڵی مەڕ کە هەمووی بەزە.

**دووگشۆڕ** (ئان.) دوونگ شۆڕ: *بەرخەکە دووگشۆڕە.*

**دوومــــەڵان** (ن.) دومبــەلان، کــارگ، قارچك، ڕووەکێکـە بـەهاران لـە ژێر زەویـدا پەیـدا دەبێـت وەکو

پەتاتە خـواردنێکی خۆشـە: *دوومەلان لە گۆشت گرانترە.*

دوو میسـرەع (ن.) دوو نیـوە دێـڕی یەکسـانن، کـە یـەك بـەیتی هـۆنراوە پێـك دێـنن: ئـەو دوو میسـرەعە یەکسـانن، هـەر یـەکێکیان لـە (٨) برگـە پێـك دێت.

دۆ (ن.) دەو، ماسـتاوی لـە مەشـکەدا ژەنراو: *دۆی دادە ڕژاوە.*

دۆتمـام (ن.) کچـمام، کچـا مـامێ: *دۆتماما مـن ل زانکۆیا دهـۆك دخوینیت.*

دۆخ (ن.) بار، ڕەوش، مادە سێ دۆخی هەیە: ڕەقی، شلی، گازی.

دۆزینەوە (ج.) ڤەدیتن، دیتنەوە، پەیدا کردنـەوە: *کـە ڕێگەکـەمان دۆزییەوە زۆر دڵخۆش بووین.*

دۆسـت (ن.) هـەڤاڵ، هـاوڕێ، برادەر، یـار: *مامۆسـتاکەمان دۆسـتی باوکمە.*

دۆستایەتی (ن.) دوسـایەتی، دۆسـتی، برادەرایـەتی، تـەبایی: *دۆسـتایەتی نێوانمـان زۆر بەهێزە.*

دۆشدامان (ج.) مات و کز دانیشتن، دژ دامـان: *کاکـە بۆچـی وا دۆشدامای؟*

دۆڵ (ن.) ١- شـیو، گـەلی، دەرە، ناوچـەیەکی نزمـایی تەسـك کەوتۆتـە نێـوان دوو ناوچـەی بەرز. ٢- دەهۆڵ: *دۆڵ و زوڕنا لە شاییەکەدا بەکارهێنرا.*

دۆوکە (ن.) کەڕووی سەر گەڵای داری بەردار: *ئەم دار سێوە دۆوکەی گرتووە.*

دهـۆك (ن.)، شـارێکی کوردسـتانە: *دهـۆك بـاژێرەکێ جـوان و ڕەنگینە.*

دی (ئان.) ١- تر، ئیدی، ئیتر، دیکە، کـە. بـە تـەنیا بەکارنایـەت، هـەردەم لەگـەڵ وشـەیەکی دی بـەکاردێت و دەکەوێتـە دوای وشـەکە، وەك جـارێکی دی، ڕۆژەکا دی و....

**دیار** (ئان.) ١– بەرچاو، ئاشكرا، خویا: *بە ئێواران مانگ دیارە.* ٢– ناوە بۆ نێرینە.

**دیـاردە** (ن.) نیشـانە، بەرچـاو، دیـار، ئاشـــکرا: *قـــەڵای هـــەولێر دیاردەیـــەکی ئاشـــکرای شارستانییە.*

**دیـارکردن** (چ.) ئاشـکەرا کـرن، خویـا کرن: ڤەکۆلینان دیار کرییە مرۆڤ ل دەســـتپێکا ژیـــانێ دنـــاڤ شکەفتادا ژیایە.

**دیـــاری** (ن.) خـــەڵات: *مامۆســـتا دیارییـەکانی بەسـەر قوتابیانـدا دابەشکرد.*

**دیـــتن** (چ.) بیـــنین، بـــەدیکردن، ســـەیرکردن، مێزکـــرن: *مـــن بـــە دیتنت دڵشاد بووم.*

دیجلە

**دیجلە** (ن.) دیجلە ڕووبارەکی گەورەیە سەرچاوەکەی لـە بـاکووری کوردسـتان هەڵدەقوڵێت.

**دیدە** (ن.)چاو، چاڤ، چـەم: بـە بینینـی *تۆ دیدەم ڕووناك بوو.*

**دیدەڤان** *(ئان.) ١– دیدەوان، شـاهێد: هەڵۆ دیدەڤانی ڕووداوەکـە بـوو. ٢– پاسـەوان، چـاودێر: سـەرۆ دیدەڤانی خێوەتەکە بوو.*

**دیدەوان** (ئان.) بڕوانە: **دیدەڤان.**

**دیـــرۆك** (ن.) مێـــژوو: *دیـــرۆك تۆمـــارا ڕووداوێن کەڤنە.*

**دیـــــرۆکنڤیس** (ن.) مێـــژوونڤیس، مێـــژوونووس: شــــەرەفخانێ بەدلیسی دیرۆکنڤیس بوو.

**دیکە** : بڕوانە دێ.

**دیکتـــاتۆر**(ئـان.) تـاکڕەو، کەسـەك سـتەمکارو تونـد و تیـژ بێـتو تـەنیا بەقسـەی خـۆی بکـات: *هیتلـەر و مۆسـۆلینی و سـەدام هەرسێك دیکتاتۆر بوون.*

**دیماهی** (ئان.) بڕوانە: **دوماهی.**

**دیمەن** (ن.) ١– وێنە، تەماشاگە، ئـەو شـتەی، کـە بەرچـاو دەکـەوێت، جا چـی سروشـت بێـت، یـان بـە یەکگەیشتنی دوو دۆستو هاوەڵ

بێتو. : *دیمەنی گوندەکەمان لە دوورەوە جوانە*. ٢- ئاوە بۆ مێینە: *دیمەن چوو سەرکانیێ.*

**دیموکراسی** (ن.) دیموکراتی، سیستەمەکی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتە، بە باشترین سیستەم لە جیهاندا ناسراوە، چونکە زۆرینە وڵات بەڕێوە دەبات: *مە دڤێت سیستەمێ دیموکراسی ب سەرکەڤیت.*

**دیو** (ن.) ١- مەڵبەند، ناوچە، بەر: *میوەی دیوی پشدەر بەتامە*. ٢- لا، پێش یان پشتی هەر شت: *کۆشکەکە لە هەردوو دیوی پێشەوەو پشتەوەی باخچەی هەیە*. ٣- ژوور: *خانووەکەمان چوار دیوی تێدایە.*

**دیوان** (ن.) ١- لە (دیو+ان) دارێژراوە بە مانای ژووران دێت، ژووری بەڕێوەبەرایەتی دەزگایەکی دیاریکراو: *وەزیر لە دیوانی وەزارەت دادەنیشێ*. ٢- کتێبی شیعر، کۆمەڵەك شیعری شاعیرەك لە کتێبەکدا: *دیوانی وەفاییم خوێندۆتەوە.*

**دێ** (ن.) گوند، لادێ، دێهات، ئاوایی: *دوای راپەڕین دێیەکانی کوردستان وردە وردە ئاوەدان بوونەتەوە.*

**دێرین** (ئان.) کۆن، کەڤن، کەون، دێر زەمان: کەلا هەولێرێ کەلەکا دێرینە.

**دێم** (ئان.) ١ـ ڕوخسار، سەروچاو، روومەت، روو: *ئەو کچە جوانە دێمەکی شیرینی هەیە*. ٢ـ دێمەکار، دێمی، ئەو ڕووەکەی بە ئاوی باران شین دەبێت: *گندۆرەی دێمی بەتامە*. ٣- تەواو پێڕاگەیشتنی چێشت: *شیوەکەی دێمی هێناوە*. ٤- هاتن: کاری رانەبردووە لەگەڵ کەسی یەکەمی تاك (بکەر) بەکارهاتووە: *بەم زووانە دێم بۆ لای ئێوە.*

**دێمی** (ئان.) بڕوانە: دێم.

ڕابەر (ن.) ڕێبەر، ڕێنیشاندەر، سەرکردە، پێشەوا، پێشەنگ: *ئازاد ڕابەری پۆلەکەمانە.*

ڕابردوو (ئان.) بەسەرچوو، بووری، بەری نھۆ: *سالی ڕابردووش ھەر بەیەکەم دەرچووم.*

ڕابوون (چ.) ھەلستان، ھەلسان، ڕاپەڕین: *لاوێن کورد ژ خەو ڕابوون.*

ڕاپەڕین (چ.) ١- سەرھەلدان، سەرھلدان، ڕاستبوونەوەی گەل دژی حکومەت: *دەستکەوتەکانی ئێستا بەرھەمی ڕاپەڕینەکانی دوێنێیە.* ٢- لە پڕ بلند بوون، ھەستان، ڕابوون، لە خەو ڕاچلەکان: *لەگەل بانگەوازەکە زوو لە خەو ڕاپەڕیم.*

ڕاپرس (ن.) پرسیارکردن، ڕاپرسین، ڕاوەرگرتن: *بۆ پەسەند کردنی دەستوور ڕاپرسییەک پێویستە.*

ڕاپۆرت (ن.) ١- دەرخستن و ڕوونکردنەوەی بیرو ڕا بەرامبەر ڕووداوێک، ھەلوێستێک، دەنگوباسێک و....: *شادان ڕاپۆرتێکی بەنرخی لەسەر مافی مرۆڤ پێشکێشکرد.* ٢- بە خراپە

نووسین لەسەر یەکێك یا بە خراپە باسکردنی یەکێك: *لەسەردەمی بەعسدا راپۆرت نووس زۆر بوون.*

ڕا پێچان (چ.) رامالین، تێکوەرکرن. بۆ وێنە، کە بایەکی توند هەڵدەکات هەرچی لەبەردەمیتی رایدەمالێتو بەزۆری دەیبات.

ڕا پێچکردن (چ.) بە زۆری بردنی یەکێك بۆ شوێنێك، کە شارەزووی لێنەبێت: د ئەنفالاندا کورد راپێچکرنە جهێن نادیار.

ڕاتەکاندن (چ.) راهافێتن، راچڵەکاندن، شەقاندن، راوەشاندن: لەشیرینی خەودا بووم، کە رایتەکاندم.

ڕاخەر (ن.) رایەخ، رائێخ، راياخ، بەڕ، کلێم: *ئەم ژوورە پێویستی بە راخەرەکی جوانوگەورە هەیە.*

ڕادە (ن.) ئەندازە، ئاست، پلە، بڕ: *تا ئەو رادەیە رام لێتە.*

ڕادەبەدەر (ئاك.) بێ ئەندازە، بێ توخیب، بێ سنوور، بەبێ ڕادە: *لە رادە بەدەرگەلی کورد ستەمی لێکراوە.*

ڕادیۆ (ن.) ئامێرێکە بەهۆی کارەبا، یا پاتری دەنگی ئێزگەکانی دنیات پێدەگەیێنێت: ماركۆنی رادیۆیداهێنا.

ڕاڕەو (ن.) رێڕەو، ڕێ، را: *مندالەکە لە خوار راڕەوەکە دانیشتووە.*

ڕاز (ن.) نهێنی، قسە، نەپەنی، سڕ: رازی دڵی خۆت لای کەس مەدرکێنە .

ڕازاندنەوە (چ.) خەملاندن، جوانکردن، تیلدان: بووکەکەیان *جوان رازاندبووەوە.*

ڕازاوە (ئان.) خەملی، جوان، کۆکدار: بە کەسێك *دەگوترێت، کە خۆی جوانکردبێت.*

ڕازونیاز (ن.) هیواو ئاوات، ئامەزرۆیی، نییەت: *کەس لە رازو نیازی من ناگات.*

ڕازیبوون (چ.) رەزامەندی، پێ قایلبوون، پەژراندن: *ئەز ل سەر وی کاری رازیمە.*

**ڕاژاندن** (چ.) ڕاژەندن، لەراندن، بەرەو پێش و پاش بردن، هەژاندن بۆ لانك و جۆلانە، ڕاهژاندن: *دایکم مەرخەریکی ڕاژاندنی لانەی خوشکە بچکۆلەکەمە.*

**ڕاس** (ئان.) ڕاست، پێچەوانەی چەوت: ڕاست و چەوت لێك جیا بکەوە.

**ڕاسبوونەوە** (چ.) ڕاستبوونەوە، هەڵسانەوە لە دوای نەخۆشی یان کەوتن، چاك بوونەوە: *نەخۆشەکە لە ڕاس بوونەوە دایە.*

**ڕاست** (ئان.) بڕوانە: ڕاس

**ڕاستەوخۆ** (ئان.) یەکسەر، ڕاستەو ڕاست، زیندی، دەمودەست: *ئەم بەرنامەیە ڕاستەوخۆ پێشکەش دەکرێت.*

**ڕاستەهێڵ** (ن.) ڕاستەخیچ، هێڵەك بە ڕاستی، زاراوەیەکی بیرکارییە: *ڕاستەهێڵەك لە خالی (أ) بەرەو (ب) بکێشە..*

**ڕاستبێژ** (ئان.) ڕاستگۆ، کەسێکە، کە درۆ ناکات: *مرۆڤی ڕاستبێژ باوەڕی پێدەکرێت.*

**ڕاستگۆ** (ن.) بڕوانە: ڕاستبێژ.

**ڕاستگۆیی** (ن.) ڕاستبێژی: *ڕاستگۆیی مرۆڤ سەردەخات.*

**ڕاستی** (ن.) وەك خۆ گێڕانەوە، بە پێچەوانەی درۆ.

**ڕاکردن** (چ.) ١- ڕۆینی بەتاو، غاردان: *ئازاد بە ڕاکردن هاتە لام.* ٢- هەلاتن، رەڤین: *لە ترسان ڕایکرد.*

**ڕاگەهاندن** (چ.) ١- ڕاگەیاندن، ئاگادارکردنەوە: *کە مەواڵی سەرکەوتنی ڕاگەهاند دڵخۆش بووم.* ٢- میدیا، دەزگای بڵاوکردنەوەی زانیاری بە گشتی.

**ڕاگەیاندن** (چ.) بڕوانە: ڕاگەهاندن.

**ڕاگرتن** (چ.) ١- وەستاندن، هێشتنەوە، گیرکردن، ڕێپێنەکرن: *ڕەورەوەی پێشکەوتن لە کوردستاندا بە کەس ڕاناگیرێت.* ٢-بەخێو

کردن: *دوو منداڵی لای خۆی ڕاگرت.* ٣- دابەستن، بۆ هێندێك ئاژەڵ بەکاردەهێنرێ، واتە بە خێو کردنی ئاژەڵ بۆ مەبەستی کڕین و فرۆشتن.

ڕاماڵین (چ.) ڕادان، ماڵین، گەسکدان، لابردن: *بانیژەکە مەندە بەفری لەسەرکەوتووە پێویستی بە ڕاماڵین هەیە.*

ڕامیاری (ن.) سیاسی: *کێشەی کورد لە بواری ڕامیاریدا بەرەو پێش چووە.*

ڕانکوچۆغە (ن.) شاڵ و شەپك: *ڕانکوچۆغەی هەورامان نایابە.*

ڕانیە (ن.) شارۆچکەیەکە سەر بە پارێزگای سلێمانییە: *ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لە ڕانیە دەستی پێکرد.*

ڕاو (ن.) ١- ڕاو گرتنی باڵندە و گیانداری کێوی و ماسی: *ڕاو وەرزی تایبەتی خۆی هەیە.* ٢- جۆرە نەخۆشییەکی پێستییە کە خەت خەت دەبێ: *دەم و چاوی تووشی نەخۆشی ڕاو بووە.*

ڕاوەستان (چ.) ١- بەپاوە وێستان، هەستانە سەرپێ، ڕابین، ڕابوونە ژ پێڤە: *کە هاتی لەبەردەرگا ڕاوەستابووم.* ٢- لەکارکەوتن، پەککەوتن: *ئۆتۆمبێلەکەم ڕاوەستا.*

ڕاوەشاندن (چ.) ١- ڕاتەکاندن، بادان، شڵەقاندن، شلقاندن، داقوتان، هژاندن: *پێش خواردنەوەی شەربەتی کۆکە، شووشەکە ڕاوەشێنە.* ٢- تێگرتن: *بەرد بۆ هیچ کەس ڕامەوەشێنە.*

ڕاوبۆچوون (ن.) بیروڕا، بیرو بۆچوون: *ڕاوبۆچوونی نوێخوازو کۆنەپەرست وەك یەك نییە.*

ڕاونان (چ.) ڕاهێلان، سەردوینان، هەڵبڕین، سەردەدونان، کەوتنەدوو، دوورخستنەوە، بەزاندن: *شوانەکە گورگەکەی تا ئەو بنارە ڕاونا.*

ڕاوێژ (ن.) تەگبیر، پرس و ڕا، شێرەت: *بۆ ڕاوێژ دەچمە لای.*

ڕاوێژکردن (چ.) تەگبیرکردن، شێرەت کرن: *باپێکەوە ڕاوێژ بکەین داخۆ بچین بۆ سەیران؟*

**ڕاهاتن** (ن.) فێربوون، خوو پێوە گرتن: *من لەسەر ئەو کارە ڕاهاتووم.*

**ڕاهەتی** (ن.) حەسانەوە، راحەتی، تەنایی، بێهنفەدان، ئیسراحەت، پشوو: *لە پاش ماندوو بوون راهەتی پێویستە.*

**ڕاهێنان** (چ.) مەشقکردن، فێرکردن: *ئەم راهێنانەی خوارەوە تەواو بکە.*

**ڕایەخ** (ن.) بڕوانە: ڕاخەر.

**ڕەبەق** (ئان.) تەواو، ڕێك: ئەوە دوو ساڵی ڕەبەقە لە کەرکووك دەخوێنم.

**ڕەپستە** (ن.) ڕپسین، ڕپسە، ئاوەنیا، ئەو دەغڵەیە کە پێشتر زەوییەکەی ئاو دراوەو شۆکراوەو جا تۆی پێوەکراوە.

**ڕەتبوون** (چ.) بورین، دەربازبوون، تێپەڕین، ڕۆیشتن: *پێشمەرگە ئێك لدویف ئێکی ژ ئاڤا زێ ڕەتبوون.*

**ڕەچاوکردن** (چ.) بەرچاو وەرگرتن، بە هێند وەرگرتن، لەبەر چاو گرتن: *ڕەچاوکردنی داخوازی خەڵك شتەکی گرنگە.*

ڕەحەتی

**ڕەحەتی** (ن.) ١- کوفك، ئامرازەکە لەسەر دۆلکە، یان شووشە، یان بوتڵ دادەنرێت تا بە هۆیەوە ئاو، شەربەت، نەوت و...تێبکەن. ٢- خۆشی، شادی: *ئەم نەخۆشییە ڕەحەتی لێهەڵگرتووم.*

**ڕەحیماوە** (ن.) ناوی گەڕەکێکی شاری کەرکوکە.

**ڕەخساندن** (چ.) پەیداکرن، ئێخستنە بەر ئێك، سازکردن، دامەزراندن، جێ بۆ خۆشکردن،

بەرجەستەکرن، هێنانەئارا: *ئەگەر دەرفەتم بۆ برەخسێ زوو زوو دێمە لاتان.*

**ڕەز** (ن.) ١- باخی دار مێوی دێمی: ئەمساڵ ڕەزەکەمان ترێیەکی باشی گرتووە. ٢- باخ و بوستانو چەم: *ڕەزێ مە ئەڤ سالە گەلەکێ ب خەمل بوو.*

**ڕەزڤان** (ن.) ڕەزەوان، باخەوان: *ڕەزڤانی باخی ئاڤدا.*

**ڕەژوو** (ن.) خەڵووز، ڕەژوو، ڕەژی، ڕەژوی: *بۆ کوورەی ئاسنگەری ڕەژوو بەکاردەهێنرێ.*

**ڕەسەد** (ن.) وشەیەکی عەرەبییە، ڕوانگە، ئەو شوێنە بڵندەی دەزگای چاودێری لێیە: *لە بورجی فڕۆکەخانە ڕەسەد بۆ فڕۆکەکان هەیە.*

**ڕەسەن** (ئان.) بنەچە، بنەڕەت: *ئێزدییەکان خەڵکی ڕەسەنی کوردستانن.*

**ڕەسمی** (ن.) وشەیەکی عەرەبییە، فەرمی، بەشێوەیەکی یاسایی: *بە ڕەسمی مافی کورد لە دەستووردا سەلمێنرا.*

**ڕەشەبا** (ن.) هوڕەبا، جۆرە بایەکی توندو تیژو بەهێزە: پێویستە *سوود لە ڕەشەبا وەربگیرێت بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا.*

**ڕەشەکوژی** (ن.) دەست نەپاراستن لە کوشتن، کوشتنی خۆڕایی، بە کۆمەڵ کوشتن: حکومەتەکانی *پێشووتری عێراق چەندین جار ڕەشەکوژییان لە دژی کورد بەرپا کردووە.*

**ڕەشەوڵاغ** (ن.) چێڵ و گا: *لە گوندەکانی کوردستاندا ڕەشەوڵاخت زۆر بەرچاو دەکەوێت.*

**ڕەشتی** (ن.) شەدە، مشکی: باوکم *ڕەشتی لەسەری دەبەستێ.*

ڕەشماڵ

**ڕەشماڵ** (ن.) ڕەشماڵ، کوین، دەوار، تاوڵ: *ڕەوەندەکان لە ژێر ڕەشماڵدا دەژین.*

**ڕەشـۆکی** (ن.) ڕەشوکی، شتێکە، کە زۆر تایبـەتی نـەبێت: بـەدوای شتی ڕەشۆکی مەکەوە.

**ڕەفتــار** (ن.) ئاکـار، مامەڵـە، خـوو ڕەوشـت، هەڵسوکەوت: *مرۆڤـێ باش ڕەفتارێن باش دکەتن.*

**ڕەفتارکردن** (چ.) هەڵسوکەوت نواندن، مامەڵە لەگەڵ کردن: *بۆ تۆ وا جوانە بە باشی ڕەفتار بکەیت.*

**ڕەڤین** (چ.)١- بەزین، هەلاتن، نەمان: *دوژمــن د شــەڕێ بەرگرییێـدا ڕەڤـــین.* ٢- بەدووکـــەوتن، ڕەدووکـەوتن: *ئـەو کـچ دگـەل خورتەکی ڕەڤی.*

**ڕەگ** (ن.) دەمـــار، ڕە، ڕێ، بــێخ: *درەختــی تەمەنـدار ڕەگــی بـە قووڵایی زەویدا دەچێ.*

**ڕەگــەز** (ن.) بنیچـە، بنەچـە، نـەژاد، نقش: *خوداوەندی شاووشکا بە ڕەگەز کوردستانییە.*

**ڕەگو ریشــە** (ن.) ١- بـنج، بنـەڕەت، ڕهـو ریشـاڵ: *بـا پێکـەوە کـار بکــەین بــۆ لــە ڕەگو ریشــە دەرهێنــانی تــیرۆر.* ٢- ڕەگ، دەمار: *ڕەگو ریشەی داری گوێز زۆر درێژە.*

**ڕەنــج** (ن.) زەحمـەت، ئـەرك، ئـازار، خـــەبات: *کـــورد لــە پێنـــاو سەربەخۆیی ڕەنجی زۆری داوە.*

**ڕەنجبەر** (ئان.) ١- ڕەنجدەر، کارکەر: دەروێش عـەلی ڕەنجبەری ئێمـە بوو. ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**ڕەنــدەك** (ن.) گـەڕەك، تـاخ: *ئـەز ل ڕەندەکا شەمیدان دژیم.*

**ڕەنگ** (ن.) ڕەنگ، بۆیاخ، بۆیە: *ئالایێ کوردستانێ چار ڕەنگە.*

**ڕەنگــە** (ئـاك.) دەشــێ، لەوانەیــە، چـێدبیت، دویـر نینـە: *ڕەنگـە ئەمڕۆ بەفر ببارێت.*

**ڕەو** (ن.) سڵەمینەوە، ڕەوینـەوە، ڕەڤ. هێنـدێك جـار ئـاژەڵ لـە ترسـی درنــدان دەســڵەمێتەوەو ڕەوی تێدەکەوێت.

**ڕەوا** (ئان.) شیاو، شایستە، لـەجێ، د جهـێ خـۆدا: *ئـازادی مافـەکی ڕەوایە بۆ هەر میللەتەك.*

**ڕەوان** (ئـان.) ١- ڕەهـوان، پـاراو، خوێندنـەوەی بـێ گـرێو گـۆڵ: *پەخشـانەکەی زۆر بـەڕەوانی خوێندەوە.* ٢- ئەو شتەی لە ڕاکردنو ڕۆیشتندا ڕاناوەستێ: *ئەسپەکی ڕەوانە.* ٣-سکچوون، ئەوەی سکی دەچێ.

**ڕەوانـــدز** (ن.) شارۆچـکەیەکی کوردستانە دەکەوێتە پارێزگەی هـەولێر: *ڕەوانـدز پایتـەختی میرنشینی سۆران بووە.*

**ڕەوانـی** (ن.) ١- پـاراوی، ڕەهـوانی، بڕوانە: ڕەوان.

**ڕەوت** (ن.) ڕێڕەو، ڕێچکە، ڕێ: *ڕەوتـی ڕووداوەکـان بـەرەو باشـی دەڕوات.*

**ڕەوڕەوە** (ن.) حـاجیلۆك، حـەجیلۆك، ئامرازەکی پێچکدارە، لە دار یا پلاستیك دروستدەکرێو منداڵی بۆ ڕۆیشتن پێ ڕادەهێنرێت: *بە ڕەوڕەوە فێری ڕۆیشتن بووم.*

**ڕەوش** (ن.) ١- جـوانیو گەشـایی کوڵمە: *ئەم کچە جوانە ڕەوشی گەشە.* ٢- ئاکار: *دارا ڕەوشی چاکە.* ٣- بارو دۆخ، زەمینە: *ڕەوشـی کوردسـتان بـۆ پێشکەوتنی پیشەسازی لەبارە.*

**ڕەوشـت** (ن.) ئاکـار، ڕەفتـار، هەڵسوکەوت، مامەڵـە: *قوتـابیێ ڕەوشـت چـاك جهـێ ڕێـزا مامۆستایە.*

**ڕەوکردن** (چ.) هەڵاتن، ڕاکردن، ئەگەر پڵنگێـك بکەوێتـە نـاو کۆمەڵـە ئاسـکێك، ئاسـکەکان ناچـار هەڵدێنو لـە بـاری ڕەو کردنـدا دەبن.

**ڕەهوان** (ئان.) بڕوانە: ڕەوان.

**ڕزق** (ن.) ڕزك، جـــرج، جـــورج، جانەوەرەکە لە سمۆرە کچکە تـرەو لـە مشـکیش گـەورەترە: *ڕزقەکە خۆی کردە کونێکەوە.*

**ڕزقو ڕۆزی** (ن.) داهـاتی ژیـان: *ڕزقو ڕۆزیمـان لەسـەر مووچـەی باوکمانە.*

**ڕزگار** (ئان.) ١– دەرباز، قوتار، ئازاد.
(ن.) ٢– ناوە بۆ نێرینە: *ڕزگار کوڕەکێ باشە.*

**ڕزگارکردن** (چ.) دەربازکرن، ئازادکردن، قورتارکردن: *پۆلیسی بەرگری شارستانی منداڵەکەی لە لافاوەکە ڕزگار کرد.*

**ڕزگاری** (ن.) ئازادی، سەربەستی: *داواکارییەکانی گەلی کورد هەمیشە ڕزگاری بووە.*

**ڕژان** (چ.) ڕژیان، کەوتنە خوار لەسەرەوە بۆ خوارەوەی ئاو یان هەر شتەکی دی بێ: *ئاوی پەرداخەکە ڕژا.*

**ڕژێم** (ن.) سیستەم، نیزام، فەرمانڕەوایی، فەرمانڕەویی، کارگێڕی دەوڵەت: *ڕژێمی ئەو دەوڵەتانەی کوردو کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە دان بە مافی کورد دانانێن.*

**ڕستە** (ن.) ١– هەڤۆك، چەند وشەیەکی بەیەکەوە، واتایەکی تەواو دەبەخشن: ڕستە مەزنترین دانەی واتاداری ڕستەسازییە. ٢– ئەو پەتەی کە لەسەریان بە دوو سنگەوە دەکرێ بۆ هەڵواسینی جلی شۆراو، ڕستك: *جل ل سەر ڕستکێ رایێخستن.*

**ڕستن** (چ.) ١– بادانی بەنی خاو و پەمۆ بە تەشی: *ئازاد لە کارگەی ڕستن و چنین کارمەندە.* ٢– چەنەبازی، زۆر قسەکردن: *بەسە ئیدی زۆر مەڕێسە.*

**ڕشانەوە** (چ.) دلڕابوون، ڤەرشیان، ڕشانەڤە، هەلافێتن، هێنانەوەی ئەو خۆراکەی کە خوراوە: *ئەوانەی خواردنی کۆنیان خواردبوو زۆربەیان ڕشانەوە.*

**ڕق** (ن.) تووڕەیی، کەرب، کینە، رك: *ڕق لە هاوڕێیانت هەڵمەگرە.*

**ڕکێڤ** (ن.) ئاو زەنگ، ئەو پێپلیکە ئاسنەی، کە بە هۆیەوە سوار دەچێتە سەر زینی ئەسپ و ماین.

**ڕواڵەت** (ن.) دیمەن، ئەوەی لەبەر چاو، دەموچاو، ڕوخسار : *گندۆرەی بەڕواڵەت جوان مەرج نییە شیرین بێ.*

**ڕواندن** (چ.) چاندن، داچەقاندنی شەتڵ و نەمام و تۆ: *ڕواندنی نەمام پێش نەورۆزێ دەست پێدەكات.*

**ڕوانین** (چ.) ١- سەیركردن، بەرێخودان، تەماشاكردن، مێزكرن، نۆڕین، نوارین. ٢- ناوی ڕۆژنامەیەكی قوتابییانە، لەلایەن یەكێتی قوتابیانی كوردستانەوە دەردەچێت.

**ڕوخسار** (ن.) سەروچاڤ، بچم: دەموچاو، دیمەن، ڕوو: *ماندووبوونەكەی بە ڕوخسارەوە دیار بوو.*

**ڕونیشتن** (چ.) دانیشتن، رنیشتن: *ڕونیشتن ب بێ كار تشتەكێ خراپە.*

**ڕوو** (ن.) بڕوانە: ڕوخسار.

**ڕووان** (چ.) شینبوون، ڕسان: *ئەم دارە لە خۆیەوە ڕواوە.*

**ڕووەك** (ن.) هەرچی لە زەویدا دەڕوێت، لە دارو درەخت و شینایی: *تیشكی ڕۆژ یارمەتی گەشەی ڕووەك دەدا.*

**ڕووەكی سروشتی** (ن.) گژوگیا و دارستانی خۆرسك: *بەڕوو، كە ڕووەكێكی سروشتییە، لە كوردستان زۆرە.*

**ڕووبار** (ن.) چەمی گەورە، زێ، ڕیبار: *سەرچاوەكانی ڕووباری دیجلە لە كوردستانەوە دێن.*

**ڕووبەر** (ن.) زاراوەیەكی ئەندازەییە دەكاتە لا جارانی لا: *ڕووبەری ئەو پارچە زەوییەی كە بە منیان داوە ٢٥٠ مەتر دووجایە.*

**ڕووپاك** (ئان.) ڕووگەش، بە ئابڕوو، بەڕێز: *ئارا كچەكی ڕووپاكە.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**ڕووپەڵ** (ن.) یەك لای كاغەز، لاپەرە، ڕەخ، بەرپەڕ، لاپەڕ، ڕووپەڕ:

نامـەی دکتۆراکـەی برێتییـە لـە (٣٠٠) ڕووپەڵ.

**ڕووت** (ئان.) ڕویت، کۆت، بـێ پۆشاکو بەرگ، تازی، ڕیس: *ئـەم چیایە بۆ ڕووتە.*

**ڕووتانـــەوە** (چ.) بێپەڕوپۆمانـــەوە، قەریچـــکیان، ڕویتبـــوون، قـــژ هەڵوەرین، بێ گـەڵا مانـەوە، لـە بەرپۆکەوتن: *لـە وەرزی پـایزدا دارودرەخت دەڕووتێنەوە.*

**ڕووت و ڕەجـاڵ** (ئـان.) بـێ جلوبـەرگ، ڕووت و قووت، بێ دەرامەت، بـێ دەرەتان: *یارمەتی منداڵە ڕووت و ڕەجاڵەکەم دا.*

**ڕووخـــان** (چ.) ڕمـــان، تێکچـــوون، هـــەرفیان، هـــەرفین: *لافاوەکـە بـووە هـۆی ڕووخـانی چـەند خانوویەك.*

**ڕووخاو** (ئان.) ١- ڕەمیاو، هـەرفتی، کـەوتوو، داڕمـاو، ڕمـاو: *دیـوارە ڕووخاوەکـەمان سـەر لـەنوێ دروســـــــتکردەوە.* ٢- ورە دابـەزیو، ورە نـەماو، بـێ ورە: *مرۆڤـی ڕووخـاو لـە سـێبەری خۆشی دەترسێ.*

**ڕوودان** (چ.) ١- ڕویـــدان، قـــەومان، بەسـەرهات: *بـەهۆی چاککردنی ڕێگـاوبـان ڕوودانـی ئۆتۆمبێـل کەمبۆتـــەوە.* ٢- ڕوو پێـــدان، قسە لەگەڵ کردن، ئـاوڕ لێدان: *زۆر ڕوودان بـە منـداڵ ئـەنجامی باشی نییە.*

**ڕووداو** (ن.) قەوماو، شتێکە لە تـۆ، یـا لـە دەوروبـەری تـۆدا ڕوویـداتو بـەهۆی رادیـۆو تەلـەفزیۆنو... ئاگـاداری زۆربـەی ڕووداوانـی خڕکەی زەوین.

**ڕوو ڕەش** (ئـــــــان.) ڕووی ڕەش، شـــەرمەزار، ئەگـــەر هاوەڵێکـــت کـارێکی ناپەسـەندی لەبەرامبـەر مافی تۆدا کرد، تـۆ بـەڕووڕەشو شـەرمەزار بـووی دەزانیـت، بـێ ئابڕوو: *دوژمنی ڕوو ڕەش بەزی.*

**ڕووزبر** (ئـان.) ڕوی زڤـر، ڕووی شـتێك کە گڕ بێ یان دڕ بێ: *ئەم لبادە ڕووی زبرە.*

ڕووشـــاندن (چ.) رویشـــاندن، ڕنـــین، بریندار کردنی پێست یان لکە دار و شتی تر.

ڕووکـــردن (چ.) ١- رویکـرن، رژانـدنی شتەك لە سەرەوە بۆ خوارەوە: *ئاردەکەی روو کردە کەندووەکە.* ٢- چـوون: لـە تەمـەنی لاویـدا روویکردە دنیای هونەر.

ڕوون (ئان.) ١- ساف، بێگەرد، رۆشن، ئاشکرا، دیار، پێچەوانەی لێڵ: *مەبەستەکەی ڕوونە گرێو گۆڵی تێـدا نییـە.* ٢- (ن.) ڕۆنـی خـواردن و شـت پـێ سـوور کردنـەوە: *بۆ زبارەکـە شـیرێژە ڕوونیان دروستکردبوو.* ٣- شل، پێچـەوانەی تـیر: *ئـەڤ دۆشـاوە کەلەکا ڕوونە.*

ڕوونـــاك (ئـان.) ١- روون، رۆشـــن، رۆنـاك، رۆنـاهی : ژوورەکـەمان زۆر رووناکـە. (ن.) ٢- نـاوی کچانە: *ڕووناك کچەکی دەست ڕەنگینە.*

ڕوونـــاکبیری (ن.) رۆشـــنبیری، رەوشـەنبیری، هزرمەنـدی: بـە *نیـازین ئاوەنـدەکی ڕووناکبیری دابمەزرێنین.*

ڕوونـــاکی (ن.) رونـــاهی، رۆنـــاکی، رۆشـــنی: *کلۆرۆفیـل بارمـەتی گـەڵاکان دەدات بـۆ مـژینی ڕووناکیی خۆر.*

ڕووناکیدانـــەوە (چ.) رۆنـاهی ڤـەدان، رۆنـاهی دانەڤـە: *ئـەم ئاوێنـە ڕووناکی دەداتەوە.*

ڕوووەرگێـــڕان (چ.) ١- پشـــتتێکردن: گیانەکـــەم بۆچـــی ڕووم لـــێ وەردەگێـڕی؟ ٢- ئاوڕدانـەوە، نواڕینـــە پشـــتەوە: تـــا ڕووی وەرنەگێڕا نەمناسی.

ڕویدان (چ.) بڕوانە: ڕوودان

ڕۆحسان (ن.) ریحـان، ڕێحانـە: *ڕێحانـە بۆنی خۆشە.*

ڕۆخ (ن.) لا، رەخ، قەراغ، لێوار، کەنار، دەم، دەو: *ڕۆخی ڕووبارەکە ئـاو و هەوایەکی فێنکی هەبوو.*

**ڕۆخانـــە** (ن.) چۆم، بەست، لایەنە، بەستێن: *ئاو ببڕێت لە ڕۆخانە خزم باشترە لە بێگانە (پەند).*

**ڕۆچوون** (چ.) هاتنە خارێ، هاتنەخوار، داچوون، قوپان، تێکچوون، داتەپین: *زەوییەکە نەختێ ڕۆچووە.*

ڕۆبۆت

**ڕۆبۆت** (ن.) ئامێرەکە لە شێوەی ئادەمزاد دروستکراوە، کۆمپیوتەرێکی بچووکی تێدا هەیە بۆ ئەوەی ئەو کارانە ئەنجام بدات، کە پێویستە بینوێنێت.

**ڕۆژ** (ن.) ١- ماوەی نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، بەرامبەر شەو: *سێ ڕۆژ بەر لە ئێستا گەڕامەوە.* ٢- خۆر: *گۆی زەوی بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێتەوە.*

**ڕۆژانـــە** (ئاك.) ١- هەموو ڕۆژێ، ڕۆژبەڕۆژ: *ڕۆژانە سەرەدانا مەقالان دکەم.* ٢- (ن.) کرێی ڕۆژانە، خەرجی: *ڕۆژانەکەم هەزار دینارە.*

**ڕۆژئاوا** (ن.) ئەو جهێ کو ڕۆژ تێدا ئاڤا دبیت: *من چەند وڵاتێکی ئەورووپای ڕۆژاوام بینیوە.* ٢- (ئاك.) کاتی ڕۆژئاوا بوون، خۆرنشین، خۆر ئاوا: *دیمەنی ڕۆژئاوا بوون زۆر جوانە.*

**ڕۆژباش** (ن.) ڕۆژا تە پڕ خێر بی، دابونەریتەکی سڵاو لێکردنە: *ڕۆژباش وەڵامەکەی گیان باشە، یا هەر ڕۆژباشە.*

**ڕۆژ بەڕۆژ** (ئان.) ڕۆژانە: *ڕۆژ بە ڕۆژ سەر لە دایكو باوکم دەدەم.*

ڕۆژژمێــر (ن.) سالنامە: *ڕۆژژمێرەکـی چاکم کڕیوە.*

ڕۆژگار (ن.) سەردەم، زەمانە، چەرخ: *لـە ڕۆژگـاری ئـەمڕۆدا زانسـت چەکی سەردەمە.*

ڕۆژنامە (ن.) غەزەتە، ڕۆژنامە، چەند لاپەڕەیەکـە، کـە دەنگوباسـی تێدایە: *دوێنـێ ئـوا دەنگوباسـی تۆپێنم لە ڕۆژنامە خوێندەوە.*

ڕۆژنامەگــــەر (ئــان.) ڕۆژنامـــەڤان، ڕۆژنامـەنووس، ئـەوەی بـەکاری ڕۆژنامەوانییەوە خەریکە.

ڕۆژنامەگـــــەری (ن.) ڕۆژنامـــەڤانی، ڕۆژنامـــــــەوانی، کـــــاری ڕۆژنامەنووسـی: مـن لـە مـەیانی ڕۆژنامەگەریدا کار دەکەم.

ڕۆژهەلات (ن.) ١- خـۆر هـەلات، ئـەو کاتـــەی خـــۆر دەردەکـــەوێت: لەگەڵ ڕۆژهەلاتدا دەچم بۆ سـەر کار. ٢- یەکەکە لە ئاراستەکان، ئەو شوێنەی ڕۆژی تێدا هەڵدێ: *ئێـــران کەوتۆتـــە ڕۆژهـــەلاتی عیراقەوە.*

ڕۆژهەلاتناس (ن.) کەسەکی شارەزایە لـە بـواری کاروبـاری ڕۆژهـەلات: *ڕۆژهەلاتناســــان زۆر باســـــی کوردیان کردووە.*

ڕۆژی (ن.) ڕۆژوو، دەم لـــە خـــواردن و خواردنـــەوە گرتنـــە لـــەپێش ڕۆژهـەلاتن تـاکو خۆرئـاوابوون : *سوبەینێ بە ڕۆژی دەبم.*

ڕۆژیگــر (ئـان.) ڕۆژووگـر، کەسـی بـە ڕۆژوو: *مرۆڤەکی ڕۆژیگرە.*

ڕۆشـــــنایی (ن.) ڕۆنـــاهی، ڕووناکی، ڕووناکـایی: *هــەر لـــە دوورەوە ڕۆشناییەك لە ئاواییەکـەدا دیار بوو.*

ڕۆشنبیر (ئان.) ڕەوشەنبیر، ڕووناکبیر، هزرمەنـد، خوێنـدەوار: *ئــەوزاد قوتابییەکی ڕۆشنبیرە.*

ڕۆشـــــنبیری (ن.) ڕوونـــــاکبیری، ڕەوشــــەنبیری، هزرمەنـــدی: *وەزارەتـی ڕۆشەنبیری بە بۆنـەی ڕۆژی منداڵەوە ئاهەنگەکی ساز کرد.*

**ڕۆشیان** (چ.) داڕووشان: *لە دارەکە بەربوومەوە دەستم ڕۆشیا.*

**ڕۆکێت** (ن.) مووشەک: *چەند ڕۆکێتێک بەر شارەکەمان کەوت.*

**ڕۆڵ** (ن.) وشەیەکە لە زمانی ئینگلیزییەوە هاتۆتە ناو فەرهەنگی کوردی بەمانای دەور، کەسێك لە بوارێکی دیاریکراودا چالاك بێت‌و کاریگەری هەبێت: *مامۆستا ڕۆڵی لە پێگەیاندنی قوتابیدا هەیە. کێ ڕۆڵی کێلە پیاوی بینی؟*

**ڕۆڵە** (ن.) جگەرسۆز، جگەرگۆشە، منداڵ، زۆرجار دایکوباوك منداڵەکانیان بە ڕۆڵە بانگدەکەن.

**ڕۆن** (ن.) بڕوانە: ڕوون.

**ڕۆندار** (ئان.) تیشکدەر، ڕۆناهیکەر: *لەناو باریکا ڕۆندارەکی زۆریان داناوە.*

**ڕۆیشتن** (چ.) چوون، نەمان لە شوێنەك: *ڕۆیشتنی بە پێ وەرزشەکی باشە.*

**ڕیان** (چ.) دەرهاقێتن، ڕیتن، پیساییکردن: ئەو منداڵە زوو زوو دەچێتە سەر ئاودەست، زوو زوو دەڕی.

**ڕیخۆڵە** (ن.) ریڤیك،ڕویڤیك، ڕیویەکانی ناو سك: ئادەمیزاد دوو جۆرە ڕیخۆڵەی هەیە، ئەستوور و باریك.

**ڕیخۆڵە ئەستووورە** (ن.) ڕویڤیکا ستوێر.

**ڕیخۆڵە باریکە** (ن.) ڕویڤیکا زراڤ: *ڕیخۆڵە باریکە کە هەو دەکا بە ئازارە.*

**ڕیش** (ن.) ڕه، ڕدێن، مووی ڕووی پیاو: *ئەو هەموو بەیانییەك ڕیشی دەتراشێت.*

**ڕیشاڵ** (ن.) ١- ڕیشال، پارچەی باریك لە قوماش، بزگوڕ. ٢- وردە ڕەگی ڕووەك.

**ڕیشە** (ن.) ڕیشوو، ڕەگ، بنج، بنچینە.

**ڕیشەکێش کردن** (چ.) بنبڕ کردن، لەڕیشەدەرهێنان، قەلاچۆکردن، قڕکردن: *لە کوردستاندا نەخۆشی ئیفلیجی منداڵان ڕیشەکێش کراوە.*

ڕیشــــوە دەرچــووەکان (ن.) ریشــالێن دەرکـــــەفتی، خمخمکـــــێن دەرکەفتی.

ڕیشـــــوەکەوانە (ن.) ریشــالا کڤانــە، خمخمکا کڤانە، خمخمك.

ڕیشوەهۆدە (ن.) ریشالا ناڤخۆ

ڕیشوو (ن.) ریشــە، داو، مــووی بــادراو، خاو بووەوە، ریس: *جامانەکەی ریشوەدارە.*

ڕیشـــۆڵە (ن.) ١- باڵندەیــەکی ڕەشــی بچکۆلەیە، رەشوێرە، رەشوێلە: *ڕیشـــۆڵەکان مــــەلفرین.* ٢- گلەســەر، جــۆرە گلەکــە هەنــدێ خەلك سەری پێدەشۆن.

ڕیوەڵــــە (ئــان.) زەردەوە بــووی لاواز، زەرپەتخی: منالەکە تووشی کەم خۆراکی بووە بۆیە ڕیوەڵەیە.

ڕێبـــــار (ئــان.) ڕێبــوار، ڕێــوار، ریــار، گەشتیار: *ڕێبارەکە ماندوو بوو.*

ڕێبـــوار (ئـان.) رێڤینــگ، بەڕێداچــوو، گەشــتیار: *ئالبەنــد مێژانڤانــەکێ ڕێبـوار بـوو.* بــە ڕێبـواری بێــرە تێپەڕی.

ڕێــــڕەو (ن.) ســەمت، رێبــاز، رێچــوون، جۆبـــار، رێبـــار، ئاراســـتەی رۆیشـتن: *دوای ئاشـکرا بوونیـان ڕێڕەوی خۆیان گۆڕی.*

ڕێڕەوی داخراو (ن.) سەمتا داخستی.

ڕێز (ن.) قەدر، حورمەت، پایــەن: هــەر کەسەو ڕێزی خۆی هەیە.

ڕێـــزان (ئـان.) ١- رێنــاس، شــارەزای رێگــا، بەڵــەد: *ئــەو ڕێزانــەکی دیـــاری ناوچـــەکەیە* (ن.) ٢- ناوچــە: *نــاوی ئەو گونــدێن لــە کوردستان.* ٣- ناوە بۆ مێینـە: *ڕێزان قوتابی پۆل ستیەمە.*

ڕێــزدار (ئـان.) بــەرێز، پایــەدار، خــودان قەدر: مامۆستا مرۆڤەکێ ڕێزدارە.

ڕێزگـــــــرتن (چ.) مامەڵــــەکردن بــــە گفتوگۆی گونجاو، قــەدر گرتن: *ڕێزگرتنی مرۆڤی گەورە ئەرکە.*

ڕێزلێنان (چ.) تۆ ڕێز و پایە لە یــەکێك دەنێیت، کە بە کەســەکی باشـت زانی.

ڕێژاو (ن.) تاڤگە، سیلاڤ: *ڕێژاوی گـەلی عەلی بەگ جوانە.*

**ڕێژنە** (ئان.) تاو، تاڤ، بارانی بەگوڕ: *بارانەکی بە ڕێژنە دەبارێت.*

**ڕێژگــە** (ن.) سەرچاوە، سەروکانی، چاڤکانی، جێگای لێوە ڕژانی ئاو: *ڕێژگەی رووباری دیجلە لە سەرەتاوە لە کوردستانە.*

**ڕێسا** (ن.) بنواشە، یاسا، ریّو شوێنی دیاریکراو: *پابەند بوون بە ڕێسای هاتوچــۆ ئــەرکێکی نیشتمانییە.*

**ڕێــك** (ئــان.) ١– دروست، تەواو، گونجاو: *قسەکەی ڕێك لەجێی خۆی بوو.* ٢– قۆز، کۆك، پۆشتە: *کوڕێکی زۆر ڕێکە.* ٣– بیّ قۆرت، راست، بیّ تاسەو گرێ: *ڕێگایەکی ڕێکە.* ٤– ڕێگە، ئێدی: *ب ڕێکا وەدا ناچم.*

**ڕێکەوت** (ن.) ١– بەروار، هەلکەوت: *بە بۆنەی ڕۆژی جیهانی منداڵان لە ڕێکەوتی ٦/١ دا پێشەنگایەك بۆ بەرهەمی منداڵان کرایەوە.* ٢– هەل: *بە ڕێکەوت یەکترمان بینی.*

**ڕێکخــراو** (ن.) دەسته، کۆمەڵەیەك، دەزگا، کۆمەڵەیەك بۆ کار ڕێکخستن: *ڕێکخراوی کەم ئەندامان گرنگی بە کەم ئەندامان دەدات*

**ڕێککــەوتن** (چ.) گونجان، ڕێکەوتن، ڕێککەفتن: *ڕێککەوتن بۆ کورد مایەی سەرکەوتنە.*

**ڕێککەوتننامــە** (ن.) پێکهاتن، گەلاڵە نامەی پێکهاتن، بڕیارنامە.

**ڕێکوپێك** (ئان.) ب سەرو بەر، سازو گونجاو، پوخت: *ئەز گەلەك حەژ ڕێك و پێکیێ دکەم.*

**ڕێگـــا** (ن.) ١– ریّ، ڕێگە، ڕێك: *ڕێگایەکی دوورو درێژمان بڕی.* ٢– رچە، شوێن پیّ: *ڕێگای باوکی گرتووە.* ٣– شێوە: *بە چەند ڕێگایەك چارەسەر دەکرێت.*

**ڕێگاگرتن** (چ.) لەمپەر دانان، ئاستەنگ دانان، بەربەست دانان، ڕێگرتن، چەتەیی، ڕێبڕیکردن، بوارنەدان،

ڕێگە پێنەدان: نەمانتوانی بچینەوە چونکە ڕێگاکەیان گرتبوو.

**ڕێگر** (ئان.) ئەوە کەسەیە، کە ڕێگەت نادات، ئەو ڕێگەیە ببڕیت، کە گرتووتە بەر، کورد بەو کەسانە دەڵێت: جەردە، چەتە.

**ڕێگری** (ن.) جەردەیی، چەتەیی، ڕێبڕی.

**ڕێگاوبان** (ن.) ڕێو بان، ڕێگاکانی هاتوچۆ: *زۆربەی گوندەکان ڕێگاو بانیان بۆ کراوە.*

**ڕێگۆڕین** (چ.) ڕێ گوهۆڕین، لادان، وازهێنان.

**ڕێنمایی** (ن.) ڕێنوێنی، ئامۆژگاری، ئاراستە کردن، ڕێ پیشاندان، ڕێنیشاندان: *ڕێنماییەکانی لە شوێنی خۆیدا بوون.*

ڕێوی

**ڕێوی** (ن.) ریڤی، ریوی: *ڕێوی گیانداڕێکی گۆشت خۆرە.*

**زاخـــۆ** (ن.) زاخـۆ شـارەکی جـوانی کوردستانە دەکەوێتە پارێزگەی دهۆك.

**زار** (ن.) بڕوانە: دەم، دەو.

**زاراوە** (ن.) شێوە زار، دیالێکت. زمانی کــــــوردی لــــــە دوو زاراوەی ســــەرەکی: کرمـــانجی ژووروو (بـاکوور) و کرمـــانجی خـــواروو پێکــدێت، هـــەروا دوو زاراوەی لاوەکـیش لـە زمـانی کوردیـدا هـەن، کـە بـریتین لـە زاراوەی هـەورامیو زاراوەی لـوڕی. ئـەم لێکدانـــــــەوەی ئێســـــــتا دەیخوێنیتـــەوە بـــە کرمـــانجی خواروو نووسراوە.

**زارڤـــەکرن** (ج.) لاسـاییکردن، لەچـاو کردنـــەوە: *زارڤـــەکرن کــارەکێ مونەرییە.*

**زارك** (ن.) دەرۆك، دەم، دەو، دەڤ: *زارکی گونییەکە باش ببەستە.*

**زاروکێتـــی** (ن.) زارۆکـی، بچـووکاتی، منـدالێتی: هـەر ژ زاروکێتـی یـێ کورد پەروەربوو.

**زارۆك** (ن.) بچـــوویك، زاروو، منـــداڵ، منالّ: *زارۆکێن مە زیرەکن.*

**زارۆنـــۆ** (ن.) مندالّینـــە، لـــە بـــاری بانگکردندایـە: *زارۆنـۆ وەرن بـا یاری بکەین.*

**زاگرۆس** (ن.) زنجیره چیایەکی بەرزە لە قەفقاسیاوە تا کەنداو، کە چیاکانی کوردستان دەگرێتەوە. ئەم نێوە لە نێوی خێڵی سەنگەر کەرتای مادەکان هاتووەو ئەم زاگرۆتیانە لە ناوچەی هەولێر نیشتەجێبوون.

**زاڵ** (ئان.) سەرکەفتی، شیایی، سەرکەوتوو، خاوەن دەسەلات

**زاڵبوون** (چ.) سەرکەوتن: *زاڵبوون بەسەر دوژمن پێویستی بە خەباتکردن هەیە.*

**زاڵم** (ئان.) زۆردار، ستەمکار: *وەریسکێ زاڵمی بێ کورتە.*

**زام** (ن.) برین: زامەکەی سووکە.

**زامار** (ئان.) زامدار، بریندار: *زامارەکەیان زوو گەیاندە نەخۆشخانە.*

**زامدار** (ئان.) بڕوانە: زامار.

**زان** (چ.) منداڵ بوون، کرداری زاوزێ کردن، زایین: *بزنەکەمان ئەمڕۆ زا.*

**زانا** (ئان.) ١- شارەزا، تێگەشتی: برایەکەی زۆر زانایە ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**زانست** (ن.) زانیاری، زانین: هەر بە *زانست پێشدەکەوین.*

**زانستگە** (ن.) زانکۆ، دانیشگا، زانستگا، فێرگەی بەرز، قۆناخی خوێندنی بالا: *براکەم لە زانستگەی کوردستان دەخوێنێت.*

**زانستی** (ئان.) ١- بابەتی ماتماتیك، کیمیا، فیزیك، ئەندازیاری و... دەگرێتەوە: من لە *پۆلی شەشی زانستی دەخوێنم.* ٢- هەر لێکۆڵینەوەیەك لەسەر زمان، مێژوو، ئەدەب... بکەیت دەڵێن بە شێوەیەکی زانستی نووسیویەتی و شیکردۆتەوە.

**زانستی پەتی** (ن.) زانستی رووت: *ئێمە تەنیا زانستی پەتی ناخوێنین.*

**زانکۆ** (ن.) بڕوانە: زانستگە.

**زانیاری** (ن.) زانین، زانست: *زانیارییەکی باشی لەبارەی کۆمپیوتەر هەیە.*

**زاوزێکردن** (چ.) مشەبوون، زۆربوون، زێدەبوون، وەچە پەیداکردن، وەچەخستنەوە: *هەندێك لە*

*گیانـــداران بـــە زاوزێکـــردن زۆر دەبن.*

زایەڵــــــە (ن.) ١- دەنگدانـــــەوە، دەنگڤـــەدان: *مەرگەســـاتی مەڵەبجـە زایەڵەیـەکی جیهـانی مـەبوو.* ٢- دەنگـی شـیوەن و گریـان، زێمـار. ٣- دەنگـی زەنگ و سەنتوور.

زایین (چ.) ١- زان، بوون، منداڵبوون. ٢- زاینـــی، ســـاڵی زاییـنـــی، مەبەست لە هاتنی ساڵێکی نوێ.

زەبــــەلاح (ئـان.) گـەورە، مـەزن، کەڵەگـــەت، چـــوار شـــانە، لەندەهۆر.

زەبـــر (ن.) گـــورز، لێـدان: *زەبـر بەدەسـتەکان گـورزی کاریگـەر دەوەشێنن.*

زەبـروزەنگ (ن.) هێـز بـەکارهێنان لـە حوکمکردنـــدا. تونـــدو تیـــژی: *زمانی زەبروزەنگ لـەناو گـەلانی پێشکەوتوو نەماوە.*

زەحمەت (ئان.) دژوار، سەخت، رەنـج: *من زۆر زەحمەتیم دیوە.*

زەر (ئـــان.) زەرد : *پـــایزان رەنگـــێ بەلگێن داران زەر دبن.*

زەرد (ئان.) بڕوانە: زەر.

زەرداو (ن.) زراڤ، زراو، ئەنزیمـەکی نـاو لەشی مرۆڤە.

زەردە (ن.) ١- بشکوڕین، زەردەخەنە، پێکــەنینی بێـــدەنگ، بـــزە، خەندە، مسکە: *کچەکە زەردەی لەسەر لێوان بوو.* ٢- تیشکی تاو لە بەرەبەیان و ئێوارەدا: *بە نیازین لەگەڵ زەردەپەڕ بگەینـە لای ئێـوە.* ٣- نـاوی چیایەکی بـەرزەو ناوچـەی قـەرەداغ لـە گەرمیان جیا دەکاتەوە.

زەردەخەنە

زەردەخەنە (ن.) بڕوانە: زەردە.

زەردەڵوو (ن.) هـەڵووژە پـایزەی زەرد، مژمـــژە، قەیســـی: *زەردەڵـــوو میوەیەکی بەتامە.*

**زەردێنە** (ن.) ١- زەرک، زەردایی ناو هێلکە: *من تەنها حەزلە زەردێنەی هێلکە دەکەم.* ٢- نەخۆشییەکە: *منداڵەکە تووشی نەخۆشی زەردێنە بووە.*

**زەرزەوات** (ن.) سەوزەوات، کەسکاتی: *زەرزەوات خواردن پێویستە.*

**زەری** (ن.) ١- پەری جوان. ٢- ناوە بۆ ڕەگەزی مێ: *زەری دەچێت بۆ قوتابخانە.*

**زەریا** (ن.) ئۆقیانۆس، لە دەریا گەورەتر: *سێکوچکەی بەرمۆدە لە زەریای ئەتڵەسییە.*

**زەڤی** (ن.) زەوی، عەرد، هەرد، خاك، زەمین: *مە زەڤیەکا مەزن کێلا.*

**زەڵکاو** (ن.) گەڕ، گۆم، باتلاغ، زۆنگاو: *زەلکاو سەرچاوەیە بۆ زۆربوونی مێش و مەگەز.*

**زەماوەند** (ن.) شایی، شەهیانە، داوەت، ئاهەنگ: *بۆ گواستنەوەی بووکەکە زەماوەندەکی گەورەیان ڕێکخستبوو.*

**زەمین** (ن.) بڕوانە: **زەڤی.**

زەنگ

**زەنگ** (ن.) ١- زەنگڵ، زەنگوڵە: *کە زەنگ لێیدا دەبێت هەموومان بچینە ژوورەوە.* ٢- ڕۆنی تواوە: *میزە زەنگەکیان بە دیاری بۆ هێنابووین.*

**زەنگەنە** (ن.) هۆزەکی کوردە لە سنووری پارێزگای کەرکووك.

**زەنگین** (ئان.) دەوڵەمەند، هەبوو، خواپێداو: *شێرکۆ بازرگانەکی زەنگینە.*

**زەهر** (ن.) ژەهر، ژار: *دووپشك و مار گیانەوەری زەهردارن.*

**زەوتکردن** (چ.) داگیرکردن، دەستبەسەرداگرتن، زەفتکردن: *داگیرکەر خەریکی زەوتکردنی ماڵ و سامانی وڵاتە.*

**زەوی** (ن.) بڕوانە: زەڤی.

**زیارە** (ن.) هەرەوەز، گەلکاری: *زیارە نیشانەی هاوکاریی و یارمەتیدانە.*

**زبـان** (ن.) ١- زمـان، ئەزمان، زمـانی ئاخـافتن. ٢- ئەنـدامی چەشـتن لە مرۆڤدا.

**زبــر** (ئـان.) زڤـر، گـڕ، درشـت، دڕ: *ئەوەی بە پێخواسی بگەڕێت بنی پێی زبر دەبێت.*

**زبڵ** (ن.) پیسایی و پڕوپووش کە لەماڵ وەدەر دەنـدرێ، گڵێش، خـۆڵ: *دەبێت زبڵ فڕێ بدرێتـە شوێنێی تایبەتی خۆی.*

**زبڵدان** (ن.) گوفەك، گویفك، زبڵخانە: *چارەنووســـی دکتاتۆرەکـــان زبڵدانی مێژووە.*

**زرەو کوت** (ن.) لێدانی زۆر، زرمـی زۆر، دەنگـی بـەرز: *زرەو کوتـە لـەو کورەپانە.*

**زریــزە** (ن.) زنجـیری بچـووك و باریـك، زنجیرك: *دایکم زریزەی زێڕی بۆ کڕیم.*

**زڕ** (ئان.) ١- خڕش، درەختی بـێ بـەر وەك داری سنەوبەر و کالیپتۆس. ٢- شـــــتی وشـــــك: *قەرەچەڵتووکەکە زڕ بووە.* ٣- خۆهەڵکێشـانی بـە درۆ: *ئـەم قسانە زڕن.* ٤- خوشـك یا برا کـە لـە یـەك دایك و بـاوك نـەبن، دەڵێن زڕ خوشك و زڕ برا هـەروا باوك یان ژن منداڵەکەی لە خۆی نەبێت دەڵێن زڕ بـاب و زڕ دایـك: *دایکەکـــە زڕ منداڵەکـــەی زۆر خۆشدەوێت.*

**زڤر** (ئان.) بڕوانە: زبر.

**زڤــڕین** (چ.) گەڕانــەوە، ڤەگــەڕیان، سووڕانەوە: *ئەزل بەرو پشتێن قوتابخانا خۆ زڤڕیم.*

**زڤڕینەڤــە** (چ.) گەڕانــەوە: *قوتـابی ژ سەیرانێ زڤڕینەڤە.*

**زڤســــتان** (ن.) زســــتان، زمســــتان، وەرزەکێ ساڵێیە دکەڤیتە دویڤ پـایزێ و بـەرێ بهـارێ: *زسـتان وەرزی بەفر و بارانە.*

**زلهێز** (ئان.) بەدەسەلات، خاوەن هێزی زۆر، گەورە هێز.

**زمان** (ن.) بڕوانە: زبان.

**زمانەوان** (ئان.) شارەزای بواری زمان، زمانزان: *من باوکم زمانەوانە.*

**زمان بەد** (ئان.) ئەزمان پیس، خەبەر بێژ، جنێو فرۆش: *منداڵی زمان بەد خۆشەویست نییە.*

**زمان شیرین** (ئان.) قسەخۆش، ئەزمانخۆش: *منالی زمان شیرینم خۆش دەوێت.*

**زمان گرتن** (چ.) لاڵ، ئەوەی زمانی دەگیرێ لە قسە کردندا: *کوڕەکەم لە منالییەوە زمانی دەگیرێ.*

**زنجیرە** (ن.) یەك بەدوای یەك: *لوتکەی هەلگورد لە زنجیرە چیاکانی حەسارۆستدایە.*

**زویر** (ئان.) زیز، سڵبوون، بوسیدەبوون، نیگەران، زوێر، پەرێشان: *مرۆڤ نابێت لە برادەرەکانی زویر بێت.*

**زوو** (ئان.) بە پەلە، زوی، زی، بەخێرایی، خێرا، زویکا، یەکسەر: *بە شەو زوو بنوو تا بەیانی زوو هەلبستی.*

**زوورگ** (ن.) گرد، گر، پان، زویرك، تەپۆلکەی رووت لە دەشتدا، زوران: *لە ناوچە زوورگاوییەکانی کەرکووکدا نەوت زۆرە.*

**زۆپا** (ن.) سۆپە، جۆرە ئامێرەکی گەرمکەرەوەیە: *ئێستاش لە گوندەکاندا زۆپای دار بەکاردەبردرێت.*

**زۆر** (ئان.) گەلەك، فرە، گەلێك، پڕ: *ئەمساڵ بارانەکی زۆر باری.*

**زۆرانبازی** (ن.) زۆرەوانی، هەڤرکی، ملانێ، ململانێ: *ئەم دوو پاڵەوانە زۆرانبازی دەکەن.*

**زۆربە** (ئان.) بەشی زۆری، زۆرینە، بەهرا پتر: *لە نەورۆزدا زۆربەی خەلك دەچنە دەشت و دەر.*

**زۆربوون** (چ.) مشەبوون، زیاد بوون: *گوڵ ئەندامی زۆربوونە لە رووەکدا.*

زۆردار (ئان.) ستەمکار، چەوسێنەر، مافخۆر: *مەمووبان مەولّ دەدەین بۆ لەناو بردنی زۆردار.*

زۆرداری (ن.) ستەمکاری: *گەلەك زۆرداری ل کوردان هاتیە کرن.*

زۆرینە (ن.) زۆربەی هەرە زۆری، زۆربە: *زۆرینەی خەلّکی کوردستان لە راپەریندا بەشدارییان کرد.*

زۆزان (ن.) کوێستان، هاڤین هەوار، هەوارگە، فەراشین: *زۆزانێن کوردستانێ گەلەك دلڤەکرن.*

زۆنگاو (ن.) گۆماو، گەراڤك، ئەو چاڵەی کە ئاوی تێدا پەنگ دەخواتەوەو رادەوەستێ.

زیاخۆری (ج.) زێدەخوارن، زیاد خواردن، زیادەخۆری: *زیا خۆری کارەکی نا تەندروستییە.*

زیان (ن.) زەرەر، خرابی، بێخێری: *زیانێ نەگەمینە کەسێ.*

زیانبەخش (ئان.) زیاندار، زەرەر بەخش: *جگەرەکێشان بۆ مرۆڤی زیانبەخشە.*

زیاندار (ئان.) زیانبەخش: *مێشرو مەگەز زیاندارن.*

زیپکە (ن.) پرسك، جۆرە قینچکەیەکە لەسەر پێست پەیدادەبێت.

زیرەك (ئان.) ١- ژیر، هۆشمەند، زیت، چەلەنگ، چاوکراوە، زرنگ، چاپووك: *ئەرکچێکی زیرەکە.* ٢- ناوە بۆ نێرینە: *زیرەك نیگارکێشەکی بەرچاڤە..*

زیرەکی (ن.) ژیری، هۆشمەندی، چەلەنگی، چاپووکی، چاو کراوەیی.

زیندان (ن.) بەندیخانە، زینان، حەپسخانە، گرتیخانە: *تاوانبارەکان خرانە زیندانەوە.*

زیندانی (ئان.) گیراو، حەپسکراو، بەندی، کەسەك لە زینداندا بێت:

زیندەوەر (ن.) گیانلەبەر، گیانەوەر، بە گیان.

زیندوو (ئان.) ١- زیندی: *باڵندەکە مێشتا زیندووە با فریای کەوین.* ٢- راستەوخۆ، ئێکسەر، زندی،

بۆ بەرنامەی تەلەڤزیۆن و سەتەلایت و رادیۆ.

**زیو** (ن.) زیڤ، جۆرە کانزایەکە: *زیویش وەکو زێڕ ڕەنگ ناگرێت.*

**زێ** (ن.) جۆگە ئاوی گەورە، رووبار، رووبار، جۆمی گەورە: *زێی گەورە لە هی بچووک درێژترە.*

**زێبار** (ن.) ناوی دەڤەرەکی کوردستانە.

**زێبارۆك** (ن.) ناوی گوندێکە نزیك شەقلاوەیە: *لە زێبارۆك لەدایکبووم.*

**زێد** (ن.) خاکی باو و باپیران، نیشتمان، شوێنەکە کە بەردەوام تێیدا بحەوێیتەوە.

**زێدە** (ئاك.) زیاد، زۆر، پڕ: *ئاڤا بن ئەردی ب بەفرێ زێدەدبیت.*

**زێدەبوون** (چ.) زیادبوون، زۆربوون، پڕبوون، مشەبوون: *گەلەك بارینا بەفرو بارانان دبیتە ئەگەرا زێدە بوونا ئاڤا کانی و رووباران.*

**زێرەڤان** (ن.) پاسەوان: *زێرەڤان هێمنی دەپارێزێت.*

**زێرەڤانی** (ن.) پاسەوانی: *هێزی زێرەڤانی بەرپرسە لە پاراستنی سنووری وڵات.*

**زێڕ** (ن.) ئاڵتوون، کانزایەکی بەنرخە: *پەندی پێشینان وەك زێڕ بە نرخە.*

**زێهن** (ن.) زەین، بیر، هۆش: *زێهنا خۆ بدەنە دەرسێ.*

**ژ** (ئام.) له: *ئەز ژ قوتابخانێ دمێمەڤە.*

**ژاڵـه** (ن.) ١- نـاوی ڕووەکـەکی تاڵـه، بەڵام گوڵەکەی جوانه. ٢- نـاوی گوندێکه لـه سـنووری پارێزگـای سلێمانی. ٣- ناوه بـۆ رەسـەنی مێ.

**ژان** (ن.) ئـێش، ئـازار: *ژانـا ددانـی کەلەکا دژواره.*

**ژاوەژاو** (ن.) قیرەقـیر، کارەگـار: ئـەم *ژاوەژاوه له پێناوی چییه؟*

**ژەم** (ن.) جـەم، نـانخواردن: *ژەمـەکی خۆش بوو.*

**ژەنـین** (چ.) لێـدان: *شمشـاڵ ژەنـین هونەره.*

**ژ بەر** (ئام.) جگه له، ل جهـێ، ل بـەر: *ژ بەر تە نەبا ئەز نەدهاتم.*

**ژبەرکو** (ئام.) لەبەر ئـەوەی، چـونکی، چـونکو: *رژێمـا شـای ئیرانـێ پێشەوا قازی محەمەد ل سێدارێ دا ژ بەرکو کورد بوو*

**ژبلی** (ئام.) جگـه لـه، بێجگـه لـه: ئـەم *هـەمی چـووینه سـەیرانێ ژبلـی مالا خالێ من.*

**ژ بۆ** (ئام.) بۆ، به مەبەستی، له پێناو، ژ بـەر: *هـوین ژ بـۆ چ هاتبوونـه ڤێره.*

**ژبیرکرن** (چ.) لە بیرکردن، ژ مزر چوون، مزر نەمان: *ژبیرکرن رەنگەکێ نەساخییە.*

**ژڤان** (ن.) پەیمان، سۆز، ژوان، ژوان، چاوەڕێکردن، پێککەیشتن لە جێگایەکی دیاریکراودا: *مە دگەل وان ژڤان بوو.*

**ژ مێژە** (ئاك.) لەمێژە، لە دێر زەمان، لە کۆنەوە: *ژ مێژەیە مرین نەهاتینە سەرەدانا مە.*

**ژ.ك** (ن.) ژێ كاف کورتکراوەی ژیانەوەی کوردە، کە پارتێکی کوردی بوو لە سالی ١٩٤٣ی زاینیدا دامەزرا.

**ژمارە** (ن.) هەژمارە، دانە دانەی بژاردن.

**ژمارەی دانیشتووان** (ن.) ژمارەی نیشتەنی، ژمارەی نیشتەجێبووان، ژمارا ئاکنجیا: *ژمارەی دانیشتووانی کورد لە جیهاندا نزیکەی چل ملیۆن کەسە.*

**ژ ناڤبرن** (چ.) لەناو بردن، لەناوچوون، قڕکردن، نەهێشتن: *ژ ناڤبرنا مێش و مەگەزان پێویستە.*

**ژنشکەکێ ڤە** (ئاك.) لەناکاو، کتوپڕ، دەمودەست: *باران ژنشکەکێ ڤە ل مە باری.*

**ژنهۆ ویێڤە** (ئاك.) لەمەولا: *ژنهۆ وێڤە ئەم سەربخۆین.*

**ژوان** (ن.) ١- بڕوانە: ژڤان. ٢- چوونە خەو بە ئاستەم: *کاتی ژوان و بڕژانم بوو کە هاتی.*

**ژوور** (ن.) هۆدە، ئۆدە، ژۆر: *ئێمە تەنیا دوو ژووری نووستنمان هەیە.*

**ژی** (ن.) ١- تەمەن: *ژیێ کوڕێ من دەه سالە.* ٢- (ئام.) -یش: *ئەز ژی (منیش) حەزدکەم هەمی زاراڤێن زمانی کوردی بزانم.*

**ژیان** (چ.) ژیار، ژین، زینداتی، ژیان ئاکارێکی تایبەتی زیندووەکانە، ماوەی لە دایکبوون تا مردن: *ژیانا گوندان خۆشترە ژ یا باژێران.*

**ژیانەوە** (چ.) سەر لەنوێ بژیتەوە، بووژانەوە، ڤەژین.

**ژیر** (ئان.) هۆشیار، زانا، زیرەك، وشیار، ئاگادار، ئاقل: *مرۆڤی ژیر هەموو شتەك لێكدەداتەوە.*

**ژیشك** (ن.) ژووشك، ژووژك، ژیژی.

**ژینگە** (ن.) جێگای ژیان، زیندەگا، ژینگەه، وارگە، جهوار، جهێ ژیانێ: *لەكاتی سەیراندا پێویستە رەچاوی خاوێنی ژینگە بكەین.*

**ژێ** (ن.) ١– تەل: كەمانەكە ژێی پسا.
٢– لەو، لە ئەو، ژوێ، ژوی. جیهانێ هەمیێ های ژێ هەبوو، دەمێ رژێما بەعس كیمیا ل هەلەبجە باراندی.

**ژێدەر** (ن.) سەرچاوە، چاووگ، جاڤكانی: *باران ژێدەرێكی سەرەكی ئاوی ژێر زەوییە.*

**ژێر** (ئان.) بن، خوارەوە: *ئێمە لە نهۆمی ژێرەوەین.*

**ژێر چاوخستن** (چ.) ژێر چاڤدێریێ، ژێر چاڤ كرن: *ژێر چاو خستنی مندالْ ئەركی دایك و بابانە.*

**ژێر دەست** (ئان.) ژێردەس، بندەست، دەست بەسەر: *مرۆڤی ژێردەست لە هیچ شتەكدا ئازاد نییە.*

**ژێر زەوی** (ن.) بن زەوی، بن زەمین، بن ئاخێ، بن ئەرد: *ژێر زەوی خاكی كوردستان بە نەوت دەوڵەمەندە.*

**ژێروو** (ئان.) خواروو، باشوور: *من چووم بۆ گەڕەكی ژێروو.*

**ژێگر** (ن.) ئەنگوستیلەی سەر پەنجە، كە ژێ كەوانی پێ دەگیرێ: *كەمانچە ژەنەكە بێ ژێگرەكەمان لێیدەدا.*

**ژێهاتی** (ئان.) لێهاتوو، لێوەشاوە، پێڤەهاتی: كارزان مامۆستایەكێ ژێهاتییە.

**سـابات** (ن.) کەپرێکە هاوینان لە باخچاندا بۆ سێبەر دروستدەکرێت.

**سـابلاغ** (ن.) نێوی شارێکە لە کوردستانی رۆژهەڵات، لە ساڵی ١٩٤٦ دا بوو بە یەکەمین پایتەختی کۆماری کوردستان. ئەم شارە بە مەهابادیش ناسراوە.

**سابوون** (ن.) ساوون، سابین. سابوون لە چەند ماددەیەك دروست دەکرێت بۆ خۆ خاوێنکردنەوەو شوشتن بەکاردەهێنرێ: هەموو *رۆژەك دەست و چاوم بە سابوون دەشۆم.*

**سـابووناو** (ن.) کەفاوی سابوون: *جلوبەرگەکان خاوێن نەبوونە سابووناویان پێوە ماوە.*

**سابوونی** (ن.) جۆرە کۆترێکی رەنگ بۆرو باڵ رەشە: *سابوونییەکەم بە سێ هەزار دینار کڕی.*

**سات** (ن.) کات، گاف، وەخت، دەم: *ئەو ساتەی، کە لە دەرگات دا من خەوتبووم.*

**ساج** (ن.) ١- سێل، سێڕ، ئاسنەکی گردی لووسی قۆقزی تەنکە

دەخرێتە سەر ئاگر نانی پێ دەبرژێت: *نانی ساجی بە گەرمی خۆشە.* ٢- جۆرە دارەکی جوانی بەنرخە لە دارتاشیدا بەکار دێت: *دەرگای خانووەکەمان لە ساج دروستکراوە.*

**ساخ** (ئان.) ساغ، لەشساغ، تەندروست، بێ عەیب، بێ خەوش: *ساخیا مەوە داخوازا منە.*

**ساخلەمی** (ن.) تەندروستی: *ساخلەمیی هاووڵاتیان لە ئەستۆی میریدایە.*

ساز

**ساز** (ن.) ١- ئامێری موزیکە: *کاکە ئاوازەکمان بەو سازە بۆ لێیدە.* (ئان.) ٢- گونجاو، لەبار، هەڵکەوتە: *بارودۆخ بۆ ئامەنگەکە سازە.*

**سازاندن** (چ.) گونجاندن، ڕێکخستن، چاککردنەوە: *بارودۆخی تایبەتمان بۆ پرۆژەکە سازاندووە.*

**سازکردن** (چ.) ڕێکخستن، گونجاندن، ئامادەکردن: *ئەرکی سازکردنی ئامەنگەکە لەسەر شانی تۆیە.*

**سازگار** (ئان.) سازگەر،خاوێن، پاک، خۆشە، بێ گەرد، ڕۆشن، پاکژ: *ئاوی کانی سازگارە.*

**ساڤا** (ئان.) ساوا، ناکام، مەلۆتکە: *میڤی مێشتا یا ساڤایە.*

**ساغکردنەوە** (چ.) روڤەکرن، یەکلایی کردنەوە، ڕوونکردنەوە، بەلاداخستن: *لێژنەیەکی تایبەتی بۆ ساغکردنەوەی کێشەکە پێکهێنراوە.*

**ساکار** (ئان.) سادە، ئاسایی: *پیاوەکی سادەو ساکارە.* (ن.) ٢- ناوە بۆ مێینە.

**ســـالار** (ئـان.) ١– ســـەردار، گـەورە: *سـیروان سـالاری سـوپایە.* (ن.)
٢– ناوە بۆ نێرینە.

**ســـالۆخ** (ن.) ســـالۆغ، دەنگوبـــاس، هەواڵ، نوچە.

**ســـالۆخکردن** (ج.) وەســـفکردن: *هـەر کەسـەك سـالۆخا جهیێ لێ بژیت بکەت.*

**ســـاڵ** (ن.) دوازدە مانگــە یــان چــوار وەرزی ساڵە: *ساڵ ٣٦٥ رۆژە.*

**ســـاڵنامە** (ن.) رۆژ ژمێـــر، تـــەقویم: *ســەیری ســاڵنامەکە بکــە بزانــە جێــژنی نـــەورۆز کەوتۆتـــە ج رۆژێك؟*

**ســـاڵنامەی کـــوردی** (ن.) لــە ســـاڵی دامەزرانـــدنی دەوڵـــەتی مـــاد دەستپێدەکات، کە (٧٠٠) ساڵ پێش لە دایکبوونی عیسا بوو.

**ساڵی زایـین** (ن.) ساڵی لەدایکبوونی عیسـا (س.خ): *لەسـەری ســاڵی زایینیـدا عیسـاییەکان ئاهـەنگ دەگێڕن.*

**ســـاڵی فیـل** (ن.) ئـەو ســاڵە بـوو کـە ئەبرەهـــەی حەبەشـــی هێرشـــی کـردە سـەر مەککـەو پێغەمبـەر محمـد (د.خ) لـەدایك بـوو. کـە دەکاتە ساڵی ٥٧١ ی زایینی.

**ساڵی کۆچی** (ن.) ئەو ساڵەی پێغەمبەر محەمـەد (د.خ) بـەرەو مەدینـە کۆچی کرد.

**ســـاماڵ** (ئـان.) سـاهی، ئـەو کاتـەی ئاسمـــان بـــێ هـــەور دەبێـــت: *هاوینـــان ئاسمـــانی کوردســـتان ساماڵە.*

**سانا** (ئان.) ئاسان، ساکار، ساناهی: *کاری بە کۆمەڵ سانایە.*

**ساوا** (ئـان.) بچووك، ساڤا، مەڵۆتکـە، کۆرپـە: *شـیرین ساوایە، مێشتا شـــــیرە خۆرەیـــــە.* ٢– پێنەگەیشـــتوو: *شـــینابییەکان مێشتا ساوان.*

**سایە** (ن.)١– سێبەر، سیبەر، سیە، ســا: *لەســایەی دایکوباوکمــدا پێگـەییم.* ٢– ژەنگـی ئاسـن: *ئاسنەکە سایەی هێناوە.*

**سـايەقە** (ن.) سـايقە، سـەرماو بەسـتەڵەك، خيسـار، هـەواى ساردو بەستوو، سامالّ.

سە

**سە** (ن.) سـەگ، كسـۆك، سپەڕ: *سە گياندارەكى وەفادارە.*

سەبەتە

**سەبەتە** (ن.) سەلك، زەمبيل، دەفـرى قـوولّى ميوەجـات، قەرتاڵـە، قـەرتارە، سـەبەتە لـە قـاميش، يان پەلكى دارخورمـاو شـۆڕەبىّ دەچـنرێت: *پـوورم سـەبەتە ترێيـەكى بـە ديـارى بـۆ مێنـا بووين.*

**سـەپان** (ن.) جوتيـارى بـەكرێگيراو، كەسەكە بە پـارەو كرىّ كـار بـۆ جوتيـارو خـاوەن بـەرووبووم دەكات بـە تايبـەتى گـەنمو جـۆ: *كورد لەسەر ئەم خاكـە سـەپانى كەس نييە.*

**سە پاندن** (ن.) بەزۆرتووشكردن، بـەمل داهێنـان، بەسـەردا سـەپاندن، جـێگير كـردن: *نـابىّ بـە زۆر بڕيارەكانـت بەسـەركەسـدا بسەپێنى.*

**سەخت** (ئان.) ١- دژوار: *ئـاو و هـەواى ئـەم مانگـە سـەخت بـوو.* ٢- شاخى بەرزو دڕنالّ دڕنالّو گران بـۆ سـەركەوتن. ٣- كەسـى تـووڕەو پێـداگرو لاسـار: *ئـازاد مرۆڤەكى سەختە.*

**سەدە** (ن.) سەد سـالّ بەسـەر يەكـەوە، يـەك چـەرخ: *ئێمـە ئێسـتا لـە سەدەى بيست و يەكدا دەژين.*

**سـەر** (ن.) ١- لـە مـل بـەرەو ژوور. سەلك، كەللە، بەشى سـەرەوەى تەنـە. هـەردوو چـاوت، هـەردوو

کوێچکەو لووتو دەمت دەکەونە سەرت: *گەر مانبوو بم سەرم ژان دەکات.* ٢- لا، بەر، شوێن: *لەسەر تا ئەو سەر مەمووبان رلوەستابوون.* ٣- قەپاغ، سەرپۆش، داپۆشی دەفرو شتی تر: *خواردن بێ سەر بەجێ مەمێڵە.* ٤- تاك، كەس، نەفەر لە خێزان‌و گیاندارو مەڕو مالآت: *خاوەنی ١٠ سەر خێزانە.* ٥- دوا خاڵ، لووتکە، کۆتایی: *دنیا مەتا سەر بۆ کەس نەماوەتەوە.*

**سەرا** (ن.) قشلە، کۆشك و تەلاری میری: *خەڵك لەبەردەم سەرا کۆببوونەوە.*

**سەرەتا** (ن.) دەستپێك، پێشەکی: *مانگی نەورۆز سەرەتای ساڵی کوردییە.*

**سەرەتایی** (ئان.) ماوەی شەش ساڵی یەکەمی خوێندن: *کوڕەکەم لە قۆناخی سەرەتایی دایە.*

**سەرەخولێ** (ن.) سەرگێژی، وڕی، هوڕی، سەرسامی.

**سەرەدەری** (ن.) ئەزیەت، زەحمەتی، ناخۆشی، چۆنێتی مامەڵە کردن: *مووین چەوا سەرەدەریا خەو دگەل نەساخان دکەن؟*

**سەرەڕای** (ئاك.) سەرباری، سەر هندێ ڕا لەگەڵ ئەوەش: سەرەڕای ئەوەش: *سەرەڕای نەهاتنیشی تەلەفۆنیشی نەکرد.*

**سەرەمێکوتە** (ن.) ١- سەرمێکوتك، سەری کوتکی ساوار کوتانەوە: *سەرە مێکوتەکە شکا.* ٢- *کوڕپەلەی بۆق سەرەمێکوتە یان سەلکە مێکوتە.*

**سەرەوخوار** (ئاك.) سەرنشیف، سەرەو نخوون، سەرەو ژێر، بەرەو خوار: *لە بەرزاییەکەوە سەرەو خوار دەکشاینەوە: جەرەکە سەرەو خوار بووە هەموو ئاوەکەی ناوی رژا.*

**سەربار** (ئاك.) سەرەڕا، ئەگەر تۆ وانەکانت نەخوێندبوو، کتێبەکانیشت لەگەڵ خۆت نەبردبوو بۆ قوتابخانە، ئەوە

مامۆستا پێت دەڵێت:
نەتخوێندوەو سەرباری ئەوەش
کتێبەکانیشت نەهێناوە.

**سەرباز** (ن.) چەکداری سوپا لە
دەوڵەت: *براکەم چەند ساڵەك
سەربازی کردووە.*

**سەربازخانە** (ن.) سەربازگە، شوێنی
سەربان، ئۆردوگا، بنکەی
سەربازان: *چەکدارەکان لە
سەربازخانە مەشقی چەك
دەکەن.*

**سەربازگە** (ن.) بڕوانە: **سەربازخانە**.

**سەربان** (ن.) سەری ژوورووی خانوو:
*لە هاویندا لە سەربان دەخەوم.*

**سەربەتاڵ** (ئان.) نەنخافتی، بێ
قەپاغ، بێ سەرپۆش،
بێدەرپۆش، سەربەڵا:
*مەنجەڵەکە بەسەربەتاڵی
بەجێهێڵراوە.*

**سەربەخۆ** (ئان.) ئازاد، سەربەست:
*بەنیازین رۆژنامەیەکی سەربەخۆ
دەربکەین.*

**سەربەخۆیی** (ن.) خۆیی بوون، ئازادی،
سەربەستی: *سەربەخۆیی ئاواتی
گەلانی ژێر دەستە.*

**سەربەرەوژوور** (ئاك.) ژێهەل، بەرەو
سەر: *بۆ ئەوەی رێگاکە ببڕین،
ناچار بووین سەر بەرەو ژوور
بڕۆین.*

**سەربەست** (ئان.) ئازاد، سەربەخۆ: *ئەو
سەربەستە لەوەی دەیلێ.*

**سەربەستی** (ن.) ئازادی، سەربەخۆیی:
*سەربەستی رادەربڕین مافی
هەموو کەسەکە.*

**سەربڕین** (چ.) کوشتنەوە، کوشتن،
ڤەکوشتن، سەر ژێکرن.

**سەربلند** (ئان.) سەرفراز: *زیرەکی
قوتابی سەربلندەکات.*

**سەربوردە** (ن.) سەربردە، سەربوردە،
سەربۆر، سەربهورد، سەرهاتی،
بەسەرهات، سەرگوزشتە،
ئەزموونگەری: *سەربۆری خۆ
بۆمن؛*

**سەربۆری** (ن.) بڕو **سەربوردە**

**سەربهورد** (ئان.) بڕوانە: **سەربوردە**

**سەرتاپا** (ئاك.) لە سەرەوە هەتاکو پێ، هەموو جەستە، گشت، سەراپا، تەواو: *سەرتاپا گوڵباران کرا.*

**سەرتاسەر** (ئان.) سەرانسەر، گشت، هەموو: *سەرتاسەری وڵات بە ڕێگەو بان خۆشکراوە.*

**سەرپەرشت** (ئان.) چاودێر، کەسێکە بەسەر شتێك یا کەسێك یان کۆمەڵێك را بگاتو چاودێریان بکات.

**سەرپەرشتی** (ن.) چاودێری، ئاگاداری، کەسێ ئاگای لە شتێ یان کەسێ ببێ: *بەڕێوەبەرەکەمان بە جوانی سەرپەرشتی کارەکانی قوتابخانە دەکات.*

**سەرپشك** (ئان.) بڕیار دەر، شت یا بەش دابەشکەر، بۆ وێنە سەرپشك بڕیار لەسەر باشی شتێك یا کەسێك لە نێوان کۆمەڵێك شتو کۆمەڵێك کەس دەدات.

**سەرپۆش** (ن.) شتێکە سەری شتێکی دی پێدادەپۆشرێت. ٢- لەچك، چەفیە، ڕەفتە، دەسرۆك، دەرسۆك: *سەرپۆشەکەی جوان لێدێت.*

**سەرجەم** (ن.) هەموو تێکڕا، تێکڕایی، گشت، تەواو: *سەرجەم قوتابیانی پۆلی شەشەم زیرەکن.*

سەرچنار

**سەرچنار** (ن.) ناڤێ هاڤینەهەوارەکا کوردستانێ یە: *سەرچنار هاڤینە هەوارەکا خوشە.*

**سەرخوان** (ن.) سێنی، فەرخە سێنی.

**سەردان** (ن.) بەسەر کردنەوە، چوونە لا، دیدەنی، سەرەدان: *ئەم چووینە گوندێ بۆ سەردانا ماڵا خاڵا من.*

**سەردەم** (ن.) کات، چەرخ، گاڤ، ڕۆژگار: نهۆ سەردەمێ گیا درینێیە.

**سەردەمی ڕاشدین** (ن.) ماوەی فەرمانڕەوایی چوار خەلیفەکەی دوای پێغەبەر (د.خ.).

**سەردەمی کۆن** (ن.) ڕۆژگاری زوو، دێرین زەمان، سەردەمی ڕابردوو پێش لەدایکبوونی عیسا: *لە سەردەمی کۆندا ئادەمزاد لەنێو ئەشکەوت دەژیا.*

**سەردەمی ناوەند** (ن.) ئەو ماوەیەیە، کە دەکەوێتە نێوان سەردەمی کۆن و نوێ، سەردەمێ ناڤەڕاست: *لەسەردەمی ناوەندا ئادەمزاد خانووبەرەی دروستکردبووە.*

**سەردەمی نوێ** (ن.) سەردەمی هاوچەرخ: *لە سەردەمی نوێ مرۆڤ توانی بچێتە سەر مانگ.*

**سەرزەنش** (ن.) سەرزەنشت، لۆمە، سەرکۆنە، گازندە، گلەیی، گلەو گازندە: *تۆخوا زۆر سەرزەنشم مەکە.*

**سەرزەوی** (ن.) سەر زەمین، سەر ئەرد: *بەشێکی ئاوی سەر زەوی لە بەفرو باران پێکدێت.*

**سەرسام** (ئان.) داماو، سەرسوڕماو، بەهتی، مەندەهۆش، حەپەساو، واق وڕماو: *هەمیشە بە سەرسامی دەیبینم.*

**سەرسوڕمان** (چ.) مەندەهۆش، حەپەسان، دامان، سەرسام بوون، واق وڕمان: کە چاویان بە ورچەکە کەوت تووشی سەرسوڕمان بوون.

**سەرڤاپ** (ن.) بڕوانە: **سەرپۆش.**

**سەرڤاڵ** (ئان.) نە پەرژان لەبەر کاری زۆر، خەریك، ماندوو، پڕ ئیش، مژوڵ ، مژویل، مژیل: *دەمێکە سەرڤالی خۆ ئامادە کردنم بۆ تاقیکردنەوە.*

**سەرڤالی** (ئاك.) خەریکی، پڕ ئیشی، مژویلی: *سەرڤالی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکە بووم.*

**سەرکەوتن** (چ.) سەرکەڤتن، زاڵبوون، بە ئاکام گەیشتن: *ئەگەر لە*

*تاقیکردنــــەوەکان ســــەرکەوم دیارییەکی باش وەردەگرم.*

**سەرکردە** (ن.) پێشـەوا، رێبـەر، رابـەر، فەرمانــدە، گــەورە: *ســەرکردە مەردەم خەمخۆری گەلەکەیەتی.*

**ســــەرکوتکەر** (نــان.) چەوســێنەر، لەناوبـــــەر، تەپەســــەرکەر، داپلۆســێنەر: *رژێمــی دکتــاتۆر رژێمەکی سەرکوتکەرە.*

**ســـــەرکوتکردن** (چ.) لـــــەناوبردن، دامرکانــــــدن، داتەپانـــــدن، قەلاچــۆکردن، تەپەســـەر کـرن: *شۆرشی کورد بە کەس سەرکوت ناکرێ.*

**ســــەرکۆزەر** (ن.) ئـــــەو پــــووش و پەلاشانەیە، کە لـەکاتی تەتەڵە کردندا دەکەونە سەر دانەوێڵە.

**سەرما** (ن.) ساردی هەوا، سڕ، ساردی کەش و هەوا: *دەبێت خۆمـان لە سەرمای زستان بپارێزین.*

**سەرنج** (ن.) ١- تەماشاکردن بە وردی، دیقـەت: *سـەرنج بـدەرە تەختـە رەشـەکە بزانـە چـی نووسـراوە.*

٢- تێبینی: *کـە تـەواو بووم تـۆ دەتــوانی ســەرنجەکانی خــۆت بڵێیت.*

**سەرهاتی** (ن.) بڕوانە: **سەربۆری**.

**سەرهەڵدان** (چ.) راپەڕین، سـەرهلدان: *بهارا ١٩٩١ یێ کـوردان مـەزنترین سەرهەڵدان ئەنجام دا.*

**سەروا** (ن.) دوا پیتی دێڕی هۆنراوەیـە، قافیـە: *ئـەم هـۆنراوەی دامنـاوە ئـازادە بۆیـە تـا رادەیـەك بـێ سـەروایە: هۆزانڤـانێن کلاسـیکی گەلەك پیت ب سەروایێ دکر.*

**سەروەر** (نان.) سەرۆك، پێشەوا، مەزن، رێبەر.

**ســــــەروەری** (ن.) ســــــەرۆکایەتی، پێشەوایی، مەزنی، رێبەرایـەتی: *ســـــەروەری بـــۆ شـــەهیدانی کوردستانە.*

**سەروچــــاڤ** (ن.) دەموچـــاو، روو، روخسار، شێوە: *مەمی بـەیانیان مەکو ژ خەو رادبی سەروچاڤێت خۆ جان بشۆ.*

**سەروسیما** (ن.) ڕەنگ، شێوە، سەروچاو، ڕەنگی دەموچاو، شێوەی دەموچاو: *بەسەرو سیمایەوە دیارە نەخۆشە.*

**سەروکاری** (ن.) پەیوەندی، هاتۆچۆ، هاموشۆ: *سەروکاریم لەگەڵ خوێندنەوەی ڕۆماندا باشە.*

**سەروگانی** (ن.) سەروچاوە، ژێدەر، سەرچاوە: *سەروکانی ئاوەکە لە باخەکەی ئێمەیە.*

**سەروەر** (ئان.) ڕێك، كتومت، قەدارە، قایدە، بێ کەم و زیاد، تەواو: *جلوبەرگەکانی زۆرباش بوون، دەتگوت سەروەر بۆ ئەو دوراون.*

**سەری** (ئاك.) سەروو، ژووروو: *من کرمانجیی سەری باش دەزانم.*

**سەرین** (ن.) بالیفك، بالیف، سەرین لە پەڕی باڵندە، یان لۆکە، یانیش ئیسفەنج دروست دەکرێت: *من هەمیشە حەز لە سەرینی نەرمو نزم دەکەم.*

**سەعات** (ن.) سەئات، کاتژمێر، دەمژمێر، سەعەت: *سەعات هەشتی سپێدێ دەوام دەست پێدەکەت.*

**سەگ** (ن.) بڕوانە: **سە**.

**سەگوەڕ** (ن.) ١- وەڕینی سەگ، ڕەوین: *لە لادێ شەوان سەگوەڕ زۆرە.* ٢- ناوی ڕۆمانەکی محەمەد موکرییە.

**سەلار** (ئان.) بە کەسی سەنگین و بەڕێزو تێگەیشتوو دەگوترێت: *ئارا سەلاری مۆزە.*

**سەلك** (ن.) کوردی باکووری کوردستان بە سەبەتە دەڵێن سەلك، بەلام کوردی باشوور سەلك لەگەڵ پیاز، توور بەکاردێنن: سەلکە پیاز، سەلکە تووروو چەوەندەرو...

**سەلکە** (ن.) پیفازۆك، سەرێ پیفازێ: *دە تکەکێ سەلکە پیفازان بۆ مە بکرە.*

**سەلماندن** (چ.) قەبولاندنی کارەك یا وتەیەك، دیار کرن، چەسپاندن:

بەم کارە سەلماندی کە زیرەك و ئازایە.

**سەما** (ن.) هەڵپەڕین، هەڵپەڕکێ، دیلان، لەیزین، لەیزتن: بە دەنگە بە سۆزەکەیەوە هەموو هاتینە سەما.

**سەنگەر** (ن.) خەندەك، چەپەر، تابی، قنگر، مەتەرێز، شوێنێکە خەڵك لە کاتی شەڕدا خۆی تێدا حەشاردەدات: پێشمەرگەی چ جاران سەنگەرێن بەرەڤانیێ نەبەردانە.

**سەوز** (ئان.) کەسك، سەبز: بەهاران دەشتودەر یەك پارچە سەوزە.

**سەوزایی** (ن.) کەسکایی، شینایی، کەسکاتی: سەوزاییەکەی دەم رووبار زۆر فێنك و خۆشە.

**سەوزە** (ن.) ١- گیاو گوڵ، سەوزەوات: کەرەوز سەوزەیەکی بەسوودە. ٢- ناوە بۆمێینە: سەوزە دەستی نووسینی مۆنراوەی هەیە.

**سەوزەوات** (ن.) بڕوانە: سەوزە (١).

سەوڵ

**سەوڵ** (ن.) داری سەلو، سەلو: بە سەوڵ بەلەمەکەی لێدەخوڕی.

**سەهۆڵ** (ن.) ئەو ئاوەی بە سەرما دەیبەستێت، وەکو سەهۆڵبەندانی جەمسەری باکوور، بووز، شەختە، جەمەد، سۆڵە: ئاوی هەندەك لە کوێستانەکانی کوردستان سەهۆڵیان ناویێ.

**سەیدا** (ئان.) گەورە، بەڕێز، بۆ ناڤیێ مامۆستاو مرۆڤێن مەزن دهێت: سەیدایێ مێژا گەیشتە جیێ.

**سەیر** (ئان.) ئەنتیکە، عەنتیکە، سەرسوڕهێنەر، سەمەرە: ناوەڕۆکی چیرۆکەکەم بەلاوە سەیر بوو.

**سەیران** (ن.) ١- گەشتوگوزار، گەریان، چوونەدەشتودەر بۆ

ئا ئە ب پ ت ج چ ح خ د ر ز ژ **س** ش ع غ ف ڤ ق ک گ ل م ن ە و ی

گەشت: *لە بەهاران سەیران خۆشە.* ٢- ناوە بۆ مێینە: *سەیران قوتابی پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە.*

**سبەینێ** (ئاک.) بۆ بەیانی، سپێدێ، ڕۆژی دادێ: *سبەینێ دەچمە دهۆک.*

**سپی** (ئان.) ڕەنگی سپی، پێچەوانەی ڕەش، چەرموو: *سپی نیشانەی ئاشتی و ئێمنییە.*

**سپیایی** (ن.) بەرهەمەکانی شیر، ڕێچاڵ، بەرووبوومی شیر وەک: ماست و پەنیر، سپیاتی، شیرەمەنی: *زۆری بەرووبوومی سپیایی دەوەستێتە سەر زۆری ئاژەڵ.*

**سپیندار** (ن.) ئەسپیندار، چنار، ناڤێ دارەکا بەژن بلندە: *سپیندارێ دارەکا درێژو ڕاستە.*

**سپێدە** (ئاک.) بەیانی، سبەینێ، سپێدێ، سەحەر، سوبە، سبەی: *ئەز سپێدێ زی ژ خەو ڕابم.*

**سپێدێ** (ئاک.) بڕوانە: **سپێدە**

**سپێنە** (ن.) سپیلک، سپیایی ناو هێلکە: *سپێنەی هێلکە ئەوەندەی زەردێنە بە تام نییە.*

**ستاندن** (چ.) سەندن، لێ داگیرکردن: *پارەکەیان بە زۆر لێ ستاند.*

**ستایش** (ن.) پەسن، تاریف، بەرز ڕاگرتن، پێدا هەڵدان: *ڕێزو ستایشمان هەیە بۆ شەهیدان.*

**ستەمدیدە** (ئان.) مافخوراو، زۆرلێکراو، چەوساوە: *کورد گەلێکی ستەمدیدەیە.*

**ستەمکاری** (ن.) زۆرداری: *هەر گەلە لە دژی ستەمکاری ڕادەپەڕێ.*

**ستران** (ن.) گۆرانی، مەقام، لاڤژە، لاوک: *ڕەسوڵ گەردی ستران و حەیرانی خۆشی دەگووت.*

**ستری** (ن.) درک: *ستریەک چوو د پێ وی ڕا.*

**ستوون** (ن.) ١- ستوین، کۆڵەکە، ئەستوندە، سوندەکە: *بابەکی بەهێز بوو چەند ستوونێکی هەڵکێشا.* ٢- کۆشە: *ئەو ستوونی نووسینێکی کارامەیە.*

**سرپە** (ن.) سرپە سرپ، چپەچپ، چرپەچرپ، سرتەسرت، دەنگی نزم: *منالەکە بە سرپە هاتە پێش.*

**سرك** (ئان.) سرت، کیفی، کێوی، خۆ بە دەستەوە نەدەر، ئاژەڵێکی ماڵی نەبوو: *کەوەکە سرکە ماڵی نەبووە.*

**سرکە** (ن.) سهك، ئاوێکی ترشە لە تری، سێو، خورما... دروستدەکرێت: *برنجی بە سرکە زۆر خۆشە.*

**سروە** (ن.) ١- شنەبا، کزە با، شنە: ٢- ناوە بۆ مێینە: *سروە لە ئاییندەدا حەز دەکات ببێتە نسینەماکار.*

**سروت** (ن.) لاسکی گەنمو جۆ، کلۆش، گولیا گەنمی‌و جهیّ: *گەنمو جۆی ئەمساڵ سروتی لاوازو بێ هێز بوو.*

**سروش** (ن.) وەحی، پەیامو گوتەیەکی خواییە بۆ پێغەمبەران.

**سروشت** (ن.) خۆرسك، بەخۆکرد، دوور لە دەستی مرۆڤ، لەخۆوە شینبوون، دیمەنی خۆرسك: *زۆربەی شاعیرانی کورد بەجوانی سروشت هەڵدەڵێن.*

**سڕبوون** (چ.) متبوون، تەزین، پێتیبوون: *لە سەرمانا هەردوو پێیەکانم سڕبوون.*

**سڕین** (چ.) ڤەماڵین، زێبرن، ڤەماڵشتن، ماڵشتن، پاككردن، ستڕین، پاکژکرن: *من تەختە رەشەکەم سڕی.*

**سزا** (ن.) جەزا لە بەرامبەر تاوانەك: *ئەوکەسەی ئازار بەخەڵك بگەیەنیت سزای قورسی بەردەکەوێت.*

**سفت** (ئان.) دژی شاش، ورد چنراو، سخ، سفت‌و سۆڵ: *ئەو تورمانە سفتە.*

**سك** (ن.) زك، زگ، هورگ، ورگ: *کەم بخۆ تا تووشی سك ئێشە نەبیت.*

**سکاڵا** (ن.) دەردە دڵ، شکایەت، گلەیی، گازاندە: *سکاڵایەکم دا بە میری.*

**سکپڕ** (ئان.) دوو گیان، ئاڤز، ئاووس، ژنەك کە منداڵی لە سکیدا بێ: *ئافرەتی سکپڕ نابێ خۆی ماندوو بکات.*

**سکر** (ن.) پەنگاڤ، دیوارێ کە لەبەردەم ئاودا بە توول و گیا چێ دەکرێ: *وان سکرەکێ مەزن چێکرییە.*

**سکوزا** (ن.) زکێ زانێ، زگوزا، نەوە خستنەوە.

**سکۆڵە** (ن.) زکۆڵە.

سلێمانی

**سلێمانی** (ن.) شارێکە لە باشووری کوردستان و لە ساڵی ١٧٨٦ی زایینیدا دروستکراوە.

**سڵ** (ن.) سل، زیز، توورە، تۆراو، ترس: *مەڕو بزن لە گورگ دەسڵەمێنەوە.*

**سڵاڤ** (ن.) سەلام، سڵاو: *من مەمی گاڤان سلاڤ بۆتە مناردینە.*

**سڵاو** (ن.) بڕوانە: **سلاڤ**.

**سڵبوون** (چ.) توورەبوون، زیزبوون: *سڵبوون کارەکێ پەسەندو جان نییە.*

**سمت** (ن.) سمتەجوڵە، کماخ، کلۆت، ئەستوورایی خوار کەمەر.

سمۆرە

**سمۆرە** (ن.) سڤورە: *سمۆرە گیاندارەکی زۆر چوستی گوێز خۆرە.*

**سنگ** (ن.) ١- سینگ، سینە، پانایی پێشەوەی لەش: *لە بەربوونەوەکەدا سنگی ئازاری*

پێگەیشتووە. ٢- ئاسن یا دارێکی کورتە، کە دەچەقێندرێ و شتی پێ دەبەسترێتەوە.

**سنگە پەڕ** (ن.) پەڕێ سینگی

**سنگ فراوانی** (ن.) سەخی، دڵفراوانی، لێبوردەیی: *پێویستە لەکاتی تەنگانەدا بە سنگفراوانییەوە رەفتار بکەین.*

**سنوق** (ن.) سندوق، بە زۆری لە تەختە دروستدەکرێت و رووی دەرەوەی نەخش و نیگار دەکرێت و ناوەوەشی بۆ پاراستنی شتومەك بەکاردەهێنرێت، باول: *نەنکم جلوبەرگی خۆی لەنێو سنوق داناوە.*

**سنوور** (ن.) ١- نێوانی دوو وڵات، تخووب، کۆشەن، توخیب: *ئێران سنوورەکی درێژی لەگەڵ کوردستاندا هەیە.* ٢- رادە: *پێویستە سنوورەك بۆ کاری خراپ دابنرێ.*

**سوارە** (ئان.) پێچەوانەی پیادە، سیار. کەسێ، کە بەسەر بارەبەر یا هەر شتەکی ترەوە گەشت بکات: *لە رێدا چەند سوارەکمان دیتن.*

**سوارچاك**

**سوارچاك** (ئان.) کەسێکە ئەسپ سوارێکی باشبێت: *کچەکەم سوار چاکە.*

**سوپا** (ن.) لەشکر، هێز، سپا: *سەربازەکان سوپای کوردستانن.*

**سوپێر** (ن.) سەنگەر، سپەر، سوپەر، چەپەر: *پێشمەرگەکان خۆیان باش لە سوپێردا قایم کردبوو.*

**سورمە** (ن.) کل، تۆزەکی رەشە بۆ چاو جوانکردن بەکاردەهێنرێ: *زۆر*

*بەکارهێنانی سورمە ئازاری چاو دەدات.*

**سورێژە** (ن.) سۆرك، سۆرکە، جۆرە زیپکەیەکی کوشندەیە لە منداڵدا دەردەکەوێ: *دەبێت منداڵەکانمان لە دژی سوورێژە بکوتین.*

**سورێنجك** (ن.) سورنجیك، سوریچك، سووریچك، ئەو بەشەی گەروو بە گەدە دەگەیەنێت.

**سونبل** (ن.) ١- سنبل، گوڵەکە کەلای وردی شینە: لە بەهاردا سونبل زۆرە. ٢- خۆشەی گەنم و جۆ، گۆلیا گەنمی: ئەمساڵ دەغڵەکەمان سونبلی بێ دانە.

**سوێر** (ئان.) سویر، بەخوێ، شۆر: *چێشتەکە زۆر سوێر بوو.*

**سووتەمەنی** (ن.) سووتەنی، ئەو شتانەی کە بۆ ئاگر بەکاردێن: *سووتەمەنی لە زۆر بواری ژیاندا بەکاردەهێنرێ.*

**سوود** (ن.) کەڵك، قازانج، خێر، مفا: *ئەو ئیشەی من سوودی زۆرە.*

**سوور** (ئان.) ١- سۆر: گوڵە باخەکە رەنگی سۆرە. ٢- بڕوانە: **سوێر**.

**سووڕ** (ن.) ١- زڕڕۆك، خول، زڕین: *هەندێ زیندەوەر سووڕی سڕبوونیان هەیە.* ٢- (ئاك.) تەواو، رێك: *سووڕ دەمزانی لە کارەکەی سەردەکەوێت.*

**سووڕاندن** (چ.) زڤڕاندن، بادان، چەرخاندن: *تا رووی خۆی نەسووڕاند نەمناسی.*

**سووڕی ژیان** (ن.) زڤڕۆکا ژیانی، بازنەی ژیان: *رووەك بەشداری لە سووڕی ژیاندا دەکات و دوانۆکسیدی کاربۆن وەردەگرێت و ئۆکسجین دەداتەوە.*

**سووڕی گەورە** (ن.) زڤڕۆکا مەزن.

**سووڕی گچکە** (ن.) زڤڕۆکا بچویك.

**سووك** (ئان.) سڤك، ، دژی گران: *هەوای گەرم سووکە زوو بەرز دەبێتەوە.* ٢- بێ قەدر، بێ حورمەتی، بێ رێز: بەدرەفتار،

بەدڕەوشت: *مرۆڤی سووك کەس ڕێزی لێناگرێت.* ٣- ئاسان: پرسیارێکی سووکە.

**سۆر** (ئان.) بڕوانە: **سوور** (١).

**سۆران** (ن.) ١- دەڤەرەکی پان و پۆڕە لە کوردستان بەگشتی: *خانزادی میری سۆران پەیکەرەکی لە هەولێر بۆ چێکراوە.* ٢- ناوی شارۆچکەیەکە و سەر بە پارێزگەی هەولێرە. ٣- ناوە بۆ نێرینە.

**سۆرانی** (ئان .) ١- خەلکی دەڤەری سۆران: *من سۆرانیم.* ٢- شێوەزارێکی زمانی کوردییە: *من سۆرانی باش دەزانم.*

**سۆز** (ن.) ١- قەول، پەیمان، بەلێن، سوێند: *من سۆز دایە کو تە بپارێزم.* ٢- هەست، دەروون: *بەو مەقامە سۆزم جوولا.*

**سی** (ن.) ١- ئەندامی هەناسەدان لە لەشدا: *لە کاتی هەناسە وەرگرتن سییەکان شۆڕ دەبنەوە.* ٢- ژمارە سێ: پۆلەکەمان سی قوتابی تێدایە.

**سیا** (ئان.) ڕەش: *بە پرچی سیامی ناز دەکات.*

**سیار** (ن.) بڕوانە: **سوار.**

**سیاربوون** (چ.) سوار بوون: *ئەو مەمی ل ئۆتۆمبێلێ سیاربوون.*

**سیاهە** (ن.) تۆمار، لیستەی، کە بۆ نرخی کڕین و فرۆشتن دادەنرێت: *پێویستە لە بازاڕ سیاهەی کالاکان دابنرێت.*

**سیپەلك** (ن.) سێپەلاك، سی: *جگەرە کێشان زیان بە سیپەلك دەگەیەنێت.*

**سیرمە** (ن.) لاستیك یان چەرمی باریك و درێژ.

**سیستەم** (ن.) نیزام، پێڕەو، دەزگا، ڕێوشوێن: *سیستەمی سەرمایەداری لە قازانجی کەرتی تایبەتدایە.*

**سیسەمار** (ن.) سووسە مار، مارێکی زەرد و باریکە هێندێك جار بە

**شا** (ن.) پادشا، پاشا، فەرمانڕەوا، میر، سەرۆکی وڵات.

**شاتوو** (ن.) تووی سوور، تی شەمبی، گاتوو: *شاتوو تامی زۆر خۆشە.*

**شاخ** (ن.) ١-چیا، کێو: *ئەم شاخە زۆر بەرزە.* ٢- قۆچ، شاخی بزن و گیاندار: *ئەم بزنە شاخدارە.*

**شاد** (ئان.) ١- بەختەوەر، کامەران، دڵشاد، دڵخۆش: *بە هاتنتان شادم.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**شادەمار** (ن .) دەماری سەرەکی، شا ڕەگ: *دڵی ئادەمزاد شا دەمارەکی هەیە، کە خوێنی بۆ دەبا.*

**شادی** (ن.) دڵخۆشی، بەختەوەری، کامەرانی: *بە هاتنتان شادی کەوتە ماڵمان.*

**شاراوە** (ئان.) فەشارتی، شتێك کە ئاشکرا نەبێ: *شت لە دایك و باوکتان مەشارنەوە.*

**شارەزا** (ئان.) زانا، بەڵەد: *لە هەموو بوارێکدا پێویستمان بە شارەزا هەیە.*

**شارەزایی** (ن.) پسپۆڕی، زانیاری، ڕێناسی، زانایی: *دایکم*

*شـــارەزاییەکی باشـــی لـــە دەروونناسی هەیە.*

**شارەوانی** (ن.) بازێڕڤانی، دەزگەیەکی میرییە ئەرکی شاری لە روی پاکوخاوێنی، چاکردنی رێگەوبانو.... کەوتۆتە سەر: *ئەنجومەنی شارەوانی ئەرکی قیرتاوکردنی رێگاکەی گرتە ئەستۆ.*

**شارستانییەت** (ن.) ژیاری، ژیانی شارستان، مەدەنیەت: *لە کۆنەوە شارستانییەت لە کوردستاندا هەیە.*

**شارێ** (ئان.) شەقامو جادەی سەرەکی کە پانو پۆڕە: *هاملتۆن شارێیەکی سەرەکییەو لە هەولێر دەردەچێو بە پیرمەم، شەقڵاوە، حەریر، باتاسو... تێدەپەرێت، تا دەگاتە حاجی ئۆمەران.*

**شاشە** (ن.) ١- پەردەی سینەما، ئاوێنەی تەلەڤزیۆن: *تەلەفزیۆنی ئێستا شاشەی زۆر ڕوونە.* ٢- زەوی خەتدراو بۆ تووتن: *ئەم زەوییە شاشەکراوە بۆ چاندنی تووتن.*

**شان** (ن.) مل، پیل: *جەنتاکەم لەسەر شانی خۆم دانا و رۆیشتم.*

**شانازی** (ن.) کار چاکی، خۆ پێوە پەسنین، سەربەرزی، سەرفرازی، سەربڵندی، فەخر: *کارەکی چاکت کرد، بۆیە شانازیت پێوە دەکەم .*

**شانە** ( ن. ) ١- شە ، شەه ، شتەکی سانەدانەیە پرچی پێ دادەهێنرێت: *من بە شانە سەرم دادەمێنم.* ٢- شانەی هەنگوین. ٣- گرۆپ، تایەفە، کۆمەڵە، چەند کەسەك: *هەموویان لە شانەیەك کۆ ببوونەوە.*

**شانەدەر** (ن.) ئەشکەوتەکە دەکەوێتە پارێزگای هەولێر.

**شانەوشان** (ئاك.) ١- ملو مل، شان شەقاندن لە رۆیشتندا: *شانەو شان دەڕۆیشت.* ( ن.) ٢- زنجیرەی ملەی کێو و شاخ.

**شـــانس** (ن.) بــەخت، ناوچـــەوان، دەرفەت، ئەگەر بەخت لەگەڵتا یار بوو، دەتوانیت ئەو شتە بە ئـەنجام بگەیـەنیت، کــە تــۆ مەبەسـتتە، یـان هـەوڵ بـدەیت شتێك بکـەیت: *شـیلان شانسـی ئـــەوەی بــۆ هەلکــەوت، کــە گەشـــتێك لــەناو کوردســـتاندا بکات.*

**شـــانۆگەری** (  ) شــانۆیی، کــاری نوانـدن، نمایشـی شــانۆ: *لــە چالاکییەکانی قوتابخانە لە چەند شانۆگەرییەك بەشداریم کردووە.*

**شـــاهێن** (ن.) شـــەهێن، شـــاهین، باڵندەیەکی گۆشتخۆرە لە باز مـــەزنترە: *چـاوی شـــاهێن زۆر تیژە.*

**شایستە** (ئان.) شایان، گونجاو، مافی خۆیـەتی: *تـۆ شایسـتەی ئـەو پلەیەی.*

**شایی** (ن.) داوەت، هەڵپەرکێ، خۆشی، گۆڤەند، لەیزتن: *شایی کوردی چەند جۆرێکە.*

**شـــەبەنگ** (ن.) سـینامی، شـابیتە، تیرۆژك.

**شـەبەنگی خـۆر** (ن.) سـیناما تـاڤێ، رووناکرانەوەی رۆژ.

**شەپاڵ** (ئان.) جوانی دلبەر، شیرین، رند، شەنگ، بەدەو: *ئەم کچە بالا بەرزو شەپاڵە.*

**شەپلەی منداڵ** (ن.) ئیفلیجی منداڵ، شەلەلا زارۆکان، ڤالنجا بچویکا: *تووشبوون بە شەپلەی منداڵ کەمبووە، بەهۆی کوتانی منداڵان دژ بەم نەخۆشییە.*

**شەپۆڵ** (ن.) ١- پێل، هەڵکشانی ئاو لە رووبار و زەریاباندا: *رووبارەکی بە شەپۆلە.*

**شەربەت** (ن.) دۆشاو، دۆشاڤ، شیلەی میوەیـــەو تۆزێـــك ئـــاوی تێــدەکرێت و بــۆ خواردنـــەوە خۆشە.

**شەرمەزار** (ئان.) رووڕەش، شەرمندە، شەرمەند، خەجاڵەت: *دوژمنێ شەرمەزار شکستی هێنا.*

**شەڕ** (ن.) جەنگ، هەرا، ئاژاوە، لێکدان: *شەڕی یەکەمی جیهان لەساڵی ١٩١٤ ڕوویدا.*

**شەڕەنگێزی** (ن.) شەڕخوازی، ئاژاوەگێڕی، شەڕ فرۆشتن، بەر سینگ گرتن: *شەڕەنگێزی کارەکی خراپە.*

**شەڤ** (ئاک.) شەو، شێڤ، شام: *شەڤێن زستانێ گەلەک درێژن.*

**شەقام** (ن.) جادە، جاددە، ڕێ: *یاریکردن لەسەر شەقام مەترسیدارە.*

**شەقڵ** (ن.) شقل، مۆر، نیشانە، هێڵ: *جووتیارەکە خەرمانەکەی شەقڵ کرد.*

**شەکەمێ** (ن.) شەکەمەڕ، شەک، بەرخی مێ، کە پێی نابێتە ساڵی دووەم.

**شەکەنێر** (ن.) بەرخی نێر، کە پێی نابێتە ساڵی دووەم.

**شەل** (ئان.) ئەو کەسەی لاقی تەواو نەبێت، پێ سەقەت، لەنگ: *من بووم پیاوە شەل و کوێرەکەم لە جادە دەرباز کرد.*

**شەماڵ** (ن.) خەتیرە، مەشخەڵ، مۆم: *مامۆستا شەماڵە بۆ ئێمە.*

**شەماڵ** (ن.) بایەکی فێنکە هاوینان هەڵدەکات.

**شەمامە** (ن.) شەمام، شەمامکە، شەمامۆک، کاڕکە گندۆرەی بچووکی ڕێ ڕێ: *ڕەنگی شەمامە جوانە و بۆنیشی زۆر خۆشە.*

**شەمچە** (ن.) شخاتە، شقارتە: *شەمچە لە دەستی منداڵان دوور بخەوە.*

شەمشەمەکوێرە

**شەمشەمەکوێرە** (ن.) چەکچەکیلە، چەکچەکی: *شەمشەمەکوێرە بە شەو دەفڕێت.*

**شــــەنگال** (ن.) شـــەنگار، نـــاوی شارۆچـــــکەیەکی باشـــووری کوردســـتانە: *خـــەڵکی شـــەنگال خۆش مرۆڤن.*

**شەو** (ن.) بڕوانە: **شەڤ**.

**شــەوارە** (ن.) ١- شـەوڕەم، خـەوڕەم، وەدەم خـــەوا هەڵســـانو کـــاریٚ کـــردن: *دوێنـــیٚ شـــەو شـــەوارەم کـــرد.* ٢- ڕاوکردنـــــی بـــــە تیشکەکی بەهێز: *دوێنیٚ لە کاتی شـــەوارە کـــردن دوو چـــۆلەکەم کرت.*

**شەوانە** (ئاک.) بەشەو، شەڤانە: *شەوانە ئەرکەکانم دەنووسم.*

**شەواوشەو** (ئاک.) شەڤ ب شەڤ، شەو لە دوای شەو، شەوبەشەو: *براکەم شەواوشەو کار دەکات.*

**شەوەزەنگ** (ن.) تاریکە شەو، تبل چاڤانیٚ، شەوی ئەنگوستەچاوی تاریک: *پێشمەرگە پیاوی شەوەزەنگ بوو.*

**شەوبۆ** (ن.) گوڵەکە ڕەنگ بنەوش لە پاش ڕۆژاوا بۆنی خۆش دەدات: *بۆنی شەوبۆ مەستی کردم.*

**شەوچەرە** (ن.) شەوچەلە. شەو چەرەز، شەڤبێری. شەوانی زستانان بە دەم میوەو چەرەز خواردنەوە باسی ڕووداوێك، چیرۆکێكو... بکرێت.

**شــەوکوێری** (ن.) شـەڤکویری، بەشـەو نـەدیتن: *مـاوەلم تووشـی شـەو کوێری بووە.*

**شــەونخوون** (ن.) بـیٚ خـەوی، بەشـەو نەنووســـــتن: *ئـــــەوکـــــارە شەونخوونی دەوێت.*

**شــــەونم** (ن.) ١- خوناڤـــ، خونـــاو، ئـاوڕینگ، ئـەو دڵۆپـە ئاوانـەی بـــــەیانیان لەســـــەر ڕووەكو گەڵاکانـدا دیـارن. ٢- نـاوە بـۆ مێینە.

**شــــەویلکە** (ن.) شــەویلاگ، شـــەویلە، ئێســـکی چـــەناگە: *شـــەویلکەی ســـەرەوە بـــە کەللـــەی ســـەرەوە نوسراوە بۆیە ناجووڵێت.*

**شەه** (ن.) بڕوانە: **شانە**.

**شەهیانە** (ن.) زەماوەند، ئاهەنگ: *رۆژا مەینی شەهیانا زانایە.*

**شەهید** (ن.) فیدا بوو، شەهی، خۆ گۆریکەر، گیان بەخش، ئەو کەسەی گیانی بەخت دەکات لە پێناو گەل و نیشتمان، یان هەر مەبەستەکی پیرۆزدا: *شەهید ناڤەکێ پیرۆزە لدەڤ مە کوردان.*

**شەیتان**

**شەیتان** (ن.) خێوێکی تووڕەیە، دیڤان. زۆرجار وێنەی شەیتان لە شێوەی نێرینەیەك دەکێشن، کە دوو قۆچ و کلکێکی هەیە.

**شەیپوورو کەڕەنا**: زوڕنای گەورە، کەڕەنێت، بووقی: لە تیپەکەی موزیکا شەیپوورو کەڕەنا لێدەدرا.

**شت** (ن.) چت، تشت، چشت: *چەند شتێکم لەگەڵ خۆ مێنابوون.*

**شتومەك** (ن.) تشت و مشت، کەلوپەل: *شتومەکی سەیرانمان ئامادە کردووە، با بڕۆین.*

**شڤان** (ن.) ١- شوان، ئەو کەسەی مەڕ لە لەوەڕگا دەلەوەڕێنێت: *شڤان پەز زڤراندەڤە.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**شکاندن** (چ.) ١- وردکردن، لەتکردن، پارچە کردن: *کێ پەنجەرەکەی شکاند؟* ٢- راونانی دوژمن: لە بەرەی شەڕدا دوژمن شکا.

**شکاندنەوە** (چ.) ١- ڤەشکاندن، شکاندنەڤە، دووبارە شکاندن: *باسکەکەم شکێنرایەوە، تا جارەکی تر هەڵبەسترێتەوە.* ٢- گەڵا یان لکە دار داشکاندنەوە.

**شکەفت** (ن.) ئەشکەوت: مرۆڤی کەڤن د ئەشکەڤتانڤە ژیایە.

**شـلەتێن** (ئـان.) شـیرتێن، شـیرەتێن، تهێن شیر، ئـاوی نیمچـە گـەرم: *هـەموو بـەیانیان دەسـتم بـە سابوون و ئاوی شلەتێن دەشۆم.*

**شڵەژان** (چ.) ڕاچەنین، شێوان، حەپەسان، وڕمان، تێکچوون، ترسان، فەجنقین: *خەڵك لەترسان شڵەژان.*

**شڵەژاندن** (چ.) راچڵەکاندن، ڕاچەناندن، تێکدان، شێواندن، تێکوپێکدان: *شەڕ بارودۆخەکەی شڵەژاند.*

**شڵپە** (ئان.) دەنگی ئاوە، کە شتێکی تێبخرێت، یا تێبیکەوێت، منداڵ زۆر حەز دەکات گەمە بە ئاو بکاتو شڵپەی لێوە بێنێت.

**شمشاڵ** (ن.) بلوێر، بلور، نـای، داری شمشاڵ: *کاکم شمشـاڵەکی چاك لێدەدا.*

**شنە** (ن.) ١– سروە، بای نەرم، کزە با، بایێ هێن: *شنەی بەیانیان خۆشە.* ٢– ناوە بۆ مێینە.

**شنەبا** (ن.) کزەبا، سروە: شنەبای دیموکراسی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست هەڵی کردووە.

**شنەی دەریا** (ن.) بایێ دەریایێ.

**شندۆخا** (ن.) *شندۆخا گوندەکێ نێزیك دهۆکێیە.*

**شوان** (ن.) بڕوانە: **شڤان**.

**شوفێر** (ن.) لێخوڕی ئۆتۆمبێل: *کاکەی شوفێر لەسەر خۆبەو ئاگادار بە.*

**شوین** (ن.) ١– شوون، شوێن، جە، جێگا: *کوردستان شوێنی کوردانە.* ٢ـ جێ پێ، شوێن پێ، دوا: *تانجییەکە شوێن کەروێشکەکە کەوت.*

**شوێن** (ن.) بڕوانە: **شوین**.

**شوێنەوار** (ن.) شووندار، پاشماوە، شینوار، شوینەوار، کەڤنار: *کوردستان پڕی شوێنەوارە.*

**شوورەیی** (ن.) ناشیرین، نەنگی: *ئەگەر ڕێزی بەرامبەرت نەگری زۆر شوورەییە.*

**شووشە** (ن.) جام، شیشە: *پەنجەرەکە لە شووشە دروست کراوە.*

**شووندار** (ن.) بڕوانە **شوێنەوار**

**شـــۆڕەکات** (ن.) شـۆڕەزار، شـامات، زەوی نـەزۆك: *زەوی شـۆڕەکات بۆ چاندنی دەغڵ‌و دان دەست نادات.*

**شۆخ** (ئان.) جوان، شەنگ، بەدەو، خۆشڕوو، قۆز.

**شـــۆردن** (چ.) شـۆرین، شویشـتن، شووشـتن: *هەموو جلوبەرگەکانیان شۆردم.*

**شۆڕەش** (ن.) شۆڕش، راپەڕینێکی بە کۆمەڵ‌و بەردەوامە بۆ گۆڕینی باری ژیان لەناخۆشی بۆ خۆشی: *شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٦١دا هەڵگیرسا.*

**شۆڕەکچ** (ن.) کچا سنیلە، هەرزەکار، کچی تازە پێگەیشتوو، کچی لە ژێردا هەڵچوو، رێك، شۆخ.

**شۆڕشگێڕ** (ئان.) ئەو کەسەی لە ڕاپەڕین‌و شۆڕشدایە دژی ستەم بۆ وەدەست هێنانی ئازادی: *من هەموو شۆڕشگێڕانی جیهانم خۆش دەوێت.*

**شۆستە** (ن.) گڤاندە، پیادەڕێ، کەنار، قەراغ، رۆخی جادەکان: *کە بە پێیانین پێویستە لەسەر شۆستە بڕۆین نەك لەسەر جادە.*

**شی** (ن.) شوو، هاوژینی ژن. ٢- لەبەر یەك هەڵوەشانی لۆکەو کولکە: *جۆلایەکە بە دار لۆکەکەی شی کردەوە.* ٣- ڕاڤە: *ئەم ڕستەیە شی بکەوە.* ٣- جودایی، لێکدوورکەوتنەوە.

**شـیان** (چ.) لە دەستهاتن، توانین، توانا: *ئەم نەشیاین زوو بگەمینە جهێ مەبەست.*

**شیاو** (ئان.) گونجاو، شایستە: *ئەم کارە بۆ من شیاوە.*

**شـیتەڵییە نۆژدارییەکان** (ن.) شرۆڤەکرنێن نۆژدارییێ.

**شیتك** (ن.) پشتێن، پشتێند: *من شیتکا خۆ گرێدایە.*

**شیر** (ن.) ١- شلەیەکی سپییە لە گوان و مەمك دەدۆشرێ: *منداڵەکە هەر تەنیا شیری دایکی*

دەخوات. ٢- شمشێر، قلنج: *جەنگی جاران بە شیر دەکرا.*

**شیرەت** (ن.) ئامۆژگاری، تەگبیر، راوێژ: *ب شیرەت ئەم دشێین پێشبکەڤین.*

**شیرەتکار** (ئان.) ئامۆژگار، راوێژکار، تەگبیرکەر: *ئەو شیرەتکارا جڤاتا وەزیرایە.*

**شیرەتکاری** (ن.) ئامۆژگاری، راوێژکاری: *مامۆستاکەمان بۆتە شیرەتکاری قوتابخانە.*

**شیرەخۆر** (ئان.) بەرشیر، ساڤا، ساوا: *منداڵی شیرە خۆرم خۆشدەوێ.*

**شیردەر** (ئان.) شیردار، ئەو گیاندارەی شیر دەداتە بەچکەکانی: *شەمشەمەکوێرە گیاندارەکی شیردەرە.*

**شیرین** (ئان.) ١- شرین، تامی خۆش، دژی تاڵ: *کەزۆ شیرینە.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**شیشە** (ن.) شووشە، جامی پەنجەرە، پیاڵە، ئیستکان: *ئەگەر ماڵا تە ژ شیشەی بوو بەران نەگرە ماڵا کەسێ.*

**شیڤ** (ن.) شیو، نانی ئێوارە: *فەرموو ماڵا مە شیڤێ بخۆ.*

**شیکردنەوە** (چ.) شرۆڤەکرن، شیتەڵکردن: *شیکردنەوەی ئەم رستەیە گرانە.*

**شیلە** (ن.) شیرە، شیلی، شیرەی گوڵ، گەنم، جۆ، شەکرو...: *مەنگ شیلەی گوڵان دەمژێت، جا دەبێت بە هەنگوین.*

**شیلەی گوڵ** (ن.) تامە خۆشەکەی ناو گوڵ، شیرەی گوڵ.

**شیم** (ئان.) هار، لاسار، نەحەجتی: *خۆ شیم نەکە.*

**شینبوون** (چ.) چەکەرە کردن، سەر دەرهێنان، سەوزبوون: *ئەو نەمامێن مە چاندین شین بوون.*

**شینچوونەوە** (چ.) شتێك رەنگی شین بنوێنێت: *لەبەر چاوم تابلۆکە شین دەچووەوە.*

**شینکردن** (چ.) ١- شیوەنکردن، گریان و رۆ رۆ کردن. ٢-

ڕەنگکردنی شتێك بە ڕەنگی شین.

**شیو** (ن.) بڕوانە **شیڤ**.

**شیواشۆك** (ن.) گوندێکە لە دەڤەری کۆیە نەوتی لێیە: *کورد لە شیواشۆك نەوتی بەرهەم هێناوە.*

**شینباو** (ئان.) مەیلەو شین، شتێکە بڕوانێ بەسەر شیندا: کراسەکی شینباوم لەبەرکرد.

**شێ** (ن.) ١– شە، نم، تەڕایی هەوا: *لە باشووری عێراقدا ڕادەی شێ لە هەوادا زۆرە.*

**شێدار** (ئان.) شەدار، بە نەو تەڕایی: *ژوورەکە شێدارە، بۆیە شتومەکەکان کەڕوویان هەڵهێناوە.*

**شێر** (ن.) گیانەدارەکی بەهێزەو لە دارستانەکاندا دەژی: *پێشمەرگە وەك شێر لە دوژمن ڕادەپەڕی.*

**شێرە کچ** (ن.) کچەکا ب جەرگ، چاو نەترسی: *لەیلا قاسم شێرە کچەکا کورد بوو.*

**شێرزاد** (ئان.) ١– بەچکە شێر: (ن.) ٢– ناوە بۆ نێرینە.

**شێلان** (چ.) پەرخاندن، ڤەمالین: *شێلانا نەرم بۆ لەشی یا باشە.*

**شێلی** (ئان.) شیلو، لیخن، لێڵ، قوڕاو: *بەهارێ ئاڤا زێی شێلی دبیت.*

**شێنەیی** (ن.) ل سەرخۆیی، هێدی: *بە شێنەیی لەگەڵی بدوێ.*

**شێواز** (ن.) جۆر، شێوە، وێنە: *شێوازەکێ نڤیسینێ یێ باش تە هەیە.*

**شێوە** (ن.) ١– جۆر: *بەهیچ شێوەك دڵم لێت نەیەشاوە.* ٢– وێنە، سەروسیما: *شێوەکەی جوانە.*

**عاقڵ** (ئان.) بە کەسێکی ژیر و زانا دەڵێن.

**عەرەفە** (ن.) ١- گەڕەکەکی شاری کەرکووکە. ٢- چیایەکە لە سعودیە کە رێو رەسمی حەجکردنی تێدا بەڕێوە دەچێت.

**عەرد** (ن.) زەمین، زەوی، هەرد: *عەردێ کوردستانێ ب خێرو بێرە.*

**عەسر** (ئاک.) ١- سەدە، دەم: *عەسرەکە کورد دەچەوسێنرێتەوە.* ٢-کاتی نێوان نیوەڕۆو ئێوارە: *عەسرێ دەچمە بازاڕ*

**عەگید** (ئان.) مێرخاس، چاڤ نەترس، ئازا، جوامێر: *پێشمەرگە عەگیدو چاڤ نەترسن*

**عەلیشیش** (ن.) عەلەشیش، قەلەموون، عەلۆعەلۆ، قەل: *عەلیشیش لەسەر هێلکەکانی کڕ دەکەوێت، جا کۆمەڵێک جووجەڵە هەڵدێنێت.*

**عەمار** (ن.) عەمبار، ئەمبار، ئەنبار، کۆگا: *کورد هەرژ ماڤینێ*

*دەخڵ و دانی بۆ زڤستانێ عەمبار دکەن.*

**عەممان** (ن.) پایتەختی شانشینی ئوردنە.

**عەمیم** (ئان.) عمومی، گشتی: دەچمە *کتێبخانەی عەمیمی بۆ کتێب خواستن.*

**عیبری** (ن.) زمانێ جوهییانە: *کەلی ئیسرائیلی بە زمانێ عیبری دەئاخڤن.*

**عیراق** (ن.) وشەیەکی کۆنی سۆمەرییە، واتای ولاتی نزم دەگەیەنێت: *عیراق دەولەتێکی دەستکردە.*

**عیلمانی** (ن.) سیستەمەکی فەرمانڕەواییە لە زۆربەی ولاتانی جیهان پەیڕەوی دەکەن، هەوڵ دەدا لایەنی دینیو سیاسی لە یەك جیا بکاتەوە: *تورکیا دەولەتەکی عیلمانییە.*

**غار** (ن.) را، تاو، ترات.

**غاردان** (چ.) ١– تاودانی ولآخی سواری وەك ئەسپو ماین. ٢– راکردن، هەرا کردن، دەرپەڕین: *مەرکە منداڵەکە باوکی خۆی دیت غاریدا بۆ لای.*

**غار غارین** (ن.) هێنان و بردنی ولآغ بە تاو، قۆشمە کردن، غاردانێ، راکردن، رمبازی: *ئەو سوارانە غار غارین دەکەن.*

**غافڵ** (ئان.) خافڵ، بێ ئاگا: *غافڵ بوون لە شوفێریدا مەترسیدارە.*

**غەم** (ن.) خەم، دڵتەنگی، پەشێوی، کۆڤان: *مێندێك کەس هەن بەبێ مۆ غەم لە خۆیان باردەکەن.*

**غەمبار** (ئان.) خەمبار، دڵتەنگ،: *ئەو زۆرجار غەمبارە.*

**غەمخۆری** (ن.) خەمخۆری.

**غەیبیەت** (ن.) *باسکردنی خەڵك لە پشتە ملە بە خراپە.*

**غونچە** (ن.) خونچە، گوڵی نەپشکوتوو، بشکوژ، کولیلك.

**غیرەت** (ن.) ئازایی، کەسێك هەڵوێستی مرۆڤانە بنوێنێت.

**غەوارە** (ن.) بێگانە، بیانی: *هەزار ساڵ بکەی غەوارە پەرستی لە ئەنجامدا دەمێنی نوشستی.*

**فـــارس** (ن.) نـــاوی گەلێکــە لــە رووی زمانەوە خزمایەتی لەگەڵ زمـانی کوردیدا هەیە، هەروەکو زمانـانی تـــات، تـــالیش، مازنـــدەران، گیلەکی، بلـووژی، تـاجیکیو...، کـــە ئەمانـــەش هـــەموو خزمایـــەتییان لەگـــەڵ زمـــانی کوردیدا هەیـەو سـەر بـە گروپـی زمانانی ئێرانین.

**فاشســـت** (ئـــان.) رەگـــەز پەرســـت: *مۆســـــۆلینی ســـــەرکردەی فاشیستەکانی ئیتالیا بوو.*

**فاکتـــەر** (ن.) هۆکـــار، هۆیـــەك لـــە هۆیەکان: *زۆر سەیرکردنی تەلــەڤزیۆن فاکتـــەرەکی تێکچـــوونی چاوە.*

**فاکس** (ن.) جۆرە ئامێرەکە نامەو نووسراوی بۆ کەسێکی دی پیٚ دەنێریت، بەڵام دەبێت کەسەکەی دیش فاکسی هەبێت: نامەیەکم بە فاکس بۆ هەڤاڵەکەم نارد.

فانۆس

**فـــانۆس** (ن.) فـــانۆز، فـــانووس، چـــرای دەســـتی، قەنـــدیل: *فانۆســـەکە هەڵکە، چاوم هیچ نابینیٚ.*

**فەجرو سەحەرێ** (ن.) کازیوەی بەیان، بەیانی زوو: *لەگەڵ فەجرو سەحەرێ گەشتەکەم دەکەم.*

**فەخفوری** (ن.) فەرفوری، دەفری چینی: *قاپی فەخفوری زۆر بەکاردێت.*

**فەرامۆشکردن** (چ.) پشت گوێ خستن، لەبیرکردن، شت لەبیرچوون، ژ بیر کرن: *خەم و ئازار فەرامۆش کە.*

**فەرامۆشی** (ن.) سەبووری، دڵنەوایی، دڵ ئارام بوونەوە لە خەم خواردندا: *ئەو فەرامۆشی بوو بۆ من.*

**فەرمان** (ن.) ١– ئەرک، ئەمر، فرمان. قسەی گەوران کە دەبێ جێبەجێ بکرێ: *ئەو فەرمانی پێدام کە وا بکەم.* ٢– کار، شۆل، ئیش: *بە فەرمانی میری دامەزرام.* ٣– کردار، کار بەشێکی ئاخاوتنە لە زمانی کوردیدا.

**فەرمانبەر** (ن.) کارمەند، پیاوی میری، کاربەدەست: *باوکم لە کارگەی مافووری هەولێر فەرمانبەرە.*

**فەرمانڕەوا** (ئان.) خودان دەستەڵات، حاکم: *خانزاد فەرمانڕەوای میرنشینی سۆران بوو.*

**فەرموو** (ن.) کەرەمکە، گوتنەکی پیرۆزە بە بەرامبەر دەگوترێ بۆ کارەک : *تکایە فەرموو دانیشە.*

**فەرمی** (ئان.) رەسمی: *پۆلیسەکان بەجلی فەرمی بوون.*

**فەرهەنگ** (ن.) ١– قاموس، وشە دانان و رێکخستن و مانا لێکدانەوەیان: *ئەم کتێبەی بەر دەستت فەرهەنگە.* ٢– رۆشنبیری، ئاوەز، چاند: *لە کوردستاندا چەندین سەنتەری فەرهەنگی دامەزراون.*

**فەریکەرۆن** (ن.) نفیشک، نیڤشک، کەرە: *فەریکە رۆن لە شیر دروستدەکرێت.*

**فەڕ** (ن.) پیتو بەرەکەت، پیرۆزی، سوود. بە—: بە سوود، بە کەلك. بێ—: بێسوود، بێکەلك. بەد—: بەدشووم.

**فەقمە** (ن.) گیاندارەکی ئاوییە: *فەقمە لە زەریادا دەژێت.*

**فەندوفێڵ** (ن.) حیلەو حەواڵە، فێڵبازی، تەڵەکەبازی، فڕوفێڵ: *هیچ کارەك ب فەندوفێڵان ناچێتەسەر.*

**فەوتان** (چ.) ژناڤچوون، لەبەینچوون، نەمان، لەدەستچوون: *قەرز کۆن دەبێ، بەلام نافەوتێ.*

**فراوان** (ئان.) فرەهـ، بەرفرەهـ، گوشاد، بەرین، پانو پۆڕ، گەورە: *گۆرەپانەکی فراوانمان لە قوتابخانەدا هەیە.*

**فراخ** (ن.) قاپو قاچاخ، ئامان: *فراخ شووشتن ئەرکی سەرشانی منە.*

**فراڤین** (ن.) نانی نیوەڕۆ: *منو مەڤاڵ خۆ پێکڤە فراڤین خار.*

**فرە** (ئان.) گەورە، بەرین، پان، زۆر: *فرە رەنگیو فرە دەنگی ولات پێشدەخات.*

**فرە رەگەز** (ن.) فرە نەژاد، هەمە چەشنی نەتەوە: *بە یارمەتی لەشکری فرە رەگەزەکان عێراق لە رژێمی دیکتاتۆری رزگاری بوو.*

**فرەنجی** (ن.) کەپەنك، وەکو پاڵتۆ وایەو لە خوری دروستدەکرێت: *شوانەکە فەرەنجی لەبەر کردووە.*

**فرەهـ** (ئان.) بڕوانە: **فرە**.

**فرمان** (ن.) بڕوانە: **فەرمان**.

**فرمێسك** (ن.) ئەو دڵۆپە ئاوانەی کە لە چاو دێن لەکاتی گریاندا. بڕوانە: **ئەسرین**.

**فرۆشتن** (چ.) فرۆتن، پێدانی شتێك بەرامبەر پارە: *خانووە کۆنەکەمان فرۆشت.*

**فریا** (ن.) ١— هاوار، هانا: *هانام بۆ تۆ هێناوە فریام کەوە.*

**فریاگوزاری** (ن.) بەهاوار هاتن، د هانا هاتن، د هاوارچوون، بە تەنگەوە بوون، بە دەنگەوە چوون: *نەخۆشخانەی فریاگوزاری خزمەتی زۆر بە خەڵک دەگەیەنێ.*

**فریودان** (چ.) خەڵەتاندن، شێواندن، چەواشەکردن، سەردابرن: *فریودانی خەڵک زەرەری خۆتی بەدواوەیە.*

**فڕفڕۆکە** (ن.) فڕفڕۆك، جاران لە قاقەز، ئێستە لە قاقەز وەیا نایلۆن دروستدەکرێت و چوار پەڕی هەیە و لە بەشی سەرەوەی چیلکە دارێکی پێوە دەچەسپێندرێت هەرکە کزەبایەك لێبدات دەسوورێت: *دایە فڕفڕۆکەیەکم بۆ بکڕە.*

فڕۆکە

**فڕۆکە** (ن.) تەیارە، باڵەفڕ: *خەڵک بە فڕۆکە سەفەر دەکەن.*

**فڕۆکەخانە** (ن.) فڕینگەهـ، ئەو شوێنە دیاریکراوەیە کە فڕۆکەی لێ دەنیشێ و هەڵدەستێ: *مەولێر فڕۆکەخانەیەکی نێو دەوڵەتی لێیە.*

**فڕۆکەوان** (ن.) فڕۆکەڤان، شۆفێری فڕۆکە: *حەز دەکەم ببمە فڕۆکەوان.*

**فڕۆکەی پەروانەدار** (ن.) هێلیکۆپتەر، ئەو فڕۆکەی بە پەروانە بڵند دەبێ.

**فڕین** (چ.) لە شەقەی باڵدان: *کۆتر لە سەربانی فڕین.*

**فڕێدان** (چ.) هاڤێتن، هاویشتن: *نابێت زبڵ فڕێ بدەینە بەر دەرگای ماڵ.*

**فشار** (ن.) گوشار، پاڵەپەستۆ، گڤاستن، تەنگاوکردن، تەنگ پێهەڵچنین: *فشارەکی زۆرم خستە سەری تا کارەکەی بۆ کردم.*

فلچە

**فلچە** (ن.) فرچە: فلچەی بۆیەکردن یان ددان شوشتن: *هەموو شەوان پێش نوستن ددانم بە فلچەو هەویری تایبەت دەشۆم.*

**فوارە** (ن.) ئافچزك، فیچقە، بە تەوژم بەرز بوونەوەی ئاو: *ئاوەکە فوارەی دەکرد.*

**فورات** (ن.) ڕووبارەکی درێژە لە باکووری کوردستان هەڵدەقوڵێت.

**فویریان** (چ.) هەڵچوون، سەرداچوون، رابوون: *ئەو شیرێ لسەر ئاگری فویریا.*

**فوو** (ن.) پف، ئەو بایەی بە هەردوو لێو دروست دەکرێ: *هەموو ئاگرەك بە فوو ناکوژێندرێتەوە.*

**فوودراو** (ئان.) پفدای: *میزڵدانەکەم فوودراوە.*

**فیدراڵی** (ن.) جۆرە شێوازەکی سیستەمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتە: *کوردستان شێوەی فیدراڵی لەگەڵ حکومەتی عیراق هەڵبژاردووە بۆ پێکەوە ژیان.*

**فیڕۆ** (ن.) خۆڕایی، بەلاش، لە ختو خۆڕا: *من کاتم بە فیڕۆ نادەم.*

**فیشەك** (ن.) گوللە، بەرك: *نابێت دەستکاری فیشەك بکەین، چونکە مەترسیدارە.*

**فیکە** (ن.) فیتە، شاور، فیتك: *دادوەرەکە بە فیکە یارییەکەی ڕاگرت.*

**فیلمساز** (ئان.) فیلم بەرهەمهێن: *فیلمسازەکە پارەیەکی زۆری لە فیلمی (ژیان) خەرج کرد.*

**فێربوون** (چ.) ١- ڕامبوون، ڕاهاتن، هیربوون، هیبوون، تێگەین، پەروەردە بوون: *ئەگەر خۆت ماندووکەی فێر بوونی هیچ شتەك زەحمەت نییە.* ٢- خووگرتن بە شتەك، ڕاهاتن بە شتەك: *ئەو فێربووە هەردەنگ بێت.*

**فێرکـــار** (ئـان.) فێرکـەر، مامۆســتا، ســەیدا: *فێرکــار قوتــابی فێــر دەکات.*

**فێرگــــە** (ن.) خوێنــدنگا، شــوێنی فێریـــــوون، قوتابخانــــــە: *گوندەکــەمان پێویســتی بــە فێرگەیەک هەیە.*

**فێـڵ** (ن.) فریـو، حیلـە، سـووڕ، دزی: *فێڵ لە خەڵک کردن باش نییە.*

**فێنــک** (ئـان.) ١- نەسـاردو نەگـەرم، هــێن، هــوون، هــام ناوەنــدی، هوونك: *ئاو و هـەوای کوردستان لە بەهاران فێنکە.* ٢- نـاوە بۆ مێینە.

**فێقـی** (ن.) میـوە، تـەرە: *سـێف ژ فێقیێن باشە.*

**ڤالاهی** (ن.) بۆشایی، بەتاڵی، خاڵی

**ڤان** (ج.) ئەمانە: *ڤان کچ و کوڕان پێکڤە سەیران کر.*

**ڤەڕێژ** (ن.) ناوەڕۆکی کتێب و نووسراو: *ڤەڕێژی ئەم نووسراوە دیار نییە.*

**ڤەڕێکرن** (چ.) ڕەوانە کردن، ناردن: *نامەیەکێ بۆ بابێ خۆ ڤەڕێکە.*

**ڤەژین** (چ.) ١– بووژانەوە، زیندووبوونەوە، گەشانەوە: *دەما باران باری گول و گیا ڤەژینەڤە.* ٢– ناوە بۆ مێینە.

**ڤەشارتن** (چ.) شاردنەوە، پەنهانکردن: *زارۆکان کەلوپەلێن خۆ ڤەشارتن.*

**ڤەکرن** (چ.) کردنەوە: *مەمی دەرگەه بۆ مەوە دڤەکرینە.*

**ڤەکۆلین** (چ.) لێکۆڵینەوە. *پێدڤییە ڤەکۆلین ل سەر هندێ بێنە کرن.*

**ڤەگەریان** (چ.) زڤڕین: *پەنابەر بۆ وڵاتێ خۆ ڤەگەڕیان.*

**ڤی** (ج.) ئەڤی، ئەم، بۆ نێری نزیک: *ڤی وەرزی ئەم دچینە سەیرانێ.*

**ڤێ** (ج.) ئەم: بۆ مێی نزیک: *ژ بەر ڤێ بارانێ ئەز ژ ماڵ دەرنەکەڤتم.*

**ڤێجا** (ئام.) ئینجا، فێجا، پاشان، دواتـر، ئـەوجا، جـا: چـوومە ورمێ *ڤێجا سلێمانی* .

**ڤێکـڕا** (ئاك.) بەیەکەوە، پێکەوە: *ئەم ڤێکڕا خەباتێ دکەین.*

**قات** (ن.) ١- نهۆم: *خانووەکەیان دوو قاتە*. ٢- چین، جار، بڕ، ئەندازە: پاداشتی *ئەوان دووقاتە*. ٣- دەستەیەك لە جلوبەرگ: هەژار قاتەکی جوانی کڕی. (ئان.) ٤- نەهات، گران، قەتلازی، دەست نەکەوتوو، قاتو قڕی: قاتو قڕییەکە ئەو سەری دیار نییە.

**قاپ** (ن.) ئامان، دەفر، قاپو قاچاخ: *قاپەکان جوان بشۆن*.

بڕوانە فراخ.

**قاپی** (ن.) دەرگا، دەرکە، دەرگەه: *قاپییەکە باش دابخە*.

**قاچ** (ن.) لاق، پا، پێ لینگ، لنگ: *لە ڕاکردنەکەوە قاچم ژاندەکات*.

**قارەمان** (ئان.) ئازاو بە جەرگ، قەهرەمان، پاڵەوان، دلێر، عەگید: *کورد لەنێو دوژمنانیشدا بە قارەمان ناسراوە*.

**قارەمانی** (ن.) پاڵەوانی، بە جەرگی: *باپیرێ من چیرۆکەکا قارەمانیێ بۆ مە گوت*.

**قارچك** (ن.) کڤارك، کوارگ: *خواردنی قارچك زۆر خۆشە*.

قاز

**قاز** (ن.) باڵداره‌كی سپیی مل درێژی ئاوییه: *له كۆنا قاز بۆ پاسه‌وانی شوێنی گرنگ به‌كار ده‌هێنرا.*

**قاسپه‌قاسپ** (ن.) قه‌ب قه‌ب، ده‌نگی كه‌و: *قاسپه قاسپی كه‌و زۆر خۆشه.*

**قاش قاش** (ئان.) پارچه‌پارچه، له‌تله‌ت: *ته‌ماته‌و ئارووه‌كه قاشقاشكراون.*

**قاغه‌ز** (ن.) قاقه‌ز، كاغه‌ز: *قاغه‌ز نه‌بێ، كتێب نابێ.*

**قاق** (ئان.) ١- میوه‌و دانه‌وێڵه‌ی وشك. ٢- (ن.) قاورمه، قه‌ری، قه‌لی، قه‌رییه: *دایكم بۆ زستان قاقی دروستكردووه.*

**قاقای پێكه‌نین** (ن.) تریقه‌ی پێكه‌نین، پێكه‌نینی به‌ده‌نگ: *سیروان له پڕ دایه قاقای پێكه‌نین.*

**قاڵی** (ن.) مافوور، مافویر، رایه‌خ، مه‌حفیر، به‌ڕه: *ئه‌م قاڵییه ده‌ستكرده نموونه‌ی جوانییه.*

**قامیش** (ن.) له‌ڤه‌ن، چیتك، جۆره رووه‌كه‌كه له بواره‌كانی كاری ده‌ستیش به‌كاردێ: *ئه‌م نووسراوه‌م به قه‌ڵه‌می قامیش نووسیوه.*

**قاوغ** (ن.) قالك، قه‌پێلك، قه‌لپیچك، به‌رگ، كارتۆن، كالان: *خۆی له قاوغ ناوه.*

**قایم** (ئان.) ١- مكوم، موكوم، توندوتۆڵ: *ده‌رگاكه زۆر قایمه.* ٢- خنس، برسی، ره‌زیل، قرچۆك: *له پاره‌داندا زۆر قایمه.* ٣- توند، به‌هێز: *قایم بانگی بكه.*

**قایمكردن** (چ.) توندكردن، باش به‌ستن، پته‌و كردن، مكومكرن: *قایمكردنی سنووره‌كان*

هۆکارەکە بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات.

**قەبارە** (ن.) ١- قەوارە، ئەندازەی شت، بارستایی: لە قەبارەی خۆی زێتر بە خەڵك هەڵمەڵێ.

**قەتاندن** (چ.) پچڕاندن، بەسەربردن، بەڕێکردن، قوتکردن، پرچاندن، پچاندن: هاتنوچوونا د ناڤبەرا خزماندا نابیت بهێتە قەتاندن.

**قەد** (ن.) ١- بەژن، باڵا: ئازاد قەدو باڵایەکی درێژی هەیە. ٢- کەمەر، ناڤتەنگ: پشتێنەکەت لە قەد ببەستە. ٣- دار لە بنەوەڕا تا دەگاتە لکەکانی: قەدی دارەکان نەڕووشێنی. ٤- ئەندازە، هێندە: من تۆم بە قەد خوشکەکانم خۆشدەوێت. ٤- قەد پاڵ: بزنە کێوییەکەم لە قەد شاخەکەدا بینی.

**قەدەغە** (ن.) ١- پاوان، قەدەخە. ٢- ڕێ پێنەدراو: مەلگرتنی چەك لەناو بازاڕدا قەدەغەیە.

**قەدەغەکردن** (چ.) نەهێلان، نەهێشتن، یاساغ کردن: قەدەغەکردنی هاتوچۆ بۆ چاککردنی شەقامەکە بوو.

**قەدپاڵ** (ن.) بنار، قەد: بە قەدپاڵی شاخەکەدا هەڵگەڕاین.

**قەراغ** (ن.) کەناری شت، ڕۆخ، لێوار، دەم، دەو، جەم: لە قەراغ ڕووبارەکە دانیشتین.

**قەرەبوو** (ن.) بژاردنەوەی زیان: حکومەت قەرەبووی زیان لێکەوتووانی کردەوە.

قەرەنفول

**قەرەنفول** (ن.) مێخەك، قەرەنفول جۆرە گوڵەکە ڕەنگی زۆرە،

گەلاکانی زۆر لە پاڵ یەکترن: *باخەکەمان قەرەنفولی تێدایە.*

قەرسیل (ن.) گەنم یا جۆ لە بەراودا چاندن، بۆ لەوەڕاندنی مەڕو بزن پێش گیا پێگەیشتن، قەسیل: *مەڕەکە چۆتە ناو قەرسیلەکە.*

قەزا (ن.) شارۆچکە، یەکەیەکی کارگێڕیی دەوڵەتە، لە پارێزگە بچووکترە: *ئامێدی قەزایەکا گەلەک کەڤنە.*

قەزوان (ن.) بەری داری قەزوان (دارەبەن)، کەزوان، کەسکان، کەزان: *هەندەک قەزوانم کڕی.*

قەلا (ن.) قەلات، کەلهە، کەلێ، بینایەکی گەورەو کۆنە، دیوارەکانی دەورووبەری پتەون. هێندێك جار بورجیشی هەیە، جاران دەسەلاتداران و سوارچاکان و.. تێیدا دەژیان، خانووی بنکەی چەکداران لەسەر کێو، یا شوێنەکی بەرز.

قەلغان (ن.) مەتاڵ، قەلخان، زرێ و کونزری، ئەو چەکەی کە شمشێر بازان لەبەرامبەر خۆیان بۆ خۆپاراستن رایدەگرن. *ئێوە قەلغان و سوپەری ئێمەن.*

قەواره (ن.) ١- کیان، دەوڵەتی سەربەخۆ: *کورد بەرەو پێکەوەنانی قەوارەیەکی سەربەخۆ هەنگاو دەنێ.*
٢- بڕوانە قەبارە.

قەوزە (ن.) کەفز: *ئەو گیا سەوزەی لە بنی ئاودا شین دەبێ.*

قەولدان (چ.) گفتدان، بەڵێندان: *قەولم بە تۆ داوە یارمەتیت بدەم.*

قرچەقرچ (ن.) دەنگی سووتان و شکانی شتومەك: *ددانەکانی لە سەرمان قرچەقرچیان لێوەدەهات.*

قڕ کردن (چ.) کوشتنی بە کۆمەڵ، جینۆساید، لەناو بردن، رەشەکوژی: *رژێمی بەعس سیاسەتی قڕکردنی بەرامبەر کورد بەکارهێنا.*

قرژاڵ (ن.) کێفژاڵە، جۆرە گیاندارەکی وشکاوییە بە دوو سەرە

دەپوات، قـــارژنگ، قـــرژانگ: وشیار بە قرژاڵەکە نەتگەزێ.

**قژ** (ن.) پرچ، مووی سەر: *من مانگێ دوو جار قژم دەتراشم.*

**قسە** (ن.) ئاخاوتن، وتە، گوتە: ئەگەر *دەتوانیت بە قسە مەبەستت دەربرە.*

**قسەشکاندن** (چ.) ئاخافتن شکاندن، لەقسەدەرچـوون، بـەگوێ نەکردن: نابێ قسەی دایکو باوکمان بشکێنین.

**قسەکردن** (چ.) ئاخافتن، پەیڤین: قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە بەسوودە.

**قسەی پاراو** (ئان.) قسەی جوان، وتەی ڕێك، قسەی بژارەو پوون: *لەکاتی نووسیندا دەبێت قسەکانت پاراو بن.*

**قسڵ** (ن.) کسل، قسر، جۆرە بەردێکە: *منارە کۆنەکان بە قسڵو گەچ دروست دەکران.*

**قلیشاندن** (چ.) کەلاشتن، قەلاشتن: درز تێکردن، لەبەر یەك بردن: *هەموو دارەکانی قلیشاندن تا زستان بیانخاتە سۆبەوە.*

**قوپـــان** (چ.) وێکهاتنـــەوە، چوونەوەیەك، داکەتن، ڕۆچوون، نـــاو ئێکداچـــوون، تـــەبقین: *قوتووەکان لە کاتی بارکردندا قوپاون.*

**قوتە** (ئان.) قوپ، خڕکەڵە، کوڵە بنە، کورتەبنـە، کورتـەبالا: *منـداڵی قوتە گورجو کوڵە.*

**قوتوو** (ن.) قودیك، قودی: *خواردنی قوتـــوو مـــاوەی ئیـــاریکراوی لەسەرە.*

**قوتوویەند کردن** (چ.) دە دەفرکردن، لە قوتوونـان، داپۆشـین: *لـە کوردستان کارگەیەکی نوێی لە قوتوونان کراوەتەوە.*

**قورئـــان** (ن.) کتێبـــی پـــیرۆزی موسڵمانان: *بۆ یەکەمین جار قورئان لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفان کۆکرایەوە.*

**قـورس** (ئان.) ١- بسەنگ، سەنگین: *کیسەکە قورس بوو نەمتوانی بە*

*شان مەلیکرم.* ٢- گران: پرسیارەکان قورس بوون.

**قوڕ** (ن.) هەڕی، تەقن، حەڕی، خۆڵی لەگەڵ ئاو تێکەڵکراو: *ئەو خانووە لە قوڕ دروستکراوە.*

**قوڕقوشم** (ن.) رەساس، کانزایەکی نەرم و سپییە لە پیشەسازیدا بەکاردێت.

**قولغ** (ن.) ١- شوێنی بڵند: *جاران قەڵاکان لە شوێنی قولغ دروست دەکران.* ٢- خانوویەك بووە لەسەر رێگەوبانان لە سەردەمی عوسمانییدا دروستدەکرا بۆ وەرگرتنی باج لە هاتووچۆکەران.

**قولینگ** (ن.) ١- کولینگ، پاچی دوو سەر، ئامێری زەوی هەڵکەندن. ٢- جۆرە باڵدارەکە: *دەنگی قولینگان لە ئاسمان دێ.*

**قومقۆکە** (ن.) خەمەگروو، کمکمە، کومکمە، جۆرە گیاندارەکە لەناو تاشە بەردەکاندا دەژیت.

**قونگرە** (ن.) کۆنگرە، بورج، قەڵای سەربازی: *کوردستان پڕە لە ئاسەواری قونگرە.*

**قوو** (ن.) قاو، دەنگی بەرز: پەڕی قوو نەرمە بۆ سەرین.

**قووتدان** (چ.) داعویران. کە تۆ خواردن دەخەیتە نێو دەمت دوای ئەوەی باش دەیجویت، بە گەرووت دەیبەتە خوارەوە، یانی قووتیدەدەیت.

**قووچەك** (ن.) کوچەك، قووچەك شێوەیەکی ئەندازەییە: ئەهرامەکانی میسر لە شێوەی قووچەکدان.

**قووقە** (ن.) دەنگی کەڵەشێر: *کەڵە شێرەکە قووقاندی.*

**قووڵ** (ئان.) قۆر، قۆڵ، کویر، کوور: *رووبارەکە قووڵ بوو نەمتوانی خۆمی لێدەم.*

**قووڵایی** (ن.) ١- قۆرایی، چاڵایی، کویراتی: *قووڵایی رووبارەکە چەندە؟* ٢- لە ناوەوە، لە ناخەوە، لە کانگا، نیڤەك: *لە قووڵایی دڵەوە سوپاست دەکەم.*

**قۆپچه** (ن.) دوگمه، قومچه: *قۆپچه‌ی کراسه‌که‌م پچڕا.*

**قۆرییه** (ن.) گیشه گیا، ده‌های گیای، گزرا گیای، گرشه، گیای له‌سه‌ر یه‌ك دانراو، باقه، مه‌ڵۆ.

**قۆزاخه** (ن.) ١- شکۆفه په‌مۆی نه‌گه‌یشتوو: *په‌مۆیه‌که مێشتا قۆزاخه‌یه.* ٢- په‌مۆی ته‌رخانکراو بۆ رستن. ٣- پارچه‌یه‌ك له چوار پارچه.

**قۆقز** (ئان.) خویل، ده‌رپه‌ڕیو، زه‌ق: *ئاوێنه‌ی قۆقز وێنه‌ی ئاسایی ده‌رناخات.*

**قۆڵ** (ن.) ١- باشك، باسك، پیل، له ئانیشك به‌ره‌و ژوور تا شان. ٢- لا، ته‌ره‌ف: *ئه‌وان له‌و قۆڵه ده‌ژین.* ٣- قۆڵ، زۆر نه‌وی، کویر، چاڵێکی نه‌وی: *بیره‌که قۆڵه.*

**قۆناغ** (ن.) ١- یه‌ك ڕۆژه ڕێ: *له گه‌شته‌که‌مان قۆناغه‌کمان بڕیوه.* ٢- ماڵی زۆر به‌میوان، دیوه‌خان، جێگای حه‌سانه‌وه: *ماڵی باپیرم جێ قۆناغه.* ٣- ماوه، کات: قۆناغی سه‌ره‌تایی زۆر گرنگه. ٤- ده‌سکه داره‌که‌ی تفه‌نگ، که ده‌کاته داره‌که‌ی خواره‌وه: *به‌عسێکان بریندار‌ه‌که‌یان به قۆناغه تفه‌نگان کوشت.*

**قیرتاو** (ئان.) جاده‌ی قیر کراو، جادا قیڕ کری: *زۆربه‌ی جاده‌کانی کوردستان قیرتاو کراون.*

قیساره

**قیساره** (ن.) جۆره ئامێره‌کی مۆسیقایه، که بۆ یه‌که‌مین جار له سۆمه‌ردا بینراوه. بڕوانه هارپ.

**ڤیق** (ئان.) دالگۆشت، باریک، لاواز: *منداڵەکە ڤیقە.*

**ڤێز** (ن.) بێز، دڵ تێکچوون لە دیتنی شتێ: *ڤێزم لەو شوێنە پیسە بووەوە.*

**کا** (ن.) ١- قەسەری دوای گێرەکردنی دەغڵو دانەو دەکرێتە ئالیکی مەڕو ماڵات: *کا ئالیکی وڵاغە.* ٢- (ئام.) لە کوێ، کوانێ، کوا: *کا ئازاد لە کوێیە؟*

**کابان** (ن.) ١- ژنی ماڵ، کەیبانوو، کابانی: *ئازدار کابانەکی خاوێنە لە ماڵ.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**کات** (ن.) سات، ماوە، وەخت، دەم، تاو: *نابێ کات بە فیڕۆ بدەین.*

**کاتژمێر** (ن.) سەعات، دەمژمێر: *لە کاتژمێر حەوتی بەیانی لە خەو هەڵدەستم.*

**کاتی** (ئان.) بۆ ماوەیەك، وەختی: *دەستوور دوو جۆری هەیە، کاتیو هەمیشەیی.*

**کار** (ن.) ١- ئیش، پیشە، شۆڵ: *کاری باوکت چییە؟* ٢- کردەوە، ڕەفتار: *وا مەکە، ئەمە کارەکی ناشرینە.* ٣- کار، کارك، کاریلە: بزنا مە دوو کارك بوون. ٤- کردار، فرمان، بەشەکە لە بەشەکانی ئاخاوتن.

**کارامە** (ئان.) شارەزا، لێهاتوو، شیاو، کارزان، زرنگ، دەستڕەنگین:

*باوكی نەوزاد وەستایەكی كارامەیە.*

**كارەبا** (ن.) ١- تەزووی كارەبا، ئەلیكتریك، هێزی وزەدار: *كارەبا نێو ماڵو شەقامەكان ڕووناك دەكات.* ٢- جۆرە مۆرووێكە، كاروبی.

**كارەسات** (ن.) ڕووداو، مەرگەسات، بەسەرهاتی ناخۆش: *كارەساتا هەلەبجەیا شەهید ژ بیرا مە ناچیت.*

**كاربەدەست** (ن.) فەرمانبەر، پیاوی میری، مووچەخۆر: باوكم *كاربەدەستی میرییە.*

**كارتێكردن** (چ.) كاریگەری: من لە ژێر كارتێكردنی مامۆستامم.

**كارخانە** (ن.) جێگەی كاری پیشەسازان، كارگە، فابریقە: *باوكم لە كارخانەی شەكری قەند كاردەكات.*

**كارك** (ئان.) كارگ، نەگەییو، كەرك، نەگەهشتی، كاڵ: *وریابە مەیخۆ هێشتا كاركە.*

**كاركردن** (چ.) ئیش كردن، شۆل كرن: *بە دڵسۆزی كاردەكەم.*

**كارگوزاری** (ن.) خزمەتگوزاری: *شارەوانی لایەنەكی كارگوزارییە كە خزمەتی هاوڵاتیان دەكات.*

**كارگێڕی** (ن.) بەڕێوەبەری، بەڕێوەبەرایەتی: *ئازاد شارەزاییەكی باشی لە كارگێڕی ئەم كارگانەدا هەیە.*

**كارلێككرن** (چ.) كارتێككردن، باندوور كرن: *بە كارلێككردنی هەندەك گاز، گازی دی پێكدەهێنن.*

**كاروبار** (ن.) كار، شۆل، ئیش، كارو كۆك: *كاروبارێ مە ژ جاران چێترە.*

**كاروباری ماڵەوە** (ن.) ئیشی ماڵێ، كاری ماڵەوە: *دایكم زیاتر خەریكی كاروباری ماڵەوەیە.*

**كاریگەر** (ئان.) بەكار، كوشندە، كارتێكەر: *دەرمانەكە زۆر كاریگەر بوو.*

**كارێز** (ن.) ئەو ئاوەی بە ژێر زەویدا لە بیرێكەوە بۆ بیرێكی دی لە

شوێنێکی بەرزەوە بۆ شوێنێکی نزم دەهێنرێت.

**کازیوە** (ن.) کازێوە، بەرەبەیان، رووناکی بەیانی، شەبەق، تیرۆژکێن سحاریْ: *دیمەنی کازیوە دڵڕفێنە.*

کاس

**کاس** (ن.) ١- گێژ، وڕ، سەر سوڕماو، تاساو: *بەم دیمەنە کاس بوو.*
٢- جام، کاسە: *قوتابخانەکەمان لە چالاکی وەرزشی ئەمساڵدا کاسی یەکەمی بەرکەوت.*

**کاسەلێس** (ئان.) مرۆڤی خۆفرۆش، دەربارى: *مرۆڤی کاسەلێس کەس خۆشی ناوێت.*

**کاسەی سەر** (ن.) کەللەی سەر: ئێسکی *کاسەی سەری ساوا نەرمە.*

**کاغەزی پالاوتن** (ن.) کاغەزا دێراندنیْ، کاغەزا پارزنینیْ: *کاغەزی پاڵاوتن لە تاقیگەدا بەکاردێت.*

**کاك** (ن.) وشەیەکی ڕێزلێنانە بە مانای برای گەورە: *کاك دلێر لەگەڵم مایەوە.*

**کاکاو** (ن.) پاودەرێکی رەنگ قاوەییە، کە دەنکە کاکاوی هاڕدراوە: *شوکولا لە کاکاو دروست دەکرێت.*

**کاکەیی** (ن.) کاکەیی هۆزەکی کوردە لە کوردستاندا دەژین.

**کاڵەك** (ن.) گندۆر، گندۆرە، تەرپوز: *من حەز لە کاڵەك دەکەم.*

**کام** (ج.) کی، کامە، کیژ، کیْ، کیهە، بۆ پرسیار بەکار دیْ: *حەز لە کام بەش دەکەیت؟*

**کامەیان** (ج.) کیژوان، کی، کامە: *کامەیان دەتوانیْ سەرکەویْ بابێت.*

**کامێرا** (ن.) ئەو ئامێرەیە، کە وێنە، یان فیلمی پێدەگیرێت.

**کان** (ن.) کانگەر، ژێدەری زێڕ و زیو، خەڵووزی بەردین، کارگ، کارە: *تا ئێستاش لە وڵاتانی پیشەسازی کانە خەڵووزەکان ماون و کاریان تێدا دەکرێ.*

کانە ئاگرینەکان

**کانە ئاگرینەکان** (ن.) ڤولکان، پڕکان، سەرچاوەکانی گڕکان: *کانە ئاگرینەکان کە دەتەقنەوە زیان بە شوێنی دەوروبەریان دەدەن.*

**کاندو** (ن.) کەندو، نیمچە تانکییەکە لە تەنەکە دروست دەکرێ: *پێشتر دانەوێڵە لە کاندووی قوڕدا هەڵدەگیرا.*

**کانزا** (ن.) ئەوەی لە کان و کارگانەوە دەردەهێنرێ، ماددەی بە نرخ، مەعدەن: *تۆتیا جۆرە کانزایەکی سپییە.*

**کانی** (ن.)١- کانیاو، سەرچاوە، لە زستاندا ئاوی کانی گەرمە و لە هاویندا ساردە: *کانیا گوندێ مە ئاڤا وێ گەلەکا سارە.* ٢- کوا: *کانی ئازاد؟*

**کاهوو** (ن.) خەس، خاس، سەوزەیەکی گەڵا پانە دەخورێ: *زۆرجار کاهو لە جیاتی خەیار بۆ ناو زەلاتە بەکاردێت.*

**کاوەی ئاسنگەر** (ن.) ناوی قارەمانێکی کوردە و لە دژی زوڵم و زۆرداری خەباتیکردووە و بەسەر ئەژدەهاکی دا داوە و میللەتی لە چەوسانەوە رزگار کردووە.

**کاولکاری** (ن.) تێکدان، وێرانکردن، خاپوورکردن: *ڕژێمی بەعس سیاسەتی کاولکاری پەیڕەو دەکرد.*

**کە** (ئام.) کو، ئامرازی گەیەنەرە، رستەیەکی سەرەکی بە

رستەیەکی شوێنکەوتوو دەگەیەنێت: ئێوارە، کە باران باری، ژوورەکە دڵۆپەی کرد.

**کەپر** (ن.) سابات، ساباتی لە شوڵ‌و قامیش دروستکراو: *بەهرا پتر کەپران ژ چولی دروست دکەن.*

**کەپوو** (ن.) لووت، کەپ، پۆز، بێڤل، دفن: *مرۆڤ بە کەپوو هەناسەدەدات.*

**کەتیرە** (ن.) جەوی، جۆرە شیلەیەکە بۆ چەسپ بەکاردەهێنرێ‌و لەبەری داری گوین وەردەگیرێ: *کەتیرە لە رووەکی جەوی وەردەگیرێت.*

**کەرە** (ن.) نیڤشك، رۆنی قاڵنەکراو: *بەیانییەکەی نان‌و کەرەی داینێ.*

**کەرەسەی خاو** (ن.) پێویستییە سەرەکییەکانی هەر چ کاروبارەك بێت: *بەردی چیا کەرەسەی خاوە بۆ دروستکردنی چیمەنتۆ.*

**کەرەکێوی** (ن.) کەرێ کیڤی، جۆرە ئاژەڵەکی کێوی خەتخەتە: *کەرە کێوی لە باخچەی ئاژەڵاندا هەیە.*

**کەرت** (ن.) کەر، پارچە، لەت: *تا ئەوان هاتن کەرتە نانەکی گەرمم خوارد.*

**کەرستە** (ن.) ماددە، ئەسباب، پێویستی: *لە بواری پیشەسازی کەرستەی نوێتر داهێنراون.*

**کەرکوك** (ن.) شارەکی کوردستانییە‌و زۆربەی دانیشتووانی کوردن‌و بە نەوت بەناوبانگە: *ئاگری باوە گورگوڕ کێڵگەیەکی نەوتە لە کەرکووك.*

کەروێشك

**کەروێشك** (ن.) گیاندارەکی بچکۆڵەی گوێ درێژە، کەروشك، کەروێ،

خـەروێ، کێڤریشـك: *کەروێشـك خەوی سووکە.*

**کـەڕ** (ئـان.) گـوێگران، گـوێ کـپ، کەسـەك کـە گـوێی لـە قسـان نەبێت.

**کـەڕوو** (ن.) پـەمبلوك، کیفکـی، پـەمبیلۆك، ئـەو توێژاڵـە ڕەنـگ شینەی، کە بە کۆن بوون لەسەر نـان و شـتی دی پەیـدا دەبـێ: *نانەکە کەڕووی هەڵهێناوە نابێت بخورێت.*

**کەڕیلـە** (ئـان.) ئـاژەڵی کـەڕ و گـوێ بچووك: *ئەم بەرخـە کەڕیلـە ببە بۆ لەوەڕ.*

**کەزان** (ن.) بڕوانە **کەزوان**.

**کەس** (ن.) مرۆڤ، تـاك: *هیچ کەسەکم نـەبینی بـە کارەسـاتەکەوە دڵتەنگ نەبێ.*

**کەسەر** (ن.) خەفەت و پەژارە، کۆڤـان: *دایکـم نەخۆشـە دڵـم پـڕ لـە کەسەرە.*

**کەسك** (ئان.) سەوز: *بەهاران دەشت و دەر کەسك دەچێتەوە.*

**کەسکوسـۆر** (ن.) کۆلکەزێڕینـە، پەلکەزێڕینـە: *کەسکوسـۆر دیمەنـەکی سـیحراوییە. پشـتی باران بارینێ کەسکوسۆر پەیدا دبیت.*

**کەسوکار** (ن.) خـزم و خـوێش، خـزم، دۆسـت، کەسـانی نزیـك: *ئێمـە کەس و کاری ئێوەین.*

**کەش** (ن.) سـەقا، ئـاو و هـەوا: *کـەش و هەوا لە وەرزی زستان ساردە.*

**کەشـتی** (ن.) گـەمی، بەلـەمی گـەورە، پاپۆڕ: *هەندەك لـە کەشـتییەکان چارۆکەدارن.*

**کەشتیگەل** (ن.) کۆمەڵە پاپۆڕێك زیـاتر بـە مەبەسـتی سـەربازی بـەکاردەبرێ: *کەشـتیگەل لـە کـاتی جەنگـدا ڕۆڵـی گـەورە دەبینـێ.*

**کەشتیوان** (ن.) گـەمیڤان، پـاپۆڕەوان: *کەشـتیوان پێویسـتە بـەردەوام ئاگای لە ڕێگا هەبێت.*

**کـەف** (ن.) شـتەکی سـپی و لیچقە لـە سـابوون یـان شـەپۆلی ئـاوەکی

تیژ پەیدا دەبیٚ: ئەڤ سابینە گەلەکا ب کەفە.

**کەفتن** (چ.) کەوتن، گلان، بەربوونەوە، کەفتن: دوو بالەفرێن دوژمنی کەفتنە خوارێ.

**کەفیك** (ن.) دەستەسڕ، دەسڕۆك: باپیرێ من هەردەم کەفیکا دگەلدا.

**کەڤل** (ن.) پێست، کەول، کەڤل: کەڤلێ هەندەك گیانەوەران ب بهایەکا بەرز دێنە فرۆشتن.

**کەڤن** (ئان.) کۆن، دێرین، کەون: کوردستان بە کەڤناتیا دیرۆکێ جهێ کوردانە.

**کەلار** (ن.) قەزایەکە سەر بە پارێزگەی کەرکوك.

**کەلبە** (ن.) کەڵبە، کێلب، پارچەی زۆر بچووك، ددانی تیژ، کەرپە.

**کەلەمو هستری** (ن.) چیخن‌و ستری، درك‌و داڵ: هەر چەندە ڕێگا کەلەمو هستری بیٚ هەر دەبیرم.

**کەلوپەل** (ن.) شتومەك، پێداویستی، تشت، تشتومشت، کەرستە: زۆربەی کەلوپەلی ناومالْم ئامادە کرد.

**کەلی** (ئان.) فەریك: دبهارێدا زارۆك گەلەك حەز ژ کەلی نۆکا دکەن.

**کەلێن** (ن.) درز، دەرەز، تیك، کون، کەلەبەر: نایەڵین دوژمنان کەلێن بخەنە بەینمانەوە.

کەڵەشێر

**کەڵەشێر** (ن.) کەڵەباب‌و کەڵەکووکیشی پێدەڵێن، دیکل، پەڕەکانی کەڵەشێر ڕەنگاو ڕەنگن: کەڵەشێر دەخوێنێت .

**کەڵەکەبەرد** (ن.) کۆمەڵە بەردەکی بەسەر یەکەوە، کەلەکا بەران: بۆ ناسینەوەی شوێنی زەوییەکە کەڵەکە بەردەك کراوەتە نیشانە.

**کەڵەکەبوون** (چ.) کۆمبوون، بەسەر یەك خڕبوونەوە، کەفتنە سەر ئێك، ل سەر ئێك ستوێربوون: *خێرا کاردەکەم بۆ ئەوەی ئیشم لەسەر کەڵەکەنەبێت.*

**کەم** (ئان.) کێم: من کەم یاری دەکەم.

**کەمئەندام** (ئان.) کەسەك ئەندامەکی لەشی کەم بێت: پێویستە *یارمەتی کەمئەندامان بدەین.*

**کەمەند** (ن.) گوریس یان زنجیرێکی درێژە بۆ دیوار یان سەربان وەسەرکەوتن بەکاردێت، لە بارەدا سەرێکی کەمەندەکە بە سنگێکەوە دەبەستریت و سەرەکەی دیش بۆ سەرکەوتن بەکاردێت.

**کەمخواردن** (چ.) خواردنی کەم دەخوا: *کەمخواردن ئەگەر لە ئەنجامی نەخۆشی نەبێت مۆکاری لەش ساغییە.*

**کەمۆڵە** (ن.) کلوسك، کاسە جامی ناو بۆش: *پێش پەیدابوونی کارەبا کورد هەندەك خواردەمەنی لەناو کەمۆڵە دەپاراست.*

**کەمێك** (ئان.) نەختێك، تۆزێك، پیچێك، قیچێك، هەندێك: *ئەمڕۆ کەمێك باران باری.*

**کەنار** (ئاك.) گڤاندە، ڕۆخ، تەنیشت، لێوار، دەم، دەو، قەراغ: *لە کەناری ئاوەکە دانیشتین.*

**کەناری** (ن.) باڵندەیەکی بچووکی دەنگخۆشە، دەتوانیت لە ماڵەوە لە نێو قەفەسێکدا بە خێوی بکەیت، ڕەنگی کەناری بە شێوەیەکی گشتی زەردە .

**کەنەفت** (ئان.) ماندوو، وەستیای، شەکەت: کەنەفتی ئەو ڕێگا دوورو درێژەم.

**کەنداڤ** (ن.) کەنداو، ئەو ئاوەیە کە دوو لای وشکاییە. ٢- ئەو چاڵاییەی کە دوو ڕووباری

دەچنەوە سەر: *عێراق دکەڤیتە سەر کەنداڤێ.*

کەنغەر

**کەنغەر** (ن.) ئاژەڵێکی شیردارە، پێیەکانی پشتەوەی درێژن، کە بەهۆیەوە دەتوانێت باش هەڵبەزێتەوەو باز بدات. کەنغەر لە کەرتەی ئوسترالیا دەژی، مێینەی کەنغەر شتێکیان لەسەر سک هەیە، هەر وەکو کیسە وایەو بێچووی خۆی لەناو هەڵدەگرێت.

**کەنگی** (ج.) کەی: *کەنگی بە ئاوات دەگەین؟*

**کەنیسە** (ن.) کلێسا، پەرستگای مەسیحیانە: *لە کوردستان کەنیسەی کۆن هەیە.*

**کەنیشك** (ن.) کچ، دۆت، کیژ: *من دوو کەنیشك هەنە.*

**کەهی** (ن.) کەوی، کەیی، ماڵی، هەر باڵندەیەك لەناو ماڵ بتوانرێت بەخێو بکرێت پێی دەڵێن کەهی: *ئەڤ کەوە یا کەهییە.*

**کەو** (ن.) باڵندەیەکی جوانە لە شاخەکانی کوردستاندا زۆرە: *کەوەکەم خۆش دەخوێنێت.*

**کەواتە** (ئام.) ژ بەر، ئەڤە، لەبەر ئەوە، لەوا: *زستان هات، کەواتە دەبێ جلی خوری لەبەر بکەین.*

**کەوانە** (ن.) کڤان، کەڤانە، چەماوە: *هەر دارێك چەماوە بێت کەوانەیی دەبێت.*

**کەوانەی باران** (ن.) کەسکوسوور، پەلکەزێرینە، کۆلکە زێرینە.

**کەوتن** (چ.) ١ـ کەتن، بەربوونەوە، کەفتن، بەلاداهاتن. ٢ـ

دەرنەچوون: *تا ئێستا لە هیچ تاقیکردنەوەیەکدا نەکەوتووم.*

**کەوچک** (ن.) کەڤچک، مراک، ملاک: *جاران کەوچکی دۆ مەر لە دار دروستدەکرا.*

**کەوی** (ئان.) بڕانە: **کەهی.**

**کەویکردن** (چ.) کەهی کرن: *کۆترەکانم کەویکردوون.*

**کەیخوسرەو** (ن.) سەرکردەیەکی میدییەکان بوو: *ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەیخوسرەوین.*

**کەیل** (ئان.) پەرێشان، پڕ لە خەم و خەفەت: *براکەم نەخۆشە دڵم کەیلە.*

**کەیوان** (ن.) ١- ئەستێرەیەکی گەڕۆکە: *ئەستێرەی کەیوانم بە شەو دیت.* ٢- کابان، کەیبانوو. ٣- ناوە بۆ نێرینە.

**کتک** (ن.) ١- پشیلە، پسیلە، ختک: *لە هەر شوێنێ مشک زۆر بێ کتک لەوێیە.*

**کتوپڕ** (ئاک.) دەمودەست، ژنشکێڤە، یەکسەر، لەناکاو، بێ ئاگاداری، دەمل دەست، لە ناوەخت، لە پڕ: *هەواڵێکی کتوپڕ بوو هەر چەند دەمکرد باوەڕم نەدەکرد.*

**کتوپڕی** (ن.) لەپڕی، لەناکاوی.

**کتێب** (ن.) پەرتووک: *کتێبەکانم خاوێن رادەگرم.*

کتێبخانە

**کتێبخانە** (ن.) نامەخانە، پەرتووکخانە: *بۆ پەیدا کردنی کتێب سەر لە کتێبخانەی گشتی دەدەم.*

**کپ** (ئان.) بێدەنگ، کڕ: *ئازاد منداڵەکی کڕو کپە.*

**کچ** (ن.) ١- کیژ، دوت، قیز، زارۆکی مێ: *ژینۆ کچێکی ئاقڵە.* ٢- ئافرەتی هێشتا شوونەکردوو.

**کـــراس** (ن.) کـەرواس، کـران، جـۆرە جلەکـە لەبـەر دەکرێـت: *کراسـە نوێیەکەم لەبەر کرد.*

**کـــردار** (ن.) کـار، کـردەوە، رەفتـار، شـۆل. ٢– شـینایی هاوینـان: *کرداری باش پیشەی لێزانانە.*

**کرمـــی** (ئـان.) کلـۆر، پـووچ، کرمـیٚ: *سێوی کرمی مەکرە.*

**کرمی ئاوریشم** (ن.) کرمیٚ ئاوریشـمی، کرمـیٚ ئارمویشـیٚ ، ئاوریشـمی سروشتی دەدات.

**کـریٚ** (ن.) ئـەو پارەیـەی لـە بەرامبـەر کاردا وەردەگیریٚ، مز، رۆژانـە: *هەموو ئێوارەیەك کرێی کارەکەم وەردەگرم.*

**کرێـت** (ئـان.) ناشـرین، نابـەجیٚ، نـا جوان، ناڕەوا: *درۆکردن کـارەکیٚ کرێتە.*

**کرێکار** (ئان.) پالـە، پالـە، رەنجدەر، کرێگرتە، عەمەلە: *کرێکار چینی هەرە زۆری کۆمەڵە.*

**کرێکاری** (ن.) عەمەلاتی، پالەیی، کریٚ گرتـەیی: کـاکم *رۆژانـە کرێکـاری دەکات.*

**کــڕ** (ئـان.) ١– مریشـکەك ئـارەزووی کەوتنی سەر هێلکـەی هـەبیٚ بۆ هـــەڵهێنانی، کـــورك: *خزمـــەتی مریشکی کـڕ کەوتوو بکـە.* ٢– بێدەنگ: بڕوانە: **کپ**.

**کڕکـــــەوتن** (چ.) کورکبـــوون، وادەی هێلکـــە هـــەڵهێنان: *باڵنـــدەکان لەســـەر هێلکـــە کڕدەکـــەون و چاودێری بێچووەکانیان دەکەن.*

**کڕکڕاگـــە** (ن.) کڕکـڕك: *گیانـــەوەرە مەمکدارەکان کڕکڕاگەی گوێیـان هەیە.*

**کزەبا** (ن.) شـنەبا، هینکـە بـا: *ئـەمڕۆ کزەبایەکی خۆش دێت.*

**کش** (ن.) دەرکردنـی باڵندە: *منالەکـە کشەکشی لە مریشکەکە کرد.*

**کشـــان** (چ.) درێـژبوون، پاشڤەچـوون، لەبـــەر یـــەك چـــوون: *مـــاددە بەگەرمکردن دەکشێت.*

**کشتوکاڵ** (ن.) کێڵانو چاندن، زراعەت، کشتوکار: *دەشتی شارەزوور بۆ کشتوکاڵ بە پیتە.*

**کشتیار** (ن.) خاوەنی کشتوکاڵ، جوتیار: *کشتیار پێی خۆشە باران ببارێت. مام وسوو کشتیارێکی کارامەیە.*

**کفری** (ن.) قەزایەکە سەر بەپارێزگای کەرکووکە.

**کلاسیك** (ن.) شتو بیری نەریتیو کۆن. زمانانی کۆنی وەك لاتینیو گریکی بە زمانی کلاسیك ناسراون.

**کلتور** (ن.د) سورمەدان، کلدان: *ئەم کل وکلتورە بێنە چاوم برێژم.*

**کلك** (ن.) کوری، دویف: *سمۆرە کلکی زەردە.*

**کلۆ** (ن.) کولی، جۆرە زیندەوەرێکە لاقەکانی پشتەوەی درێژن بۆیە دەتوانێت باش باز بدات.

**کلۆر** (ن.) قولێر، ناو بەتاڵ، کون، خلولە: *ددانەکانم کلۆرن دەبێت پڕیان بکەمەوە.*

**کلۆر بوون** (چ.) کرمی بوون، کون بوون، خلولە بوون: *مەرکە ددانەکانت کلۆر بوون، سەردانی پزیشکی ددان بکە.*

**کڵپە** (ن.) بڵێسەی ئاگر، چریسك یان کریسك: *کڵپەی ئاگری ئاگردانەکە ژوورەکەی رووناك کردبوو.*

**کڵۆ** (ن.) کەلە، تەقال، کیزی، کووز.

**کنیشت** (ن.) پەرستگای جوولەکانە.

**کو** (ئام.) ١- کە: *ژ باوشکێن وی یا دیارە کو خەوا وی یا دمێت.* ٢- چۆن: *کو خۆتان دەرباز کرد.*

**کوانوو** (ن.) کوانی، کوانگ، ئاگردان، تفك: *مێندێك لەسەر ئاگری کوانوو چێشت لێدەنێن.*

**کوانێ** (ئام.) کانێ، کا، کوا، وشەی پرسیارە بۆ دیاریکردنی شوێنو شتی نادیار: *کوانێ ئەو هۆنراوەی گوتت بۆتی دەخوێنمەوە.*

**کوتان** (چ.) ١- لێدان: *لە قوتابخانەدا کوتان قەدەغەیە.* ٢- دەرزی لێدان: *هەڵمەتی کوتان دژی نەخۆشی سورکە دەستپێکرد.*

**کوتـــاڵ** (ن.) قومـاش: *باوکم کوتـاڵ دەفرۆشێت.*
**کوتلـــك** (ن.) کفتـە: *کوتلـك دەوك خوارنەکا فۆلکلۆرییە.*
**کودەتـــا** (ن.) هەڵگەڕانــەوە، لـە کـار لابردن، هـەر کۆمەڵە چەکدارێك بە زۆری دەسەلآت لە کۆمـەڵێکی دەسـەلآتداری دی بسـتێنن بـەم کـــارە دەڵـــێن کودەتـــا: *بەعســـییەکان بـــە کودەتـــای سەربازی هاتنە سەر حوکم.*
**کودی** (ن.) ١- کوندك، کودو، کولەکـە: *شلەی کودی شلەیەکی بەتامە.*
٢- سەرتراشـاو: *بـۆ وا سـەرت کودی کردووە؟*
**کورت** (ئـان.) کـوت، پێچـەوانەی درێـژ: *پەتی درۆ کورتە.*
**کـورد** (ن.) نەتەوەیـەکی گەورەیـە لـە رۆژئـاوای کەرتـەی ئاسـیادا، مێژوویـــەکی دێرینـــی لـــەم ناوچـــەیەدا هەیـــەو مەرجـــە میللیەکانی هـەر لـە کوردستاندا سەریهەڵداوەو پلە بـە پلـەو هـەر یەکـــە لـــەو مەرجانـــە لەســـەردەمێکی ئـەو مێـژووەدا شێوەی خۆی وەرگرتووە.
**کوردایەتی** (ن.) بزاڤێکـی نەتەوەییـە، لە پێناو رزگاریو سەربەخۆییدا: *کوردایـــەتی رێبـــازی کـــورد پەروەرانە.*
**کوردســـتان** (ن.) کوردســـتان خـــاکی کوردانـــەو بـــەم ولآتانـــە دەورە دراوە: تورکیا لە بـاکوور، ئێـران لە رۆژهەلآت، ئێراق لـە باشـوور، سوریا لە رۆژئاوا.
**کوردی** (ئـان.) ئـەو زمانـەی، کـە کـورد قسەی پێدەکەن: *زمـانی کـوردی بـەر خێزانـــی زمانـــانی ئێرانـــی دەکەوێت، چل ملیۆن کـەس بە زمانی کوردی قسە دەکەن.*
**کورســی** (ن.) سـەنگەڵی، ئەسـکەملی: *لەســـەر کورســـی دانیشـــتم. کورســـییەکم بـــۆ بێنـــە زۆر ماندووم.*
**کوژاندنـــــەوە** (چ.) ڤەمرانـــدن، دامرکاندنـــەوە، کپکردنـــەوە:

*ئاگرەکەمان زوو کوژانـدەوە ئەگەر نا هیچ نەدەما.*

**کوشندە** (ئان.) کوژەك، کوژەر، هەر چ شتێك، کە مرۆڤ و گیانەوەر بکوژێ: *پزیشك هەوڵدەدات مرۆڤ لە نەخۆشیی کوشندە بە چارەسەرکردن رزگار بکات.*

**کولبوون** (چ.) هەودان، زامداربوون: *دەستەکانم کول بوون.*

**کولتوور** (ن.) فەرهەنگو رۆشنبیری میللەتو کۆمەڵگا، دابو نەریت: *هەر میللەتەکی کولتووریّ خۆ هەیە.*

**کوللە** (ن.) ١- کلۆ، کولی، دەعبای زەرەر بەخش بۆ کشتوکاڵ. ٢- ئەو قوماشە تەنکەی، کە لە شەواندا لەسەر پێخەف هەڵدەدریّ تا لە مێشو مێشوولە بپارێزرێن.

**کولیچە** (ن.) کلوچ، کادە، جۆرە خواردنەکە یان شیرینیەکە لە گوێزو خورماو ئارد و روون دروست دەکریّ بەرچاییەکی خۆشە.

**کولێرە** (ن.) کلورە، سەوك، ئەستوورك، ستۆرك: *کولێرە بەڕۆنی کۆیە بەناوبانگە.*

**کولْ** (ن.) ١- جۆشی شتی شل لەسەر ئاگر، کەلی: *ئاوەکە نەهاتۆتە کولْ.* ٢- جۆشو هەنسکی گریان، کەلە گری، گریا گەرم: *ئەوەندە خەمی خوارد کولی گریانی نەدەنیشتەوە.*

**کوڵان** (چ.) کەلین، تەواو گەرم بوونی ئاو، وەجۆش هاتن: *ئاو لە پلەی سەددیا دەکوڵیّ.*

**کوڵاو** (ئان.) کەلی، ئاوی تەواو گەرم بوو: ئاوەکە کوڵاوە ئاگادار بە منداڵەکە دەستی لیّ نەدات.

**کونجی** (ن.) جۆرە دانەوێڵەیەکی دەنك بچووکە بە زۆر شێوە دەخوریّ، لەدروستکردنی زۆر شتیش بەکاردیّ، قونجی: *تەحینا کونجییان کەلەکا خۆشە.*

**کوندە** (ن.) ١- پێستی بزنی خۆشکراوە بۆ ئاو تێکردن، کونك: لە پەرێزیّ لە کوندە ئاو دەخۆنەوە. ٢- بۆ، کوندە بەبۆ،

پــــەپۆک، تـــۆک، باڵنـــدەی وەیشوومە.

کوندەبەبوو

**کوندەبەبوو** (ن.) بڕوانە **کوندە** (٢)

**کونیلــە** (ن.) کونـک، کـونی زۆر ورد: کراســەکەی هەنــدێ کونیلــەی تێدایە.

**کوێ** (ئام.) کیڤە، کیرێ، کێوە: بۆ کوێ چووە؟

**کووچە** (ن.) کۆڵان، گەڕەک: *تـاوەک بە کووچــەو کۆڵانــەکانی گــەڕەکــە کۆنەکەماندا پیاسەم کرد.*

کۆبرا

**کۆبرا** (ن.) جـۆرە مـارێکی ژەهراوییـە. کــۆبرا مــارێکی گەورەیــەو لــە جەنگەڵدا زۆرە.

**کۆتـر** (ن.) جـۆرە باڵندەیەکـە، زۆرجـار دەنگێکی لێوەدێت وەکـو بڵێیت دەڵێـــت: زوو کـــوو، ڕەنگـــی پــەڕەکانی کـۆتر بـە شـێوەیەکی گشتی خۆڵەمێشییە یا سپی.

**کۆچەر** (ن.) ڕەڤەند، ڕەوەنـد: کۆچـەر لە بەهاران دەچن بۆ کوێستان.

**کۆچـــــکە** (ن.) دەرســـۆکا ســـپی، ســــەرپۆش، ڕەفتــــەی ســــەری منــدالّ: بــە منــداڵی کۆچــکەیان لەسەر دەناین.

**کۆچکردن** (چ.) ١- ڕۆیشـتن، بـارکردن لە شوێنەک بۆ شوێنەکی تـر: *لـە هاویندا بەرەو هاوینە هەوارەکان*

کۆچ دەکەین. ٢- مردن، لە ژیان نەمان: *دەمەکە کۆچی دوایی کردووە.*

**کۆچی دوایی** (ن.) مردن، ماڵئاوایی: *هەموومان بە کۆچی دوایی ئەو خەفەتبار بووین.*

**کۆرە** (ئان.) نابینا، کوێر، کەسێك کە هیچ نەبینێ: *مرۆڤێ کۆرە دنیایێ نابینێت.*

**کۆرپە** (ن.) کۆرپەلە، منداڵی ساوا، زارۆی ساوا: *خۆی و کۆرپەکەی ماتبوون.*

**کۆز** (ن.) ١- حەوشەی بەرخ و کار: ٢- جێ لەوەڕ، سەوزایی لەوەڕ، چەروان، لەوەڕگا: *ئەو بنارە کۆزەکی چاکە بۆ مەڕو ماڵات.* ٣- کۆمەڵە، کۆم، چەند شتەك لەسەر یەك.

**کۆزەر** (ن.) ١- لە کاتی لە بێژنگدان و کەوکردنی گەنمدا ئەو کاو کۆتەڵ و بژارەی سەردەکەوێت، پێی دەگوترێت: کۆزەر یان سەر کۆزەر. ٢- کۆتەرەدار، قوتەدار، بنەداری بڕاو، کۆلکەدار، قورم: *ئەو کۆزەرە دەشکێنین بۆ سۆپا.*

**کۆسار** (ن.) ناوچیا، شوێنەك کە شاخ و داخی زۆر بێ، کوێستان، زۆزان: *کوردستان وڵاتی کۆسارە.*

**کۆسپ** (ن.) ئاستەنگ، تەگەرە، ڕێگر، بەربەست، لەمپەر، قوچایی زەوی لە ڕێگادا: *هیچ کۆسپێك نەماتە ڕێگام.*

**کۆڤار** (ن.) گۆڤار، کۆوار: *کۆڤاری زاری کرمانجی لە نێوان ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٢ لە ڕواندز دەردەچوو.*

**کۆکەڕەشە** (ن.) خەندەکۆك، کۆخەڵۆك، کۆخەڕەشە: *کۆکەڕەشە توندترین کۆکەیە، کە منداڵ دەیگرێ.*

**کۆکردنەوە** (چ.) کۆمکرن، جەماندن، خڕ کردنەوە: *ئەو گوێزانەی، کە کەوتبوون کۆمان کردنەوە.*

**کۆلارە** (ن.) ١- کۆرکۆرە، باڵندەیەکی گۆشت خۆرە: *کۆلارەکە لە*

*ئاسمان دەفڕێت وا دیارە لە نێچیرێك دەگەڕێت.* ٢- فڕۆکەی کاغەز، فڕفڕۆك، قوش قاقەز: *بنوارە وا ئازاد کۆلارە هەڵدەدات.*

**کۆلـۆخ** (ن.) کلـۆخ، کولـۆخ، کەللەی سەر، جومجومە: *کولۆخێ ڤی بەرانی بێ مەزنە.*

**کۆلیژ** (ن.) کۆلیج، زانستگا، خوێندنی باڵای دوای ئامادەیی: *براکەم لە کۆلیژی ئەندازە دەخوێنێ.*

**کۆگـا** (ن.) کومگەه، عەمبار، ئەنبار، شوێنی شت لێ دانان: *دەرمانەکان هەموویان لە کۆگاوە مێنراون.*

**کـۆڵ** (ن.) ١- تێلەکە، پشتی، کۆڵەپشت، باری سەر شان: *بە خۆم و کۆڵی پشتمەوە بەڕێکەوتم.* ٢- شان، مل، پیل، قەڵاندۆشان: *بارەکەم بە زەحمەت پێ بەسەر کۆڵ دا درا.* ٣- جلك شوشتن، بالاف: *بۆ کۆڵ چوونەتە سەر کانی.* (ئان.) ٤- نووکی هەر شتەك کە تیژی نەمابێ، کۆر، کوە: *دەرزییەکە کۆڵە دە لێفە ناچێ.* (ئان.) ٥- ئاژەڵی بێ شاخ، یان بێ قۆچ: بزنەکە کۆڵە، شاخدار نییە.

**کۆڵە پشت** (ن.) بڕوانە **کۆڵ**.

**کۆڵەکـە** (ن.) فاکتەر، ستوین، ئەستوند، سوندەکە: *برایەتی کۆڵەکەی سەرکەوتنمانە.*

**کۆڵ نەدان** (چ.) نەبەزین، نەسرەوتن، رانەوەستان: کـۆڵ نـەدان سیفەتی ئێمەیە.

**کـۆڵین** (چ.) نـەحت، پەیکەرسازی، پەیکەر تاشی: برام هونەرمەندە لە بواری کۆڵین.

**کۆمـەککردن** (چ.) یارمەتیدان، هاوکاریکردن: *مـن کۆمـەکی هەژاران دەکەم.*

**کۆمـەڵ** (ن.) جڤـاك: *کۆمـەڵی ئێمـە سادەیە.*

**کۆمەڵە** (ن.) کۆم، گروپ، تاخم: *بە نیازین لە کۆمەڵەیەکدا یەکبگرین.*

**کۆمەڵکوژی** (ئان.) رەشەکوژی، کۆمکوژی، جینۆساید: رژێمی بەعس کوردی کۆمەڵکوژ کرد.

**کۆیلە** (ن.) بەندە، بەنی، قول: *کەس کۆیلەی کەس نییە و ئازادە.*

**کیبۆرد** (ن.) جۆرە ئامێرێکی مۆسیقایەو زۆر لە پیانۆیەکی بچووك دەچێت. دەتوانیت هەموو جۆرە مۆسیقایەك بە کیبۆرد لێبدەیت.

**کیسەڵ** (ن.) رەقە، کیسۆ، کیسەلە، کسك، ئەو ئاژەڵەیە کە بەرگەکی رەقی بەسەر پشتەوەیە لە زستانان لە ژێر خاکدا دەبێ و لە ئاو و وشکانیدا دەژی: *کیسەڵ سێسەد ساڵ دەژی.*

**کیڤە** (ج.) کوێ: *تۆ کیڤە بچی ئەز دگەل تەمە.*

**کیلۆمەتر** (ن.) یەکەی پێوانە لە نێوان دوو جێگای لە یەك دوور: *کیلۆمەترێك یەکسانە بە هەزار مەتر.*

**کیمیا** (ن.) یەکەکە لە زانستەکان: *لە ئەزموونی زانستی کیمیا (٨٠) پلەم وەرگرت.* ٢- پەین، ئەوەی کشتوکاڵی پێ بەهێز دەکرێ. ٣- چەکی کۆکوژ.

**کیمیاباران** (ن.) بەکارهێنانی چەکی کیمیایی: هەڵەبجە، *بادینان و بالیسان بە دەستی بەعس کیمیاباران کران.*

**کیمیاگەر** (ئان.) زانای کیمیا: *براکەم کیمیاگەرە.*

**کینە** (ن.) رق: *مرۆڤی کینە لە دڵ زوو نەخۆش دەکەوێت.*

**کێدەرێ** (ئاك.) کوێ، چ جهێ، کێندەر: *تو خەڵکی کێدەرێی.*

**کێش** (ن.) ١- سەنگ، قورسایی: *یەکەی پێوانی کێش گرامە.* ٢- تاقەت، توانا: *تۆتۆمبێلەکە لە هەورازەکاندا کێشی کەم بوو.*

**کێشان** (چ.) ١- بەراوردکردن بە پێوانەی تەرازوو: *دوو کیلۆ سێوی چاکم بۆ بکێشە.* ٢- راکێشان: *تەلەکە مەکێشە*

*نەوەك ببچڕێ.* ٣- جگەرەخواردن، مژ لێدان، قوم لێدان: *چیدی جگەرە ناکێشم.*

**کێشانەوە** (چ.) هێنانەدواوە، ڤەکێشان، بردنەپشتەوە: *دوژمن هێزەکانی لەسەر سنوور کێشاوەتەوە.*

**کێشە** (ن.) هەرا، ئاریشە، دەمەقاڵە، ناکۆکی، شەڕ، پرس، قەزیە، ئاریشە: *کێشەی نێوان هەردوو دراوسێ چارەسەرکرا.*

**کێڵگە** (ن.) زەڤی، زەوی‌و زارەکی پاوانکراو: *لەکاتی سەیراندا دەبێت ئاگاداری ئەو کێڵگە مینانە بین، کە هێشتا دەرنەهێنراون.*

**کێڵگەنەوت** (ن.) حەشارگەی نەوت، چاڵە نەوت: *کەرکوک کێڵگەی نەوتە.*

**کێم** (ن.) ١- عەداڤ، زەرداوی برین، خوێن‌و خێزاوی برین: *لەبەر تەشەنەکردنی برینەکەی کێمەکی زۆری کردووە.* (ئان.) ٢- کەم، کم: *کێمەك ماوە* بگەینە جێ. کێم ئاخفتن ژ پڕ بێژیێ باشترە.

**کێماسی** (ئان.) کەموکوڕی، کێماتی: *لە خوێندندا هەندەك کێماسی یان هەیە.*

**کێو** (ن.) چیا، دوند، شاخ، بەرزایی: *کێوی قەندیل بەرزە.*

**کێوی** (ئان.) کیڤی، کوڤی، کیوی، سەر بە کێو، ئەو ئاژەڵانەی لە شاخدا دەژین، ئەو ئاژەڵانەی ماڵی نین، پێچەوانەی کەوی: *بزنە کێوی لە شاخەکانی کوردستاندا زۆرە.*

**گا** (ن.) گامێش، جوانەگا نێرەی چێڵ: *پێشتر لە گوندەکان گا بۆ جووتکردن بەکاردەهێنرا.*

**گابەڵەك** (ن.) گایەك کە پەڵەیەکی سپی تێدابێ: *باوکم گابەڵەکێکی کڕی.*

**گاپەل** (ن.) جۆرە کۆترێکی شینە: *ئەم گاپەلە لە ئاسماندا بە سەربەستی دەفڕێت.*

**گاز** (ن.) جۆرە سوتەمەنییەکە لە نەوتی خاوەوە وەردەگیرێ.

**گازا سروشتی** (ن.) ئەو ماددە هەواییانەی،کە لەسروشتدا هەن و جۆراو جۆرن: *گازی ئۆکسجین یارمەتی هەناسەدان دەدا.*

**گازانده** (ن.) گلەیی، سکاڵا: گازەندەمان زۆرە.

**گازگرتن** (چ.) گەزتن، گەستن، قەپگرتن: *ئاگام لێنەبوو منداڵە ساواکە گازێکی لێگرتم.*

**گاگەل** (ن.) رەشەوڵاغ، گاران، چێڵ و گا و جوانەگا: *گاگەلی گوندی دەبردرێتە لەوەڕگای بناری شاخ.*

**گالیسکە** (ن.) عەرەبانە، دروشکە، حاجیلۆك: *منداڵەکە سواری گالیسکە بوو.*

**گاڵتە** (ن.) یاری، وازی، گەمە: بە دەم *گاڵتەوە لە گەشتەکەمان گەڕاینەوە.*

**گاوان** (ن.) ئەو کەسەی دەچێتە بەرچێڵ و رەشەولاغ، شوانی چێڵ و رەشەولاخ، گاڤان.

**گەج** (ن.) کەرستەیەکە لە بیناکردن بەکاردێت و بە زۆری دیواری پێ سواغدەدرێت.

**گەدە** (ن.) چیکلدانە، مەعیدە، گەوك: *زۆر خواردن بۆ گەدە باش نییە.*

**گەرا** (ن.) تۆوی ماسی و بۆق و....، خەرز، تۆوی وردی هێشتا نەپیتێندراو.

**گەرەك** (ئان.) پێویستی، دڤێت: *مەموو قوتابییەك گەرەکە بخوێنێت* .

**گەرد** (ن.) گەر، تۆز، خەوش، دانەی ورد ورد، زیڤرك: *زێرێکی بێ گەرد دەفرۆشێ.*

**گەردەلوول** (ن.) گێژەلووکە: *لە کوردستاندا پاییزان گەردەلوول مەڵدەکات.*

**گەردەن** (ن.) گەردن، مل، ئەستۆ، سکورد: *دراوسێکەمان گەردانەیەکی زیوی لە گەردەن کردووە.*

**گەردوون** (ن.) جیهان، دنیا، گێتی، ئەرز و ئاسمان: *گەردوون زۆر لەوە گەورەترە کە ئێمە دەیبینین.*

**گەردووناس** (ئان.) ئەوەی لە کاروباری گەردوون دەکۆڵێتەوە: *یووری گاگارین گەردووناسێکی ناسراوە.*

**گەرم** (ئان.) بەتین، گەرم پێچەوانەی سارده: *لە ولاتی ئێمەدا هاوین گەرمە.*

**گەرماو** (ن.) گەرماڤ، شوێنی خۆ شتن، حەمام: *بۆ خۆ شوتن چووینە گەرماوی سیروان.*

**گەرماوگەرم** (ئاك.) دەسبەجێ، دەمو دەست، راستەوخۆ، یەکسەر: *مەر منداڵەکە لەدایکبوو، گەرماو گەرم پێچامەوە.*

**گەرمەسێر** (ن.) گەرمیان، ناوچەی گەرم: *گەرمیان نشینەکان هاوینان دەچنە کوێستان.*

**گەرمی پێو** (ن.) گەرمیپێڤ، پیڤکێ گەرمێ، ئەو ئامێرەی بۆ بەرزی و

نزمی پلەی گەرمی بەکاردێ: *پزیشک گەرمی پێو بۆ پێوانی پلەی گەرمی نەخۆش بەکاردەهێنێت.*

**گەروو** (ن.) گەروی، قورگ: *گەرووم دێشێ بۆیە دەنگم بە تەواوی نایێ.*

**گەریان** (چ.) بڕوانە: **گەڕان**.

**گەریدە** (ئان.) گەڕۆك، گەرەك، دنیا دیدە: *گەریدەکە بەدوای شوێنەواردا دەگەڕا.*

**گەڕ** (ن.) ١- پێچ، خول، سوڕ: *زانا گەڕی بە دەست کێشەکەی خواردووە.* ٢- شەڕ: *نازانم بۆ ئەو کەسە گەڕم پێدەگرێت.*

**گەڕان** (چ.) پیاسەکردن، سووڕانەوە، گەشتکردن، هاتن و چوون: *گەڕان بە دنیادا زانیاری مرۆڤ زیاد دەکات.*

**گەڕانەوە** (چ.) هاتنەوە، ئەگەڕیان، زڤرینەوە: *کۆچی گەڕانەوە بەرەو وڵات لە زۆربوون دایە.*

**گەڕاندنەوە** (چ.) ناردنەوە، گێڕانەوە، زڤراندنەوە: *هەموو سەرو سامانی بۆ گەڕاندمەوە.*

**گەڕەك** (ن.) تاخ، چەند کۆلانێك، ڕەندەك: *ماڵمان لە گەڕەکی زانیارییە.*

**گەستن** (چ.) بڕوانە: **گازگرتن**.

**گەشە** (ن.) نەشونما، پەرە، خۆشی: *ئەم دارانە باش گەشەیان کردووە.*

**گەشە سەندن** (چ.) پەرەسەندن، گەشەکردن، فراوانبوون، بڵاوبوونەوە کڵپە سەندن، گەورەبوون: *پێش ئەوەی کێشەکە گەشە بسەنێ چارەیان کرد.*

**گەشەکردن** (چ.) نەشونماکردن، پێگەیشتن، پەرەسەندن: وڵاتمان لە ڕووی بیناسازییەوە باش گەشە دەکات.

**گەشبوونەوە** (چ.) گەشەوە بوون، شادبوون، گەشانەوە، دڵخۆش

بوون: *کەژاڵ بە دیتنی دایکی گەشبووەوە.*

**گەشت** (ن.) سەیران، گەڕان، چوونە دەرەوە: *گەشتی ئەمجارەمان زۆر خۆش بوو.*

**گەشتوگوزار** (ن.) سەیران، گەڕان بەکەیف: *شەقڵاوە شوێنێکی خۆشە بۆ گەشتوگوزار.*

**گەل** (ن.) مللەت، میللەت، قەوم: *خەباتی گەلی کورد لە مێژوودا پڕ سەرفرازییە.*

**گەلاوێژ** (ن.) ١- ئەستێرەیەکی گەشی پرشنگدارە لەناوەڕاستی هاویندا لە کەلووی خۆیدا دەتروازێ: ٢- نێوی مانگێکی کوردییە بەرامبەر مانگی حەوت و هەشتی زاینی.

**گەلەری** (ن.) هۆڵ: *پێشانگایەکی شێوەکاری لەگەلەری میدیا دەکرێتەوە.*

**گەلەك** (ئاك.) گەلێك، مشە، زۆر: *نێرگز گولەکا گەلەك جوانە.*

**گەلۆ** (ن.) کوڕینە، خەلکینە، براینە: *گەلۆ ڕابن.*

**گەلی** (ن.) نهال، دۆڵەکی درێژە لەنێوان دوو شاخ و ڕێی پێدا تێدەپەڕێ: *گەلی عەلی بەگ تاڤگەیەکی جوانی هەیە.*

**گەلێك** (ئاك.) بڕوانە: گەلەك

**گەڵا** (ن.) بەلگ، پەلك: *گەڵای داری پاییز ڕەنگی جوانە.*

**گەمارۆدان** (چ.) ئابلووقەدان، دەورگرتن، دورپێچدان، هویردان: *تا سوپا گەمارۆی شارەکەی نەدا نەیتوانی داگیری بکات.*

**گەمە** (ن.) یاری، وازی: *تۆپانێ گەمەیەکی خۆشە.*

**گەنج** (ئان.) لاو، تۆلاز، جاحێلێ، جحێلێ، خورت: *گەنج میوای نوا ڕۆژە پێویستە بایەخی پێبدرێت.*

**گەندەڵ** (ن.) خراپ، چروك و بێ کەلك: *تا بۆت دەکرێت کاری گەندەڵ مەکە.*

**گـــەنم** (ن.) دەغـــڵ، دانەوێڵەیـــەکی بەســـوودە، ئـــارد، ســـاوار، گەنمـــــــــــــــەکوتاو.... لێدروستدەکرێت.

**گەورەیی** (ن.) مـەزنی: *گـەورەیی ئێمـە لەوەدایە هیچ کات چاومان لە دەستی خەڵك نییە.*

**گەوهەر** (ن.) ١- بە بـەردی نرخـداری وەك ئـەڵماس و دوورو یـاقوت و زمرووت دەگوترێت. ٢- ناوە بۆ مێینە.

**گە نمە شامی** (ن.) جۆرە دانەوێڵەیەکە بە گوڵە پێغەمبەر یا گەنمی کابە ناســـراوە بـــۆ دروســـتکردنی شامدلۆی بەکار دێت.

**گەهشـــتن** (چ.) ١- گەیشـــتن: *ئـەوان دەمێکـــە گەمشـــتینە.* ٢- پێگـەیین، ڕەسـین: *ترێکـە باش پێگەیشتووە.*

**گەیانـــدن** (چ.) گەهانـدن، هێنـــان: *کەلوپەلـــەکانیان زوو گەیانـــدە جێ.*

**گەیشتن** (چ.) بڕوانە: گەهشتن.

**گچـکە** (ئـان.) بچـووك، بچـيك: *لەسـەر گـــەوران پێویســـتە بـــە باشـــی چاودێری گچکان بکەن.*

**گدی** (ن.) بۆ بانگ کردنی کاریلـەو بـزن بـەکاردێ: گـدی گـدیانێ، نـاوی لاوکەکی کوردییە.

**گر** (ن.) گرد، بەرزایی، تەپە، تەپۆلکە: *گـــرێ مالتـــا ژووری کەلـــەك کەفتارە.*

**گـــرار** (ن.) دانەوێڵـەی چێشـتی تونـدو پـەیت، کـە بـە پـلاو لێـدەنرێن وەك، برنج، ساوارو گەنمـەکوتا: *دایکم بۆ نیوەڕۆ گراری لێناوە.*

**گران** (ئان.) ١- قورس: بارێکی گرانـە. ٢- زەحمـــــەت، ئەســـــتەم: *پرســـیارێکی گرانیـــان هێنـــابوو.* ٣- بـــەڕێز، بـــە حورمـــەت، سـەنگین: *پیـاوێکی گرانـە.* ٤- نرخی زۆر، بە بەها، بـەهای زۆر: *کەلو پەل لە بازاڕ گران بووە.*

**گـــــرتن** (ن.) گـــیران، بەنـــدکردن، هێشـــتنەوە: *لـــە ســـەردەمی بەعسدا هەر لەبەر ئـەوەی کـورد*

*بووی دەهاتیە گرتن، یانی دووچاری گرتووخانە دەبوویت.*

**گرد** (ن.) بڕوانە: گڕ.

**گردبوونەوە** (چ.) خڕڤەبوون، کۆبوونەوە، خڕ بوونەوە: *بۆ باسکردنی کێشەکە هەمووبان گردبووینەوە.*

**گردۆلکە** (ن.) گردی بچووك: *زۆربەی گردۆلکەکان شوێنەواریان تێدا هەیە.*

**گرژ** (ئان.) چوونە ناو ئێك، تێکچوون، وێکهاتوو، چووەوە یەك، *ماسولکە گرژ دەبێ و خاو دەبێتەوە.*

**گرفتاری** (ن.) ئالۆزی، بەرتەنگی، دڵتەنگی: *هەندەك جار بۆ مە گرفتاری پەیدا دبن.*

**گرنگ** (ئان.) بایەخدار، پڕبایەخ: *بە پرۆژەیەکی گرنگ خەریکم.*

**گرنگی** (ن.) بایەخ، بە هەند زانین: *دەمێکە گرنگی بە جۆری پرۆگرامەکانی خوێندن دەدرێت.*

**گرنگی پێدان** (چ.) بایەخ پێدان، بەهاپێدان: *منداڵ، کە کۆرپە بوو پێویستی بە گرنگی پێدانە.*

**گروپ** (ن.) تاخم، دەستە، کۆمەڵ: *قوتابییان بەسەر دوو گروپ دابەشکران.*

**گرێ** (ن.) ١- بەند، کە دوو بەن یان دوو داو لە یەکتری قایم دەکرێن. ٢- کێشە، هەرا، ناخۆش، دڵتەنگی، کۆسپ: *گرێیەکم بۆ پەیدا بووە خەریکە خۆمی لێ دەرباز دەکەم.*

**گڕ** (ن.) گوڕی، بڵێسە، تین: *تا دەهات ئاگرەکە گڕی زیاتر دەبوو.*

**گڕگرتوو** (ئان.) شتی سووتاو، ئاگر تێبەربوو، داگیرساو: *دارە گڕ گرتووەکە کەوتە خوارەوە.*

**گڕنژین** (ن.) زەردەخەنە، بشکوڕین، مسکە بوونەوە: *ئاسۆ بە گڕنژینەوە هات.*

**گژوگیا** (ن.) شینایی، لەوەڕ: *بناری هەڵگورد گژوگیای باشی بۆ مەڕو ماڵات لێیە.*

**گسك** (ن.) گێسك، جەرِیفك

**گشتی** (ئان.) تەواوی، خرِی، تێکرِایی، هەموو: *کتێبخانەی گشتی کتێبی زۆری تێدایە.*

**گفت** (ن.) بەڵێن، قەول، پەیمان، سۆز: *گفتم پێدایە، کە دیارییەکەی بۆ بەرم.*

**گفتدان** (چ.) بەڵێندان، پەیماندان، سۆزدان: *ئەگەر بەڵێنت بەیەکێك دا جێبەجێیبکە.*

**گفتوگۆ** (ن.) هەڤپەیڤین، چاوپێکەوتن، دەمەتەقێ: *بۆ هەر شتێك بێ گفتوگۆ لەگەڵ برادەرەکەم دەکەم.*

**گلارە** (ن.) ١- برِە داری لەسەر یەك دانراو، هەزرۆکەدار: *ئەم گلارە دارانە وردکە بۆ ناو سۆپە.* ٢- گلێنەی چاو: *من تۆم وەك گلارەی چاوم خۆشدەوێت.*

**گلدانەوە** (چ.) دەست بەسەرکرن، هێشتنەوە: *بۆ چەند مەبەستێك لای خۆی گلدایەوە.*

**گلۆربوونەوە** (چ.) گرِێلبوون، خلۆر بوونەوە، بانگرۆز بوون: *بەردەکە لەو بەرزاییە گلۆر بووە خوارێ.*

**گلێنەی چاو** (ن.) رەشکێنەی چاو، رەشکا چاڤی، گلێنکە: *دایك ئەوەندەی گلێنەی چاوی منداڵی خۆی خۆشدەوێت.*

**گڵ** (ن.) ئاخ، خۆڵ، خۆر: *جاران خانووبەرە هەر لەگەڵ دروستدەکرا.*

**گلە زەردە** (ن.) چیایەکە دەکەوێتە باشووری سلێمانی: *من بەسەر چیای گلە زەردە کەوتووم.*

**گواستنەوە** (چ.) ڤەگوهاستن، گوازتنەوە، بارکردن: *ماڵیان لە گەرِەکەکە گواستەوە بۆ گەرِەکێکی دیکە.*

**گوان** (ن.) گوهان، مەمکی ئاژەڵ: *بێچووەکان گوانی دایکیان دەمژێ.*

**گورج** (ئان.) چوست، خێرا، چالاک، چوستو چەلەنگ: *بە ئەسپێکی گورج بەرێکەوتم.*

**گورز** (ن.) ١- قامچی سەر ئەستوور، کە بۆ شەڕ بەکار دێ. ٢- پەتو پەڕۆی بادراو. ٣- گیای بادراو بۆ ئالفی ئاژەڵ بەکاردێنن.

گورگ

**گورگ** (ن.) گیانەوەرێکی دڕندەیە مەڕ و ماڵات دەخوات: *گورگ کەوتە ناو مەڕو ماڵاتی مام حەسەنی زۆربەی خواردن.*

**گوڕی** (ن.) گڕ، تین، بلێسە، تاو: *تا دەهات گوڕی ئاگرەکە بەتینتر دەبوو.*

**گوزەران** (چ.) ژیان، ژین، حەوانەوە، بەڕێوەچوون: *بۆ گوزەرانی ئەمساڵ دەغڵو دانێکی باش ئامادە کراوە.*

**گوژمە** (ن.) بڕێک، ئەندازەیک، بڕی تێچوو، ئەندازەی تێچوو: *گوژمەی ئەم پرۆژەیە دە ملیۆن دۆلارە*

**گوشاد** (ئان.) ١- فرەوان، فراوان، راهی، بەرین: *خانووی ماڵی باپیرم زۆر گوشادە.* ٢- خۆشی، شادی: *دڵم بە دیتنت گوشاد دەبێت.*

**گوشراو** (ئان.) گوشاو، گڤاشتی، وێکهێنراو: *جلوبەرگەکان باش گوشراون.*

**گول** (ن.) گوڵ، خونچەی پشکوتوو: *جۆرەها گوڵ لە باخچەی شاردا هەن.*

**گوللە** (ن.) فیشەک: *گوللە تەنیا بەرامبەر بە دوژمن بەکاربێنە.*

**گوڵاو** (ن.) بۆن، عەتر، گوڵاڤ، ئاوی بۆن خۆش، ئاوی گوڵ: *شووشە گوڵاوێکم کڕی.*

**گولاڵــــەو بــــەیبوون** (ن.) مێلاقــەو بەیبوون، دوو گوڵی بۆن خۆشن: *کوڵاڵـەو بـەیبوون لـە بـەهاردا بەدەردەکەون.*

**گوڵ باران** (چ.) گوڵپڕژێن، گوڵ بەسەردا بارانــدن: *گوڕانبیێژەکــە لــەناو حەشاماتی خەڵکەکـە گوڵبـاران کرا.*

**گوڵە بەڕۆژە** (ن.) گوڵە بەڕۆژ، گولا بەر بــەڕۆژکی: *لەناوچـەی پشـدەر گوڵە بەڕۆژە دەچێنرێت.*

**گوڵپڕژێن** (چ.) بڕوانە: گوڵ باران.

**گــوڵزار** (ن.) ١ــ لالــەزار، گوڵسـتان، باخچــێ گــولان، گوڵخانــە. ٢ــ ناوە بۆ مێینە.

**گونجــان** (چ.) ڕێکــەفتن، لــەباربوون، ڕێککەوتن، ساز بوون، پێکهاتن: *ئێستا بارودۆخەکە گونجاوە بۆ یەکتر بینین.*

**گــومێن** (چ.) ١ــ دەنــگ، گرمانــدن، گورمێن، گرمین: *گــومینی هــەور لە بەهاراندا زۆرە.* ٢ــ خوێندنی کــۆتر: *کۆترەکــان گومینیــان خۆشە.*

**گونجاندن** (چ.) ڕێکخستن، ڕێککەوتن، ســازکردن، پێکهێنــان: *زۆرمــان لێکــــردن تــا لەگـــەڵ یـــەك گونجاندمان.*

**گونجاو** (ئان.) ساز، لەبار: *ئەم خێزانە پێکەوە گونجاون.*

**گوند** (ن.) لادێ، دێ، ئاوایی: *خـەڵکی زۆربەی گوندەکان بە کشتوکاڵ و مەڕوماڵاتەوە خەریکن.*

**گوندەڵــــە** (ن.) کفتــە، کوتلــك: *لــە زســتانان خــواردنی گوندەڵــە خۆشە.*

**گوندۆر** (ن.) گنـدۆرە، کاڵەك: *گونـدۆر بەرووبومێکی هاوینەیە.*

**گونــدی** (ن.) لادێیی، کەسـێ ل گونـدا مەزن دبیت یان دێ ژی: *مرۆڤـێ گوندی ڕێنجبەرە.*

**گــوە** (ن.) گــوێ، گوێچــکە، ئـامرازی بیستن: *مرۆڤان دوو گوهـ هەنە.*

**گوهدار** (ن.) گوێگر: گوهدارن بەرنامەیا من گەلەکا دلخۆشن.

**گوە نەدان** (چ.): فەرامۆش کردن، بەلاوە نان، گوێ پێنەدان، گرنگی پێنەدان: *خەڵکی گوندی گوە دانە هاواری شڤانی.*

**گویز** (ن.) گوێز، جویز: *گوێزی هەورامان ناسکە بە دەست دەشکێت.*

**گوێ** (ن.) گوە، گوێچکە، بەهۆیەوە گوێمان لە هەموو جۆرە دەنگێك دەبێت.

**گوێپێنەدان** (چ.) بڕوانە: **گوە نەدان.**

**گوێچکە** (ن.) بڕوانە: **گوێ.**

**گوێ ڕاهێشتن** (چ.) گوێدان، گوێ لێگرتن، گوەدان، گوەگرتن: *بە وردی گوێی بۆ مامۆستا ڕاهێشتبوو.*

**گوێ ڕەپە** (ن.) گوێ ڕەپانە، بن گوەك، نەخۆشییەکی منداڵانە، کە بن گوێی ئەستوور دەبێ: *وریا تووشی گوێ ڕەپە بوو، خێرا چارەسەر کرا.*

**گوێزانەوە** (چ.) ڤەگوهازتن، گواستنەوە: *سوێنێ لە نزیك ماڵمان ئاهەنگی بوو.*

**گۆ** (ن.) ١- تۆپ، شتی خڕ: *گۆی زەوی ٧٢٪ی ئاوە.* ٢- چیچکەی گوان، یان مەمك.

**گۆپکە** (ن.) ١- بشکوژ، خونچە: *گوڵەکان گۆپکەیان کردووە.* ٢- بڕوانە: **گۆ.**

**گۆتن** (چ.) گوتن، وتن: ئەوەی گۆتی هەموو ڕاست بوو.

**گۆران** (ن.) ناوی تیرەیەکی کوردە: *من لە تیرەی گۆرانم.*

**گۆڕانکاری** (ن.) گوهۆڕینکاری، ئاڵوگۆڕی: *گۆڕانکارییەکانی جیهان خێران.*

**گۆڕەپان** (ن.) مەیدان، یاریگا: *ئاهەنگەکە لە گۆڕەپانی قوتابخانە بەڕێوەچوو.*

**گۆڕیلا** (ن.) جۆرە مەیموونێکە، گۆڕیلا لە ڕووی قەوارەوە ئەوەندەی ئادەمزاد دەبێت.

**گـــۆڕین** (چ.) گوهـــوڕین، گـــوهڕین، وەرچـــەرخین، لادان: *مـــاددە لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێت.*

**گۆزە** (ن.) گۆزگ، کۆپە، گوسك: *گۆزە لە قوڕ دروستدەکرێت.*

**گۆشە** (ن.) کوژی، قوڕنە، قوژین: *لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا بە تەنها ڕاوەستابووم.*

**گۆشـــکردن** (چ.) پـــەروەردەکردن، گەشـــەکردن، فێرکـــردن.: *ئـــەم منداڵە بەچاکی گۆشکراوە.*

**گۆڤار** (ن.) کۆڤار، کۆوار، بڵاوکراوەی هەفتانـــە یـــان مانگانـــە یـــان وەرزانە: *گۆڤاری هەتاو لە نێوان ســـاڵانی ١٩٥٤–١٩٦٠ دا لـــە هەولێر دەردەچوو.*

**گۆگرد** (ن.) کبریت، ماددەیەکی زەردی ترشە لە کان دەردەهێنێرێتو لە زۆر پیشەسازی بەکاردەهێنرێت: *شـــخاتە لـــە گـــۆگرد دروســـت دەکرێت.*

**گۆم** (ن.) ئاوی ڕاوەستاو، مەنگ: *گۆمی ورمێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانە.*

**گۆماو** (ن.) گەراڤ، گەرافك، گۆم،ئەو چـــاڵاییەی، کـــە ئـــاوی لێڕادەوەستێو پەنگدەخوات.

**گۆنا** (ن.) کوڵم، کوڵمی ڕوومەت: *تـارا گۆنای گەشە.*

**گیـــان** (ن.) ١– ڕوح، جـان: *بـە ڕوح و جان لەدواتم.* ٢– بەدەن، لـەش، قالـب: *ئەوەنـدەم وەرزش کـرد، هەموو گیانم سووك بوو.*

**گیاندار** (ن.) بڕوانە: **گیانلەبەر**

**گیانلەبەر** (ن .) زینـدەوەر، بونـەوەر، گیانـــدار: *ورچ گیانلەبـــەرێکی بەهێزە.*

**گیرە** (ن.) ١– نیشانەیەکە لەسەر تیپ دادەنرێت، بۆ ئەوەی تیپەکە بـە گرانی بخوێندرێتەوە، ئەم جۆرە نیشـانەیە لـە زمـانی عەرەبیـدا هەیـــە. ٢– ئامرازێکـــە جلـــی هەڵواســـراوی لەســـەر رســـتە پێدەگیرێت.

**گیرفان** (ن.) بەرێك، بەری: *قەڵەمەکەم لەناو گیرفاندا لێکەوتووە.*

**گیروگرفت** (ن.) کۆسپ و تەگەرە، کێشە، پرس، ئاریشە، گێچەڵ، تەشقەڵە: *تا کارەکەمان تەواو کرد گیروگرفتی زۆرمان نەهاتە رێ.*

**گیسك** (ن.) بەچکەی بزنی لە شیر دابڕاو لە تەمەنی ٥–٦ مانگیدا دەبێت.

**گێتی** (ن.) جیهان، دنیا: *زۆربەی پزیشکانی ئاژەڵ لە گێتی خەریکی چارەسەرکردنی نەخۆشی ئەنفلۆنزای باڵندەن.*

**گێچەڵ** (ن.) بڕوانە: **گیروگرفت**

**گێڕ** (ئان.) خوارو خێچ، سەقەت.

**گێڕانەوە** (چ.) ١– باسکردن، وتن: *گێڕانەوەی چیرۆك بۆ منداڵان بەسوودە.* ٢– هێنانەوە، گەڕاندنەوە، فەگێڕان: *گێڕانەوەی خەڵکی کەرکوك بۆ زێدی خۆیان کارێکی پێویستە.*

**گێژاو** (ن.) گێژەن، نەگبەتی، هەراو هۆریا: *بە هاوکاری هاوپەیمانی لەو گێژاوە رزگاری هات.*

**ل** (ئام.) لە: *ئەز ل ماردینێ ژ دایك بوومە.*

**لابردن** (چ.) لابرن، ڤەدان، لادان، ڕامالّین، نەهێشتن، نەهێلان: *ئەو بەربەستانەی کە لەسەر شەقام داندرابوون لابران.*

**لات** (ن.) ١– مالك، دەپ، باوە، دێراو: *دوو لاتە تەماتەم ئاودا.* ٢– لەڕ، لاواز: *مەڕەکە لات و لاوازە.*

**لاجان** (ن.) ١– لا جانگ، لا ڕوومەت، جێنیك، جوهنیك: *دەستم لەسەر لاجانی دانا.* ٢– ناوی شارۆچکەیەکە لە ڕۆژهەلاتی کوردستان.

**لادێ** (ن.) دێ، گوند، ئاوایی: *دوای ڕاپەڕین زۆربەی لادێکان ئاوەدان کراونەتەوە.*

**لار** (ئان.) خوار، چەوت، پێچەوانەی ڕاست: *دارەکە لارە بە کەلکی کۆچان نایەت.*

**لاسار** (ئان.) مەژی هشك، لامل، یاهی، سەرپێچیکەر، گوێ پێنەدەر، شیم: *بەخوا کەسێکی لاسار بوو.*

**لاساییکردنەوە** (چ.) زارڤەکرن، لەچاوکردنەوە: *لاساییکردنەوەی خەڵك بە مەبەست پەسەند نییە.*

**لاستیکی کوژاندنەوە** (ن.) لاستیکێ ژێبرنێ، ژێبرك، لاستیکی سڕینەوە: *مامۆستا لاستیکی کوژاندنەوە لە ئازاد وەرگرم؟*

**لاسك** (ن.) بستیك، لاچك: *تووڕ لاسکەکەشی دەخورێت.*

**لافاو** (ن.) سێڵاو، سەیلاو، لەهی، ئاڤرابوون، لێشاو، کە زەوی دەوروپشتی خۆی دادەپۆشێت: *ئەمساڵ لافاوەکی گەورە هەڵسا.*

**لاڵ** (ئان.) بێ زمان، کەسەك نەتوانێ قسە بکا یا زمانی زۆر بگیرێ: *لاڵەکان زمانی هێماو نیشانە بەکاردەهێنن.*

**لانە** (ن.) لانك، بیش، دەرکۆش، بێشکە، هێلین، لانك، هێلانە، وەکو لانەی شێر، لانەی کەروێشك.

**لاندك** (ن.) بڕوانە: لانە.

**لاو** (ن.) خورت، جحێڵ، تۆلان، نەوجەوان، گەنج: *مەستە لە خەو ئەی لاوی کورد تێبکۆشە بە دەستوبرد.*

**لاوەکی** (ئان.) ١- دەرەکی، بیانی: *ئەم کێشەیە هۆکاری لاوەکیشی هەیە.* ٢- پێچەوانەی سەرەکی.

**لاوك** (ن.) جۆرە گۆرانییەکی کوردییە: *محەمەد عارف جەزراوی لاوك بێژەکی بەناوبانگ بوو.*

**لاوی** (ن.) لاوێتی، تۆلازی، جحێڵی، گەنجی: *سەردەمی لاوی ئێمە وەك ئێوە نەبوو.*

**لەبەر** (ئاك.) ١- لبەر، لەپێش، لەبەردەم: *لەبەر دەرگا راوەستابوو.* ٢- خاتر، لە پێناو، ژ بەر: *لەبەر تۆ هاتمە ئێرە.*

**لەبەر ئەوە** (ئاك.) بۆیە، لەوا: *لەبەر ئەوەی زۆرم دەخوێند یەکەم بووم.*

**لەپك** (ن.) دەستکێش، دەستگۆر، دەزگۆرك، دەستەوانە: *لەکاتی زستاندا لەپك لە دەست دەکەم.*

**لە پێناو** (ئام.) ژ بۆ، ژ پێخەمەت، سەخمەراتی، لە بۆ: *ئێمە لە پێناوی ئەم خاکە تێدەکۆشین.*

**لەتاو** (ئاك.) ١- لەتاسەو ئارەزوو: *لەتاو تۆ حەژمانم نییە.* ٢- لەبەر، ناچاری: *لەتاو ئێش و ژان خەوم نییە.*

**لەتلەت** (ئان.) هنجنی، هەنجن هەنجن، پارچەپارچە، کەرتکەرت، زڤل زڤل.

**لە جیاتی** (ئاك.) لە بری، ل شوینا: *من لە جیاتی تۆ دەچمە ئاهەنگەکە.*

**لەخۆبایی** (ئان.) خۆ بەزلزانین، پەراستی ستویر، خۆ پێ گەورە، ددلێ خۆدا ئاڤا: *لە خۆبایی بوون ئاکامی باش نییە.*

**لەخۆڕا** (ئاك.) لەخۆوە، لە بەلاش، لە خۆیەوە، بەبێ هۆ: *لەخۆڕا قسەم لەگەڵ ناکات.*

**لەدایکبوون** (چ.) دەرچوونی منداڵ لە سکی دایکی، ژ دایکبوون: *بەبۆنەی جەژنی لە دایکبوونت ئەم دەستە گوڵەت پێشکێش دەکەم.*

**لە دوای** (ئاك.) پشتی، لە پاش، پاش: *لە دوای تاقیکردنەوە دەتبینم.*

**لەش** (ن.) جەستە، تەن: *لەشی مرۆڤ بە وەرزش پتەو دەبێت.*

**لەشکر** (ن.) سوپا، هێز: *لەشکری کوردستان بەهێزە.*

**لەشکرکێشی** (ن.) سوپا ئامادەکردن بۆ شەڕ: *دوژمن خەریکی لەشکر کێشیەکی نوێیە.*

**لەقاندن** (چ.) هژاندن، ڕاژاندن، جووڵاندن، هەژاندن: *سەرلەقاندن لە سەرەوە بۆ خوارەوە نیشانەی ڕازی بوونە.*

**لەقە** (ن.) پێ لەقە، پێهن هاڤێتن، جووتك هاڤێتن، پێلاقە، لوشك، توند ئاوێتن یا ڕاوەشاندنی پا: *گوێدرێژەکە لەقەیەکی هاویشت.*

لەقلەق

**لەقلەق** (ن.) لەگلەگ، باڵندەیەکی دندوك درێژو لاق درێژی سپیو ڕەشە، گەرمیانو کوێستان

دەگەڕێ: *لەقلەق مێلانەی لە شوێنی بڵند دروست دەکات.*

**لەگەڵ** (ئاك.) پێکرا، دگەل، دەگەڵ: *لەگەڵ وان دەچم بۆ سەیران نەك تەنیا.*

**لەمەوبەر** (ئاك.) بەری نهو، بەری نووکە، پێش ئێستا: *تۆزەك لەمەوبەر گەیشتمە جێ.*

**لەمەو پاش** (ئان.) ژنهو وێڤە، لە ئێستا بەدواوە، لەمەو دوا، لەمڕۆوە: *لەمەو پاش خۆمان بڕیار دەدەین.*

**لەنگ** (ئان.) شەل، شل، خوار، ناڕێك: *ئەو دێڕە مۆنراوەیە نەختێك لەنگە.*

**لەوا** (ئاك.) بۆیە: *لەوا دخوینم دا ببمە زمانڤان.*

**لەوەڕگا** (ن.) جێ لەوەڕ، چەروان، شوێنی لەوەڕ: *کوێستانەکان لەوەڕگای باشی مەڕو ماڵاتن.*

**لەیەکچوون** (چ.) ١- وەك هەڤبوون، وەك یەکبوون، پێکچوون، لە یەککردن: زیندەوەرەکان لەزۆر ڕوخساری ژیاندا لەیەك دەچن.
٢- لەبەر یەکچوون، لە یەکترازان، ژێەر ئێك چوون: *جومگەی ئەژنۆم لە یەکچووبوو.*

لەیستۆك

**لەیستۆك** (ن.) بووکۆکە، یاری منداڵان، بووکەشووشە، بوکڵە، ویلکان: کچم یەکەم بە *لەیستۆکەکی جوانت بۆ دەکڕم.*

**لدویڤ** (ئاك.) لە دوای، لپەی: *ل دویڤ گوهێ وی بکە.*

**لفکە** (ن.) ١- لیفك، ئەوەی مرۆڤ خۆی پێ دەشوات: *لیفکە لە لۆکە یان خوری دروستدەکرێ.*
٢- لەوەندی، ئەو پەڕۆ

سپییەی، کە پیاوان لە مەچەکی خۆیان وەردەئاڵاند.

**لق** (ن.) ١- تا، لك، بەش، پەل، چق، شاك: *لقە دارەکەمان بڕی.* ٢- گرووپەکی سوپا.

**لکان** (چ.) نویسان، پێڤەنیسیان، چەسپ بوون، چەسپان: *منداڵەکە بە دایکێوە لکاوەو بەری نادات.*

**لم** (ن.) خێز، زیخ، لیّم، خۆڵی ورد کە ئاو رایدەماڵێت: *لافاو لمێکی زۆر لەگەڵ خۆی رادەماڵێت.*

**لموز** (ن.) لمبۆز، لمبیس، دەم و کەپووی ئاژەڵ، قەپۆز: *لموزی بەرخەکە وەك خۆی جوانە.*

**لوئلوو** (ن.) لوولوو، مرواری و درەخشان، بەردی بە نرخن لەنێو دەریادا دەردەهێنرێن: *گوارەیەکی لوئلوئم هەیە.*

**لووت بەرز** (ئان.) بەفیز، دفن بلند: *لە ئاست خەڵکیدا هیچ کات لووت بەرز مەبە.*

**لووت پژان** (چ.) خوێن بەربوونی کەپوو، خوین رستن، کەپوو دارسان: *ماوەیەك تووشی لووت پژان بووم.*

**لووت شکاندن** (چ.) تەمێ کردن، دفن شکاندن: *لووتیان شکاندووە بۆیە ناتوانێ چیتر ئەمە دووبارە بکاتەوە.*

**لووس** (ئان.) حولی، ساف، بێ موو، بێ گرێ: *لەشی بۆق بەپیستەکی لووسی تەڕ داپۆشراوە.*

**لوولە** (ن.) لویلی، بۆری، شتی درێژی بازنەیی ناو بۆش: *لوولەی تفەنگی برنۆ درێژە.*

**لوولدان** (چ.) پێچان، بادان: *نانەکی لوولدراوم خوارد.*

**لۆکە** (ن.) جۆرە کەرستەیەکە جلوبەرگو پەردەو... لێ دروستدەکرێت. لۆکە لە جۆرە رووەکێك پەیدا دەبێت، کە پێیدەڵێن: پەموو.

**لۆمە** (ن.) گلەیی، گازاندە، سەرزەنشت: *بۆ ئەوەی لۆمەی*

*خەلکیم نەیتە سەر باش کارەکانم دەکەم.*

**لیتە** (ن.) لێم، هەڕی، قوڕی نەرمەوە بوو: *کەس لە لیتەی سەر جادەکە دەرنەدەچوو.*

**لیژنە** (ن.) کۆمیتە، لێژنە، لیجنە، دەستەیەك لە خەڵك بۆ كار بەڕێوەبردن: سالانە لە قوتابخانەکەمان لێژنەی دایك و باوکان دادەنرێت.

**لیست** (ن.) ریزە، ناوی سیانی: *ناوم لە لیستەکەدا پێنجەمینە.*

**لینج** (ئان.) نویسەك، لیچ، لینچق، لچ، لووس، لیق: *لەبەر لینجی نەمتوانی بیکرم.*

**لێ** (ئام.) بەڵام، وەلێ: *زستان ساردە، لێ هاوین گەرمە.*

**لێبووردن** (ن.ل) بووردن، بەخشین، پێهەیلان، لێنەگرتن، لێخۆشبوون، ئازاد کردن: بە *گیانی لێبووردن دەتوانین خۆمان پێش بخەین.*

**لێخشاندن** (چ.) تێهوسین، وێرانیان، پێداهێنان: کۆرەکە بە دەست *لێخشاندن لایتەکەی نۆزییەوە.*

**لێدان** (چ.) ١- قوتان: *لێدانی منداڵ قەدەغەیە.* ٢- مۆسیقا لێدان: *ئاوازەکی خۆشی لێدا.*

**لێدوان** (چ.) سەر ئاخفتن، ئاخاوتن، گوتن، ڕاگەیاندن: *ئەو لێدوانەی پارێزگار سوودی تێدابوو.*

**لێشاو** (ن.) لافاو، لەهی، ئاوی زۆر بە خوڕو تەوژم: *ماڵمان وەبەر لێشاوەکە کەوت.* بڕوانە: **لافاو**.

**لێقەومان** (چ.) تووشی بەلا هاتن، بسەری هاتی، بەسەر هاتن، تووشهاتن: *لە کاتی لێقەوماندا یارمەتیدەر بە.*

**لێکچوون** (چ.) بڕوانە: **لەیەکچوون**.

**لێکڤەکرن** (چ.) دابەشکردن، پارڤەکرن: *مە میراتی خۆ لێکڤە کر.*

**لێککردنەوە** (چ.) ژێکڤەکرن، لە یەك جیاکردنەوە، پارچە پارچەکرن،

زفێل زفێل کرن: *لێککردنەوەی ماڵەکەمان بە پێویست زانی.*

**لێگەڕان** (چ.) ١- ڕازی بوون، هێشتن، واز لێ هێنان: *لێگەڕێ با قسەکانی تەواو بکات.* ٢- بەدوادا چوون، لێگەڕیان، لدویڤ گەڕیان، لێ نۆڕین: *زۆر لێی گەڕاین، هەتا دۆزیمانەوە.*

**لێڵ** (ئان.) شلوێ، شێلو، ئاوی نارۆشن، شێلی: *ئاوی لێڵ مەخۆرەوە.*

**لێنەگرتن** (چ.) بڕوانە لێبوردن.

**لێهاتوو** (ئان.) ژێهاتی، شیاو، گونجاو: *کەسێکی لێهاتوو بۆ ئەم شوێنە دیاری بکەن.*

**لێهاتوویی** (ن.) کارامەیی، لێوەشاوەیی، شیاوی، گونجاوی: *ئارادەیەک کارەکەی بە لێهاتوویی بەڕێوەبردووە.*

**لێو** (ن.) لێڤ، بەشێکە لە دەم و چاوی مرۆڤ: *هەندێک دەنگ بە لێو کۆ دەکرێن.*

**لێوار** (ن.) لێڤ، گڤانده، ڕەخ، ڕۆخ، کەنار، دەم، دەو: *کەشتێکەمان لەسەر لێواری زەریای سپی ناوەڕاست لە شاری نیس ڕۆنیشت.*

**لێوان لێو** (ئان.) پڕاو پڕ، تەژی، لێواو لێو: *ژیانمان لێوان لێو بوو لە ڕێزو خۆشەویستی.*

**مـــاد** (ن.) نێـوێکی ئـەتنیکی کۆمەڵـەی ئێرانییە، لە سەرەتای هـەزارەی یـەکی پـێش زایینیـدا لـە لایـەن پاشایانی ئاشوور بـە دوو شێوە ئـەم نێوەیـان تۆمـار کـردووە: مـادای دەنـوتی بـە واتـا مـادە نێزیکەکان . مادای رەقوتی یانی مادە دوورەکان. دەهیاکو یەکەم سـەرکردەی مادەکـان بـووە. ئیمپراتۆریـەتی ئاشـوور لـە سەدەی حەوتی پێش زاییندا بە دەسـتی کەیخوسـرەوی مـاد کۆتایی پێهات.

مار

**مـــار** (ن.) ١- خشـۆکی ژەهـراوی: *ئــەوەی مــار پێــوەی دەدات پێویســتە زوو بگەیەندرێتــە لای پزیشک.* بڕوانە: **کۆبرا**.

**مارگەستە** (ن.) مارگەزتی، مارانگاز، ئەوەی مار پێیەوەدابێ، مارانگەستە، مار پێڤەدای: *مارگەستە لە گوریس دەترسێت* (پەندە).

**مازوو** (ن.) بەری دار مازوو، بۆ پیشەسازی بەکاردێت.

**مازووچن** (ئان.) کەسەکە مازوو لە دار لێدەکاتەوەو کۆدەکاتەوە: *ئازا مازووچنەکی باشە.*

**ماست** (ن.) ماست لە بەرویوومی شیرە: *ماستی مەڕ تام و چێژی تایبەتی هەیە.*

**ماسوولکە** (ن.) زەڤلەك: *وەرزشوانەکان ماسوولکەیان بەهێزە.*

**ماسوولکەی خۆنەویست** (ن.) زەڤلەکا نەخوازەکی، زەڤلەکا خۆ نەڤیای.

**ماسوولکەی خۆویست** (ن.) زەڤلەکا خوازەکی، زەڤلەکا خۆ ڤیای.

**ماف** (ن.) حەق، هەق، بەش: *بیرورا دەربڕین مافەکی سروشتی هەموو کەسەکە.*

**مافخوراو** (ئان.) بەشخوراو، حەق خوراو: *دەبێت ماف بۆ مافخوراو بگەڕێندرێتەوە.*

**ماڵ** (ن.) ١- خانی و تشتێن تێڤە، خانوو و شتەکانی، جێ و ڕێی ژیان: *ماڵا مە یا ل وانێ.* ٢- سامان و دارایی: *ماڵەکی زۆری بەکارەکەی خۆیەوە پەیدا کردووە.*

**مامز** (ن.) ئاسك، خەزاڵ: *لە باخچەی ئاژەڵان مامزی جوان هەیە.*

**مامۆژن** (ن.) ژنمام، ژنی مام: *مامۆژنم گەلەك ڕێزی من دەگرێت.*

**مامۆستا** (ن.) فێرکار، وەستا، ئوستاد، سەیدا: *شادان مامۆستایەکی دڵسۆزە.*

**مامناوەندی** (ئان.) ناڤنجی، ناوەندی، ئاست ناوەڕاست: *هێزۆ لە چەند دەرسەك مامناوەندییە.*

**مان** (ن.) ١- مانگ، هەیڤ. ٢- نەمردن، لە ژیاندا بوون: *لە چوار منداڵ دوویان مان.*

**مانـدووكـردن** (چ.) وەستاندن: *خەلَ ماندووكردن سوودی هەیە.*

**مانـدی** (ئـان.) مانـدوو، شـەكەت، وەستیای، ماندك، ئەگەر تۆ هەر كارێكی بەبێ وەستان ئەنجام بدەیت تووشـی مانـدی بـوون دەبیت.

**ماندیبوون** (چ.) ماندووبوون، شەكەت بـوون، وەسـتیاییبوون: *كرێكارەكی چاكە كەم ماندی دەبێت.*

**مانگ** (ن.) بڕوانە مان.

**مانگا** (ن.) ڕەشە ولاغ، چێلّ، چێر.

**مانگەشەو** (ن.) تاڤەهەیڤ: *دیمەنی مانگەشەوگەلەك جوانە.*

**مە** (ج.) ئەم، ئێمە: *مە سوێندا خاری بەرسینگێ دوژمنا بگرین.*

**مەبەست** (ن.) ئامانج، نیاز، مەخسەد، رامـان، مـەرام: *مەبەستم یارمەتیدانی ئێوەیە.*

**مەتەرێز** (ن.) سەنگەر، تابی، چەپەر: *مەتەرێزی كوردایەتی بەرنادەین.*

**مەترسی** (ن.) ترس، سەهم: *ئەمە مەترسی زۆرە.*

**مەجرووم** (ئان.) عاشقەكی بەناوبانگە لە (مەجنون)ی عـەرەب وەرگیراوەو لە كوردیدا بۆتە (مەژرووم یان مەژلووم): *مەجرووم لەیلای خۆش دەویست.*

**مەحالّ** (ئـان.) ئەستەم: *مەحالە بێ زانست بەرەو پێش بچین.*

**مەرەز** (ن.) مووی نەرمی بزنە مەرەز كە دەكرێتە شالّ: *بەرگیسكێن مەرەزی گەلەك گرانبهانە.*

**مەرەزە** (ن.) چەلّتووك دوای شین بوون، برنجەجاڕ، پیشكێ برنجی: *خەریكی چاككردن و بژاركردنی مەرەزەكەیە.*

**مەرەق** خولیا، ئارەزوو، هەودا: *من مەرەقە ئەز مەمی زارافێن كوردی بزانم.*

**مەرد** (ئـان.) ١ــ ئازا، چاو نەترس، جوامێر، بە جەرگ: *سەركەوت زۆر مەردە.* ٢ــ مرۆڤێ دەست

ڤەکری، نانبدە، ناندەهـ: *مرۆڤێ مەرد خۆشتڤییێ خەلکێیە.*

**مەڕ** (ن.) پەز، مێگەل: *ڕەوەندەکان بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکانیان کوێستان وگەرمیان دەکەن.*

**مەڕە** (ن.) قەڵشە، شکێر، کەڤر، بەردی گەورە لە چیای بەردین: *مەڕەکان دارمان.*

**مەزن بوون** (چ.) گەورە بوون، هەر جارێکی ئاهەنگی رۆژی لەدایکبوونت بگێڕیت، مانای ئەوەیە، کە تۆ ساڵێك مەزنتر بوویت.

**مەزنی** (ن.) گەورەیی، ئەگەر تۆ رێز لە کەسێك بنێیت، مەزنی پێدەبەخشیت.

**مەژی** (ن.) مژك، مەژو، مەژگ، مێشك: *بێ مەژی مرۆڤ نەشێت هزر بکەت.*

**مەست** (ئان.) سەرخۆش: *خۆت لە پیاوی مەست بپارێزە.*

**مەسەلە** (ن.) کێشە، دۆز، پرس: *ئەگەر گفتوگۆ لەسەر چۆنیەتی تاقیکردنەوەکانی بەکالۆریا بکرێت، مەسەلەیەکی پێویستە.*

**مەسکەن** (ن.) ماڵ، شوێنی لێ ژیان: *کوردستان مەسکەنی کوردە.*

مەشخەڵ

**مەشخەڵ** (ن.) گڕی بەرز، ئاگر، خەتیر، شاپڵیتە: *مامۆستا بۆ گەل مەشخەڵی رووناکی رێگایە.*

**مەقاش** (ن.) مقاش، ماشە، گاسك، خرماش، گازك، پەنگر کێش: *پەنگرەکانی بە مەقاش خڕ کردەوە.*

**مەکتەب** (ن.) فێرگە، خوێندنگەهـ، قوتابخانە، وشەیەکە لە (کتب)ی عەرەبی وەرگیراوە.

**مەلا** (ن.) زانای ئایینی ئیسلام: *باوکم زانای ئایینی بوو.*

**مەلەوانی** (ئان.) مەلەڤانی: مەلەوانی وەرزشەکی بە سوودە.

مەلۆتکە

**مەلۆتکە** (ن.) منداڵی ساوای قۆنداغ کراو، قماتک یان مەلیتك: *مەلۆتکەکە لە نێو جێگەی خۆی خەوتووە.*

مەلیك مەحمودی حەفید

**مەلیك** (ن.) پادشا، مەلك، خاوەن شکۆ: *لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا شێخ مەحمود مەلیکی کورد بوو.*

**مەڵاس** (ئان.) پەنا، پەناگە، کەلێن، بۆسە، دەحل: *خۆی مەڵاس دابوو.*

**مەڵبەند** (ن.) بنگەه، ناوەند، جێ، شوێن: *زۆربەی سەندیکەکان مەڵبەندی رۆشنبیرییان هەیە.*

**مەمکدار** (ئان.) بە مەمك، ئەوەی شیر دەدا: *گیانەوەرە مەمکدارەکان بەزایین زۆر دەبن.*

**مەنجەڵ** (ن.) قازان، قزانك، مەنجەر: *پێشتر چێشت لە مەنجەڵی سفر لێدەنرا.*

**مەندەهۆش** (ئان.) سەرسام، هەیبەتی، بەهتی: *من لەم کارە مەندەهۆش بووم.*

**مەوج** (ن.) جاجم، پۆپەشمین: *دایە سەرمامە مەوجەکەم پێدادە.*

**مەودا** (ن.) ١- ناڤبەر، ماوەی بەینی دوو شت: *مەودای هەولێرو مووسڵ نزیکەی ٧٠ کیلۆمەترە.*
٢- کات و سات: *لە مەودایەکی کەمدا ئەم کارە ئەنجام درا.*

**مەهاباد** (ن.) سابڵاخ، شارەکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا: *مەهاباد پایتەختی کۆماری کوردستان بوو.*

**مەی** (ن.) شەراو، شەراب، بادە: *مەی خواردنەوە ئادەمزاد بێ هۆش دەکات.*

**مەیدان** (ن.) گۆڕەپان: *سەرفرازییە ئەم لە مەیدانێن خەباتێ شەهیدبین.*

**مخابن** (ن.) بەداخەوە، جهێ داخێیە، حەیف، موخابن: *مخابن تو نەهاتی.*

**مراوی** (ن.) وەردەک، ئۆردەک، مراقی، مامراوی: *مراوی باڵندەیەکە حەز لە مەلەوانی دەکات.*

**مردن** (چ.) گیان لە لەشدا نەمان، گیان دەرچوون، مرن.

**مرن** (چ.) بڕوانە: **مردن**.

**مرۆڤ** (ن.) ئادەمزاد، مرۆ، مەردوم، ئینسان: *لە پێناو دروستبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی دەبێ مافەکانی مرۆڤ بپارێزرێن.*

**مریشك** (ن.) مامر، باڵندەیەکی ماڵی هێلکەکەرە: *مریشکی ڕەش زۆر جوانە.*

**مزراح** (ن.) نەعوور، خولخولەیێکە بەنی تێ دەهاڵێنن و دەیهاوێن و دەسووڕێت: *منداڵان یاری بە مزراح دەکەن.*

**مزرەمەنی** (ن.) ترش و شیرینی، پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج و ..هتد: *باقوبە و شارەبان بە مزرەمەنی بەناوبانگن.*

مزگەوت

**مزگەوت** (ن.) مزگەڤت، پەرستگای موسڵمانان، شوێنی نوێژ و خواپەرستی: *پێغەمبەر (د.خ) یەکەم مزگەوتی لە مەدینە دروستکرد.*

**مژوول بوون** (چ.) خەریك بوون، مژویل بوون: *من خۆم مژوولی خوێندن دەکەم.*

**مژین** (چ.) مێژین، مێتن، مشتن: *گۆلك گوانی دایکەکەی دەمژێت.*

**مس** (ن.) جۆرە کانزایەکە، سفر: *مس کانزایەکی بەنرخە.*

**مسك** (ن.) جۆرە بۆنەکە لە ئاسك وەردەگیرێ، موشك: *بۆنت ئەوەندە خۆشە وەك مسکە.*

**مسۆگەر** (ئان.) دابینکراو، دەستەبەر کراو: *من ئەم ساڵ سەرکەوتنم مسۆگەر کردووە.*

**مشەخت** (ئان.) ئاوارە، دەربەدەر، پەناهەندە، کۆچکەر: *ئێدی ئەم مشەختی هیچ وەڵاتەکی نابین.*

**مفا** (ن.) سوود، قازانج، کەلك: *من مفا ژ خواندنێ وەرگرت.*

**مفادار** (ئان.) سوود بەخش، بە کەڵك، بە قازانج: هەنگ مێروویەکی مفادارە.

**مل** (ن.) بەشێکە لە تەنی مرۆڤ، مل دەکەوێتە نێوان سەروشانی ئادەمزاد.

**مل شۆڕ** (ئان.) ملکەچ، سەرشۆڕ، چاڤشۆڕ: *مرۆڤی مل شۆڕ نا پەسەندە.*

**مللەت** (ن.) میللەت، گەل: *مللەتێ مە بۆ ئازادی دخەبتە..*

**مللەتفرۆش** (ئان.) ئەوەی بەرژەوەندییەکانی میللەت دەخاتە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆی: *ئەگەر مللەت فرۆش نەبن، چ جارا دوژمن نەشێنە مە.*

ملوانکە

**ملوانکە** (ن.) ستوڤانك، ستڤانگ، خەناوکە، گەردانە، گەردن بەند: *لە رۆژی بەدەستگیرانیبوونیدا ملوانکەیەکی جوانی بە دیاری بۆ کڕیبوو.*

**ملیۆنێر** (ئان.) کەسەکە لە ملیۆن دۆلاری زێتر هەیە، کەواتە ئەو کەسە زۆر دەوڵەمەندە.

**منـــارە** (ن.) لوولـە قـووچ و درێژەکـەی سەر مزگەوت: *منارەی چۆلی لـە کــەرپووچ دروســت کــراوە دوو دەرگاو دوو پەیژەی هەیە.*

**منداڵ** (ن.) منال، زارۆک، زارۆ، زارۆڵـە، بچـووک، بچـیک: *منـداڵ نــەوەی ئایندەیە.*

**منداڵە ورتکە** (ن.) منـداڵی ورد، یـانی بە تەمەن بچووک: لەگـەڵ منداڵـە ورتکان مەگەڕێ.

**منداڵ بوون** (چ.) زانی ئـافرەت، ئەگـەر ژنێـک منداڵــەکی بـوو، مانــای ئەوەیە منداڵەک لە سکی دێـتە دەرەوە: *ژنەکـە لـە نەخۆشـخانە منداڵی بوو.*

**منداڵ پارێز** (ئان.) پارێزەری منداڵان: *رێکخـــراوی منــــداڵ پــــا.یێز پارێزگاری لە مافـەکانی منـداڵان دەکات.*

**منداڵی** (ن.) ئەو تەمەنەی منداڵ تێیـدا دەژی، کــە تــا ۱۸ ســـاڵییە، زارۆکینی: *لـە منداڵییـەوە فێـری خۆشەویستی نیشتمان بووم.*

**موخابن** (ئان.) بڕوانە: **مخابن**

**مـــوژدە** (ن.) مـژدە، مزگێنــی، هــەواڵی خۆش: *من موژدەی سـەرکەوتنم بۆ برد.*

**مووچە** (ن.) ئەو برە پارەیەیە، کـە تـۆ بەرامبەر ئەنجامدانی کاردا وەری دەگریـت، مانگانـەی فەرمانبـەر: *مووچەی کارمەندان زیادکراوە.*

**مـــوورووو** (ن.) موریـک، مـۆری، دەنکـە وردەی جوانکـــــاری: *ئـــــەو موورووانە رەنگاو رەنگن.*

**موولوولــــەی خـــوێن** (ن.) ریشـالکێن خوینیێ، بۆرییە وردەکانی خـوێن، دەمارە وردەکان.

**مۆبیل** (ن.) ئەو کەرستانەن، کە لە نێو ماڵدا بەکار دێن، وەک: کورسی، مێز و کەنەپە و....

**مـــۆرکردن** (چ.) واژوو کـــردن: *لەســـەر کاغەزەکە مۆرم کرد.*

**مۆزەخانــــە** (ن.) ئەنتیکەخانــە، ئــەو جێگایەی کـە شـوێنەواری کۆنی تێدایـە: *مۆزەخانـەی لۆڤـەر لـە پاریس زۆر بەناوبانگە.*

**مۆدە** (ن.) ئەگەر شتێك مۆدە بوو، زۆر کەس پێیان باش‌و جوان دەبێت. بۆ وێنە هێندێك جۆرە جل‌وبەرگ‌و رەنگو..، بەڵام دوای ماوەیەك شتێکی نوێ شوێنی ئەوە دەگرێتەوەو ئەو شتە تازەیە دەبێت بە مۆدە.

**مۆڵــــەت** (ن.) مــاوە، دەســتویر، ڕێ پێدان، روخسـەت: *مامۆستا بۆ دوو رۆژان مۆڵەتی وەرگرتووە.*

**مۆڵەتــدان** (چ.) ئیــزن دان، رێپێـدان: *مۆڵـەتی مـن تـەواو بـوو. مـن داوای ٣ رۆژ مۆڵەت دەکەم.*

مۆم

**مــۆم** (ن.) شـەمالك، شـەمێکی خـڕەو داوە دەزوویەکی لـە نێوەڕاسـتدا هەیە، هەر کە ئاگرت لـە داوەکـە دا مۆمەکــــە دەســــووتێت‌و رووناکیت پێ دەبەخشێت.

**میانە** (ئاك.) ناقبەر، ناو، ناو قەد.

میترۆ

**میترۆ** (ن.) جۆرە شەمەندەفەرێکە، کە بۆ رێگەوبانی ژێر زەوی بەکاردێت، هەروەکو لە شارانی گەورەی وەك لەندەن، مۆسکۆ، ئەمستردام‌و.....*هەیە.*

**مــیر** (ئان.) ســەرۆك، ســەردار، پاشـا، پادشا.

**میراتگری** (ن.) ماڵی بەجێماو، حـوکمی بـەجێماو: *پاشـایەتی حوکمـەکی میراتگرییە لـە باوکـەوە بۆ کـوڕ بەجێدەمێنێت.*

**میزڵـــــدان** (ن.) ١- ئەنــــدامێکی کۆئەنــــدامی میزکردنــــە: ئــــاو

خواردنـــەوە بـــۆ دروســـتی گورچـیلەو میزڵـدان باشـە. ٢- دەبدەبـە، میـزەڵان، پفـدانك، یارییەکـە لـە نـایلۆنی زۆر تـەنك دروسـتدەکرێتو منـداڵ فـووی تێـدەکات: میزڵـدان لـە هـۆڵی ئاهەنگەکانـــدا وەك جوانکـــاری بەکاردەهێنرێت.

**میلی بەردین**(ن.) بەردەکی درێژکۆڵەیە بەخـــەتی بزمـــاری لەســـەری نووسراوە کاروباری خـەڵکی پـێ ڕێکـدەخرا: *میلـی بـەردین لـە برادۆست هەیە.*

مین

**مین** (ن.) لوغم، لە کاتی دەستلێدان یا پـێ لەسـەردانان دەتەقێتـەوەو کەسەکە دووچاری لە نێوچوونی خۆی یا دەستێکی یا پێیـەکی دەکات.

**مینـاك** (ئـان.) وەك یـەك، هاوتـا: *ئـەم دوو ئۆتۆمبێلە میناکی یەکن.*

**میوان** (ن.) مێڤان، مێوان: *هاوسێکەمان ماڵەکی بە میوانن.*

**میوەگـۆش** (ن.) خۆشـاڤ، ئاڤـا فێقـی: *زڤستانێ دەیکا مـن میوەگۆش بۆمە چێکر.*

**میوزیـك** (ن.) ١- مۆسـیقا، هونـەری مۆسیقا: *میوزیکی کوردی بـەرەو پـێش چـووە.* ٢- ئـامێری مۆسـیقا: *کـەمان میوزیکـەکی دەنگ خۆشە.*

**مـێ** (ن.) ڕەگـەزی مـێ لـە هەرشـتەك وەك: *کچ ڕەگەزی مێیە.*

**مـێخ** (ن.) سـنگ، قیسـپ، بزمـار: *وێنەکەی بە مێخەکەوە بە دیوار هەڵواسی.*

**مێخەك**(ن.) بڕوانە: قەرەنفول.

**مێخۆش** (ئان.) هەر خۆراك یـان میـوە، یـا سـەوزە لـە ڕووی تامـەوە ترشو شـیرین بێـت، پێیـدەڵێن:

مێخۆش: *دوو کیلۆ مەناری مێخۆشم کڕی.*

**مێرمندال** (ناو.) نەوجەوان، لاو، سنێڵ، هەرزەکار: *ئەو مێرد منداڵە زۆر بزێوە.*

**مێرك** (ن.) پیاو: *جلکێن ژنك و مێرکێن کوردان گەلەك جوانن.*

**مێرگ** (ن.) چیمەن، گیا جاڕ، ئەو شوێنەی زۆربەی ئاوە، کە گیاو گوڵ دایدەپۆشێ: *دەبا بۆ سەیران بچینە ناو ئەو مێرگانەی ئەوبەر.*

**میرنشین** (ن.) ئەو ناوچەیەی کە میر بەڕێوەی دەبات: *حوکمی میرنشینی سۆران لە سەردەمی میر محەمەد زۆر فراوان بوو.*

**مێروو** (ن.) مێروی، مێرووستان، مێری، مێروولە، مێرولە: *مێروو گیانەوەرەکی بێ بڕبڕەیە.*

**مێز** (ن.) تەختەی بە پێچکە بۆ شت لەسەر دانان: *من مێزەك بۆ نفیسێن کڕی.*

**مێژوو** (ن.) دیرۆك، زانستی رابوردووی مرۆڤ نییە، بەڵکو زانستی پەرەسەندنی مرۆڤە بە درێژایی رۆژگارو بێپسانەوە، مێژوو رابردوو بە ئێستاوە دەبەستێت و تاکو لە ئایندەدا سوودی لێ وەربگرێت.

**مێژوونفیس** (ن.) دیرۆك نفیس، مێژوونووس، دیرۆکنووس: *شەرەفخانێ بەدلیسی مێژوونفیسێکی کوردە.*

**مێژوویی** (ئاو.) دیرۆکی، دێرین، کۆن: *کورد خاوەنی شارستانیەتەکی مێژووییە.*

**مێش و مەگەز** (ن.) مێش، پێشیك، پێشکە، مێشوولە، پەخشە: *مێش و مەگەز هۆکاری گواستنەوەی نەخۆشین.*

مێو

**مێو** (ن.) داری ترێ، ڕەزی مێو لە دامێنی چیا زۆرە: د ناڤ رەزێ مەدا مێوێن ترێ زۆرن.

**مێوژ**(ن.) ترێی وشککراوە: حەزلە شەربەتی مێوژدەکەم.

**نابەڵەد** (ئان.) نە شارەزا: کە چوویتە *شارەکو نابەڵەد بووی دەبێت لە خەڵک بپرسی تا رێنماییت بکەن.*

**ناپەسەند** (ئان.) لەبەردڵاننەبوون، قابیل نەبوون، بێ رێز: *درۆکردن کارەکی ناپەسندە.*

**ناچار** (ئان.) مەجبور، کەسەك دەسەڵاتی کاری بە خۆی نەبێ: *نەمتوانی بەرێ بکەوم بۆیە ناچارم لێرە بمێنمەوە.*

**ناحەز** (ئان.) نەیار، دوژمن، رەقیب، نەحەز: *تا بۆت دەکرێت مەمێڵە ناحەز سوودت لێوەربگرێت.*

**ناخ** (ن.) کانگا، کاکڵ، ناوەوەی هەر شتێ، ناوەرۆك: *لەناخی دڵمەوە تۆم خۆش دەوێت.*

**ناخی زەوی** (ن.) ناو جەرگەی زەوی: *نەوت لەناخی زەویدا دەردەهێنرێت.*

**ناردن** (چ.) هنارتن، فڕێکرن، رەوانەکردن، بەڕێکردن: *بەبۆنەی جەژنەوە کارتی پیرۆزباییم بۆ برادەرەکانم نارد.*

**ناردنەوە** (چ.) گەڕاندنەوە، فڕێکرنەڤە، بەڕێکردنەوە، رەوانەکردنەوە،

هنارتنەڤــە: *کتێبەکــەم بــۆ نارد ەوە.*

**نارەحــەت** (ئــان.) جــاڕز، نائاســوودە: *ئــازاد بــە نەخۆشــی دایکــی نارەحەتە.*

**نارێــك** (ئــان.) رێــك نــەخراو، بــێ سەروبەر، ناشیرین: *کاری نارێك لە مرۆڤی بەڕێز ناوەشێتەوە.*

**نازدار** (ئان.) ١– بەناز، نازك، جوان، دەلال، ژیکەڵە، رێکوپێك: *شیرین کچەکا گەلەکا نازدارو دەلالە.*
٢– ناوە بۆ مێینە.

**ناسراو** (ئان.) دیار، بەناوبانگ، ناودار، نیاس، بەرنیاس.

**ناسنامە** (ن.) پێناسە، پێناس: *زمان یەکەکە لە خاڵەکانی ناسنامەی هەر نەتەوەیەك.*

**ناســین** (چ.) ناسکرن، ئاشــنابوون: *کوردستان ب بەرخۆدانێ هاتیە ناسین.*

**ناسینەوە** (چ.) ناسکردن، ناسینەڤە، شــتەك پــاش ماوەیــەکی زۆر بیناسییەوە: *هــەرکــە چــاوم پێکەوت ناسیمەوە..*

**ناڤ** (ن.) ١– ناو: *ناڤێ تە چییە؟* ٢– دوو، نــاو: *کاغەزەکــەم لــەناو کتێبەکە دانابوو.*

**ناڤنجی** (ئان.) ناوەندی، ناوەڕاست: *ئەڤە قوتابخانەیەکا ناڤنجییە.*

**نامە** (ن.) پــەیام، کاغــەز نووســین بۆ کەســەك: *هەمیشــە نامــەم بــۆ دەنووســین‌و هــەواڵی خــۆمم بــۆ باسدەکردن.*

**نــان** (ن.) ئــاردی بــە ئــاو شــێلدراوی پــانکراوەی بــە ئــاگر بــرژاو وەك نــانی ســاج، نــانی تــیری‌و نــانی تەندوور: *من هەموو خواردنێك بە نان دەخۆم.*

**نانــەوا** (ن.) نانپێــژ، نانکــەر: *نــانی دەســتی ئــەم نانەوایــە پــاك‌و خۆشە.*

**نانبڕ** (ئان.) کەسەك کە نان‌و رزقی کەســەکی دی دەبڕێ: *پێویستە نەبیتە نان بڕی خەڵکی.*

**نان پێژان** (چ.) نان کردن، نان پەحتن، نان پێژتن: *لە کاتی نان پێژاندا دایکم ناسکە نانێکی بۆ کردم.*

**ناوەڕۆک** (ن.) ناواخن، ناوەوە، ناوشت، کرۆکی شت، کاکڵ: *ناوەڕۆکی کتێبەکە لە سێ بەش پێکهاتووە.*

**ناوەند** (ئان) ناڤەند، ناوەڕاست، ناڤەنجی، ناو: *قوتابخانەکەمان دەکەوێتە ناوەندی شارەوە.*

**ناوچە** (ن) دەڤەر: *ناوچەکەمان بە گوێزو هەرمێ بەناوبانگە.*

**ناودار** (ئان.) بەناوبانگ، ناسراو، دیار: *هەرکەسێکی بەرهەمی بیری هەبێت و سوود بەخشبێت، ناودار دەبێت.*

**ناوشار** (ن.) ناڤبازێڕ، ناوبازاڕ: *لەناو شار تاکسی زۆرەو زوو دەست دەکەوێت.*

**ناولێنان** (چ.) بەناوکردن، ناڤ لێنان: *ناولێنانی منداڵ بیرکردنەوەی دەوێ.*

**ناونووس کردن** (چ.) ناوخستنە دەفتەر، ناونووسین، ئامار: *هەڵمەتی ناونووسکردنی خەڵکی بۆ هەڵبژاردنی داماتوو بەردەوامە.*

**ناهەموار** (ئان.) نا بەجێ، نا ڕێک، نالەبار، دژوار: *لە بارودۆخی ناهەمواردا خوێندنم تەواوکرد.*

**نایاب** (ئان.) زۆر باش، بە تام، جوان، دانسقە، هەرە باش، گەلەك باش، باشترین: *شەربەتی مێوژی خۆشناوەتی نایابە.*

**نەبا** (ئاك.) نەوەکو ، نەکو، نەبوایە، نەبادا، مەبادا: *چاوەڕێم مەکە نەبا نێم.*

**نەبەرد** (ئان.) ئازا، دلێر، جوامێر، بوێر: *هەر سەربازێك پێویستە نەبەرد بێت.*

**نەبەردی** (ن .) ئازایەتی، جوامێری، نەبەزی، دلێری، بوێری، نەترسی: *پێشمەرگەکانی کوردستان لە هەڵمەتەکانیان نەبەردیێکی چاکیان دەنواند.*

**نەتەوە** (ن) قەوم، میللەت، گەل، کۆمەڵە خەڵکەك کە یەك رەگەزو فەرهەنگو زمانو خاکیان هەبێت: *نەتەوەی کورد سەر بۆ کەس دانانەوێنێت.*

**نەتەوەیی** (ئان..) نەتەوایەتی، شتەك کە هی نەتەوەیەك بێت: *نەورۆز جەژنەکی نەتەوەییە.*

**نەخاسمە** (ئاك.) بەتایبەتی، نەمازە: *باران گەلەك باری نەخاسمە ل سەر چیای.*

**نەختێك** (ئاك.) کەمێك، هەندێك، برێك، پیچەك، تۆزێك: *لە دەرەوەی شار نەختێك هەوای پاکم هەڵمژی.*

نەخشە

**نەخشە** (ن.) ١- خەریتە ، وێنەی وڵاتو سەر زەمین لەسەر کاغەزدا: *نەخشەی هەرێمی کوردستانم لە ژوورەکەم هەڵواسیوە.* ٢- پلان، رەنگرێژی: *پێویستە هەموو وەزارەتێك نەخشەی تایبەتی خۆی هەبێت.*

**نەخۆش** (ئان.) نەساخ، ناتەندروست، خەستە: *نەخۆش دەبێت چارەسەر بکرێت.*

**نەخۆشی** (ن.) نەساغی، نا ساخلەمی: *گرانەتا نەخۆشییەکی کوشندەیە.*

**نەداری** (ن.) هەژاری، دەستتەنگی، نەبوونی، دەستکورتی: *نەداری دەردەکی گرانە پێویستە نەمێلدرێ.*

**نەریت** (ن) عادەت، شتی باو، ئاکار: *میوانداری نەریتی کۆنی کوردە.*

**نەسرین** (ن.) ١- ناوی جۆرە گوڵەکی بۆن خۆشە: *لە بەهارا گوڵە نەسرین زۆرە.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**نەشتەر** (ن.) شفرەی دەستی نەشتەرگەر، ئەو تیغەی دکتۆر

نەشـــــتەرگەری پێـــــدەکا: *پزیشکەکە داوای نەشتەرگەری کرد.*

**نەشــتەرگەری** (ن.) عەمـەلیات، ئەگـەر یـەکێك دووچـاری ژانـی ریخۆڵـە کــوێرە بــوو، بــە دەرمــان چــاکنەبوو، دکتــۆر ناچــارە نەشتەرگەری بۆ بکات.

**نەغمــە** (ن.) ئـاواز: نەغمـەی بولبـول خۆشە.

**نەفتخانــە** (ن.) کانـەکی نەوتییـە لـە خانەقین.

**نــەفرەت** (ن.) نـەفرین، نفـرین، تـووك، نەعلـەت، لەعنـەت: *نـەفرەت لـە شەڕ، بەڵێ بۆ ئاشتی.*

**نــەڤی** (ن.) نــەوە، نــەوی، وەچــە: *باپیرێن کوردان پەندێن باش بۆ نەڤیێن خۆ مێلانە.*

**نەکـەل** (ئـاك.) خـاڤ، نـەکوڵاو، خـاو: *خوارنا نەکەلی یا خۆش نینە.*

**نەمازە** (ئاك.) بڕوانە: **نەخاسمە**

**نەمر** (ئان.) زیندوو، لەناو دڵـی خـەڵك: *شـەهیدانمان نـەمرن لـەناو دڵـی خەڵکدا.*

**نـــەوا** (ن.) دەنگوئـــاواز: دەنـــگو *نەوایەکی خۆشی هەیە.*

**نەوت** (ن.) شلەیەکی خەستی زۆر بە نرخــەو لــە ژێــر خاکــدا دەردەهێنرێــت :*کوردســتان چەند کێڵگە نەوتەکی بەناوبانگی تێدایە.*

**نەوچــەوان** (ن.) نێوچـەوان، ئـەنی، تەوێڵ: *ئاسۆ کوڕەکی نەوچەوان پاکە.*

نەورۆز

**نەورۆز** (ن.) ڕۆژی نوێ، نەڤرۆز، یەکەم ڕۆژی ســەری ســاڵی کــوردی، جەژنی نەتەوەیی کـورد، یەکـەم ڕۆژی بەهار.

**نەوشــکۆفە** (ئـان.) تـازە پشـکووتوو، نوی پشکفتی، تازە خونچە: *تۆ*

*مەنــدە جــوانی نەوشــکوفەی کوردستانی.*

**نــەهاڵ** (ن.) دۆل، نهــال: *زڤـسـتـانێ نەهال پڕی ئاڤ دبن.*

**نــەهێلان** (چ.) نەهێشـتن، لێنەگـەڕان: *نــــەهێلانا نەخوینـــــدەوارییێ ئەرکەکێ پیرۆزە.*

**نــەهێنی** (ن.) نهێنـــی، پەنامـــەکی، پەنهانی، شاراوە، بەدزییـەوە، ، بـدزی. شـتێکە یـان باسـێکە ناتەوێت لای کەس باسی بکەیت: *ئازاد نەهێنی بپارێزە.*

**نــەیار** (ن.) ناحـەز، دوژمـن: *مـرن بـۆ نەیارێ مەیە.*

**نــرخ** (ن.) بهـا، بـەها، قیمـەت: *نرخـی کالاو کەلوپەل بەرزبۆتەوە.*

**نزیك** (ئـان.) دژی دوور، نێزیـك: *دوور مەڕۆ لە نزیکم دانیشە.*

**نژدار** (ئان.) نۆژدار، پزیشـکی برینـان: *مـن دڤێـت ل پاشـەڕۆژێ ببمـە نوژدار.*

**نژیار** (ن.) بـەرد خسـتنە سـەریەك بـە مەبەسـتی خـانوو دروسـتکردن، ئـاوەدانکردن: *ئـەڤ گونـدە هاتـە نژیار کردن.*

**نســـکۆ** (ئـــان.) شکســـت، هـــەرەس، هەڵـەنگوتن، هـەلنگڤتن: *ئەگـەر شۆڕشـی کـورد نسـکۆی مێنـابێ زوو هەڵساوەتەوە.*

**نڤستن** (چ.) خـەوتن، نوسـتن: *مـاڤینێ ئەم هەمی ل سەر بانی نڤیستن.*

**نڤێژ** (ن.) نوێـژ: *نڤێـژکرن پەرستنەکا کەڤنە.*

**نقێم** (ن.) نقیم، قاش، جۆرە بـەردێکی بـە نرخـە بـۆ جـوانی دەخرێتـە ئەنگوسـتیلەو گـوارەو شـتی تـرەوە: *نقێمـەکی سـەوزم بـۆ ئەنگوستیلەکە هەڵبژارد.*

**نموونـــە** (ن.) یـەك لـە چـەند شـت: *قوتابییەکـە نموونـەی پـاك و خاوێنیە.*

**نوشـتانەوە** (چ) چـەمیان، چـەمانەوە، داهاتنەوە، قـەدبوون: *ئەگـەر لـە بـن دارێکـی بـە پـەلك و پـۆپ تێپەڕی خۆت دەنوشتێنیەوە.*

**نوشــــتاندنەوە** (چ.) ئەشــــكاندن، وەرپێچـــان، چـــەماندنەوە، قــــەدكردن: *نووســـــراوەكەم نوشتاندەوە جا لە نێو زەرفم دانا.*

**نوقومبـــوون** (چ.) بنئـاڤبوون، نغـرۆ بـوون، بـن ئـاو كـەوتن، ژێـر ئـاو بـوون: *هـەر كەسێكی مەلـەوانی بـاش بزانێـت لـە نێـو زەریـاش نوقومنابێت.*

**نـــوێ** (ئـان.) نـوی، زوو، تـــازە: جلوبەرگێكی نوێم بۆ قوتابخانە كڕیوە.

**نوێخـواز** (ئـان.) تـازە خـواز، ڕێبـازی نـوێگر: *پێویسـتە لاوان نوێخـواز بن و دوور بن لە كۆنە پەرستی.*

**نـــوێن** (ن.) كەلوپـەلی خـەو، نڤـین، پێخـــــەف: *زوو زوو بــــەرگی نوێنەكانت بشۆ.*

**نووســــەر** (ئـان.) بیڤـار، نووسـیار، نڤیسەر، ئەوەی كاری نووسـینە: بـــاوكم ئەنـــدامی یــــەكێتی نووسەرانی كوردە.

**نوســـتن** (چ.) خـــەوتن، نڤســـتن: *زوو نوسـتن و زوو هەڵسـان پیشـەی قوتابی چالاكە.*

**نووســــــینگە** (ن.) نڤیســــینگەه: *خانووەكەم بەڕێی نووسینگە بە كرێ گرتووە.*

**نۆبەرە** (ن.) ١– یەكەم منداڵ، نەخری، منـداڵی یەكـەم: *منـداڵی نۆبـەرە خۆشەویستە.* ٢– خێڤە، میوەی تازە پێگەیشتوو، بەری یەكـەمی دار، نوخشە.

**نۆرە** (ن.) نۆبـەت، نۆبـە، سـرە، كـەڕ، جـار، دەسـت، كـەڕەت: *نـۆرەی تۆیە زووكە ڕاكە.*

**نۆردی** (ن.) نۆردو، نـوردی، وەرپێچـك، ڕانوشتە، نانەكە بـە نـەرمی وەك بوخچـە چـوار قـەد كرابـێ: *دایـە گیـان چەند نۆردییە نانـەكم بۆ بكە، چونكە ڕێگایەكی دوورم لـە پێشە.*

**نۆك** (ن.) جۆرە دانەوێڵەیەكـە: *نـۆكێن دەڤەرا شنگالێ د كەلەكن.*

**نهۆم** (ن.) هەر خانوویەکی یەك قات بێت، یەك نهۆمی پێدەڵێن. بە ڕێگەی پێپلیکانێ دەتوانیت بچیتە نهۆمی دووەم.

**نهێنی** (ئان.) بڕوانە نەهێنی.

**نیاندرتال** (ن.) یەکێکە لە گروپە هەمە جۆرەکانی ئادەمزاد، کە پێش سەد هەزار ساڵ لەسەر ڕووی ئەرد ژیاوە. لە کوردستان لە ئەشکەوتی شانەدەر ساڵانی ١٩٥٧-١٩٦٠ لەلایەن پسپۆڕی ئەمریکی سۆلکی شوێنەواری ئەم تیپە مرۆڤە دۆزراوەتەوە.

**نیزە** (ن.) نێزە، سنگی، سندی، جۆرە تیغەکە هێندێ جار بە سەری تفەنگەوە دەکرێ: *سەربازەکان گوللەیان پێ نەما ناچاربوون بە نێزە شەڕ بکەن.*

**نیسك** (ن.) جۆرە دانەوێڵەیەکی خڕە: *نیسك بۆ تەندروستی باشە.*

**نیشان** (ن.) ١- هێما، ئامارە، ئامانج، جەفەنگ: *ئەڤرێ ڕەش و تاری نیشانا بارێیە.* ٢- نیشانەی مارە بڕان و دەستگیرانەتی.

**نیشانە** (ن.) بڕوانە: **نیشان**.

**نیشتەجێ** (ئان.) ئاکنجی، دانیشتوو: *ئێمە نیشتەجێی ئەوگوندەین، کە لێی لە دایکبووین.*

**نیشتمان** (ن.) ولات، وەلات، زێد، خاك: *کوردستان نیشتمانێ مە کوردانە.*

**نیشتن** (چ.) ١- دانیشتن، ڕوینشتن، ڕینشتن: *لەتەك من دانیشە.* ٢- کاتەك خڵتە لە ئاودا دەکەوێتە بنەوە: *کە خڵتەکە نیشت ئاوەکە بخۆنەوە.* ٣- کەم بوونەوەی لافاو یان ئاوی زۆر: *لافاوەکە نیشتەوە.*

**نیمچە دوورگە** (ن.) زەوییەك دوو لا یان سێ لای ئاو بێت.

**نیوە** (ن.) لەتەك لە دوو لەت، نیمە، نیڤ: *نانەکەی کردە نیوە.*

**نیوەڕۆ** (ئان.) نیڤرۆ، نیوەی ڕۆژ: *کۆبوونەوەکە لە کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ تەواو بوو.*

**نینــۆك** (ن.) نینـك، نـاخۆن: *وا باشـه بەردەوام نینۆکەکانت بکەی.*

**نێر** (ئان.) رەگـەزی نێـر لەهـەر شـتێك وەکو کوڕ، کە نەوەی مرۆڤە.

**نێچـیر** (ن.) ئـەوەی لـەکاتی راوکردنـدا دەگـیرێ: گیانـەوەری گـیراو، قوربـانی: *ئـەو بـێ نێچـیر نەهاتۆتەوە.*

**نێچیروان** (ئان.) ١- راوچی، نێچیرڤان، راوکـەر: *بـاوکی وشـیار نێچـیروانەکی بەناوبانگـە.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**نێرگـز** (ن.) نێـرگس، جـۆرە گـوڵێکی جوانو بۆن خۆشەو بەهاران زۆر دەبێت.

**نێـوان** (ئـاك.) ١- مابـەین، ناڤبـەر: *پێشـبڕکێ لـەنێوان دوو تیـپ ئەنجامدرا.* ٢- ماوە بۆ دووری: *دووری نێـوان هـەولێرو کۆیـە نزیکەی ٦٥ کیلۆ مەترە.*

**هات** (ئان.) بە پیت، بە بەرەکەت، بە بەروبووم: *ئەم ساڵ ساڵەکی هات و خۆش بوو.*

**هـاتن** (چ.) گەیشـتن لـە ڕێـوە: *هاتنا هەوە جهێ دلخۆشییا مەیە.*

**هاتنـــەخوار** (چ.) ١- دابـەزین لـە بەرزاییـەوە، شـۆڕ بوونـەوە: *بەدڵی خۆش و پـڕ کەیفـەوە لـە شـاخەکە هاتینـە خـوارەوە.* ٢- داشکانی نرخ: *نرخی هەنـدێك لـە کاڵاکان هاتووەتە خوارەوە.*

**هاتنە دانان** (چ.) دامەزراندن: *ئەمساڵ زانکۆیەکی نوێ هاتە دانان.*

**هاتنـــە ڕێ** (ن.) هاتنـە پـێش: *ئـەم کێشـەیەم لـە ڕێگـادا هاتـە ڕێ، ئەگەر نا زووتر دەگەیشتم.*

**هاتوچۆ** (ن.) ١- هاموشۆ، ئاموشۆ، کەین و بەین، هـاتن و چـوون: *ئـەم هاتوچـۆیەی ئـەوان جێگـای سەرسـوڕمانە.* ٢- گـەڕان ، سەفەر کردن، پیاسـە: *هـەردەم لە هاتوچۆدایە.*

**هار** (ئان.) وشـەی هـار زێـتر بـۆ سـەگ بـەکاردێت، بـەڵام سـەگێك زیانبەخشـبێت و میکرۆبـی نەخۆشی هاری لە لیکیدا بێـت و

قەپ لەمو لەو بگرێت. زۆرجار بە کەسی شەڕفرۆشیش دەڵێن هار بووە.

هارپ

**هارپ** (ن.) قیسارە، ئامێرێکی مۆسیقایە: *کۆرسەکەی ئێمە هارپ ژەنی تێدایە.*

**هاریکار** (ئان.) هاوکار: *دیّ بۆتە بمە هاریکارەکی باش.*

**هاریکاری** (ن.) هاوکاری، هەڤکاری، کۆمەك، هەرەوەز، زبارە: *ئەز هەمی گاڤا دکارم هاریکاریا تە بکەم.*

**هاریکاریکردن** (چ.) فریا کەوتن، بەتەنگەوە هاتن، یارمەتیدان: *هاریکاریکردنی یەکتری کارەکی باشە.*

**هاژە** (ن.) ١- دەنگی ئاو و دارو بار لەبەر با: *رووبارەکە هاژەی دەهات.* ٢- ناوە بۆ مێینە.

**هاژووتن** (چ.) هاژۆتن، ئاژووتن، لێخوڕین: *هاژووتنی ئۆتۆمبێل بەخێرایی ترسناکە.*

**هاڕاو** (ئان.) هاڕدراو، وردکراو، هێڕای، لە ئاشکراو، پێچەوانەی درشت: *هاڕاوەی دار تەختەی لیّ دروست دەکرێت.*

**هاڕە** (ئان.) دەنگی بەرز، نەڕە، نەعرەتە: *ئاشەکە زۆر هاڕەی دێت.*

**هاڕە هاڕ** (ن.) گوڕەگوڕ، هاتوهۆریا، ژاوەژاو، دەنگەدەنگ: *لەبەر هاڕەهاڕی مەکینەکە گوێمان لە هیچ نییە.*

**هاڕین** (چ.) هێڕان، هاڕدن، وردکردن: *باراشەکەم هاڕی.*

**هاڤەڵکار** (ن.) ١- هەڤالکار، هاوەڵکار: *زانا هاڤەڵکاریّ منە.*

٢- ئاوەلکـــار: بەشـــێکە لـــە بەشـــەکانی ئاخـاوتن، لـە نێـو رستەدا وەسفی روودانی کار لە رووی کـات، شـوێن‌و چـۆنیەتی دەکات: *ئازاد خێرا دەڕوات.* لـەم رســـتەیەدا خێـرا هاڤـەلکارەو وەسفی دەڕوات دەکات.

**هاڤلنــاڤ** (ن.) هــەڤالناڤ، هاوەڵنــاو، ئاوەڵنـاو: ئـەو وشـەیە وەسـفی نــاو دەکــات، وەك: جـــوان، شـــیرین، بـــەزر، بـــەهێز.....: *مـەڤالناڤی د کوردیـدا سـێ پلـە هەنـە، وەکـی جـوان، جـوانتر، جوانترین.*

**هاڤلی** (ئاك.) پەیوەندی: *هاڤلییا منو قوتابیان یا خۆشە.*

**هـــاڤین** (ن.) هـــاوین: *ل هاڤینـــێ شارەکەمان گەرم دبیت.*

**هاڤێـژتن** (چ.) هاوێـژتن، هاوێشـتن، فڕێدان، هەڵدان: *دەمـا کـو وی تەپەکـە بـۆ مـن هاڤێـژتی ئـەز شیام بگرمەڤە.*

**هال** (ن.) ١- نـەمام، شـتل: *مـن هـالی دەچێنم* ٢- درم، پـەتا، پـەژیك، ئـازار: *هـالی ئـەنفلۆنزای باڵنـدە پەیدا بووە.*

**هاموشۆ**(ن.) بڕوانە: هاتوچۆ.

**هانــە هـــان** (ن.) هانکـەهانك، دەنگـی ماندوو بوون: *کە بەسـەر چیاکە کەوتین ئازاد هانە هانی دەهات.*

**هانـــدان** (چ.) دنـەدان، دەســـت لـــە پشـتدان: *هانـدانی دایـك‌و باوکم نەبووایـە، خوێنـدنم پـێ تـەواو نەدەکرا.*

**هـــاوار** (ن.) ١- قیــژە، زریکــە، دادو فیغان: *هاواری ئێوەی کرد تا بە هانای بچن.* ٢- ئاوە بۆ نێرینە.

**هاوار بردن** (چ.) هانـا بـردن، هـاوار بـۆ هێنـان، پـەنا بردنـە بـەر: *لـە تەنگاویـدا هـاواری بردۆتـە بـەر کەس‌وکاری.*

**هاوبەش** (ئان.) ١- شـەریك، بەشدار، هـــەمان بـــەش، هـــاو پشـــك، هەڤپشك، وەك یەك: *منو تۆ لەم*

*خانووە هاوبەشین.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**هاوبەشی** (ن.) شەریکایەتی، بەشداری، هاوپشکی، وەك یەکی: *هاوبەشی زۆرجار کار ئاسان دەکات.*

**هاوبیر** (ئان.) کەسەك هەمان بیروڕای کەسەکی دیکەی هەبێ: *منو تۆ هاوبیرین.*

**هاوپشت** (ئان.) لە یەك بەرەباب، ئێك بەرەباب، بەرەی باوکەك، خزمی خوێن: *ئەو خزمی هاوپشتمە.*

**هاوپۆل** (ئان.) لە یەك پۆل، هاو ڕێز، لە هەمان پۆل: *سەیرانو دیلان هاوپۆلن.*

**هاوپیشە** (ئان.) هاوکار، هەمان پیشەیان هەبێت: *ئازادو نەوزاد هاوپیشەن.*

**هاوتا** (ئان.) هاوشان، هەڤ بەڤل، هامتا، هاوکووف، هەڤ کیف، لە پایەو لەشانی ئەو: *ئەوان هاوتای یەکترن.*

**هاوتەمەن** (ئان.) وەرداشە، هەمان تەمەنیان هەیە، هاوزێ، هاوزا: *زۆربەی قوتابییەکانی ئەم پۆلە هاوتەمەنن.*

**هاوچەرخ** (ئان.) سەردەم، هەڤچەرخ، ڕۆژگار: *مامۆستاکەمان لە مێژووی هاوچەرخدا شارەزاییەکی باشی هەیە.*

**هاودەم** (ئاك.) ١- هاوکات، هەڤ دەم: *ماتنی ئەو لەگەڵ هاتنی منداڵ هاودەم بوو.* ٢- ئالوودە: *ئازادو سالار هاودەمی یەکترن.*

**هاوڕێ** (ن.) ١- برادەر، هەڤاڵ، کەسەك لە ڕێگەدا لەگەڵت بێت: *هاوڕێی چاك بۆ خۆت هەڵبژێرە.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**هاوڕێك** (ئان.) هاوتەریب، بە تەنیشت یەك: *هەندەك جۆری بەستنی کارەبا هاوڕێکە.*

**هاوسەر** (ن.) ١- ژنو مێرد، هەڤگیان، هەڤسەر، هەڤژین، هاوژین: *ئازادو پەری هاوسەری یەکترن.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**هاوسەنگ**(ئان.) هەڤسەنگ، وەك یەك: پێویستە هاوسەنگی مێزەکان هەر بمێنن .

**هاوسێ**(ن.) هەڤسێ، دراوسێ: *شیرین هاوسێی ئێمەیە.*

**هاوکوف**(ن.) وەك یەك، هەڤ کویف، بەرامبەر یەکتر، هاوسەنگ: *مێزەکانمان هاوکوفی یەکتری نین.*

**هاونیشتمانی**(ن.) هاوولاتی، هاوزێدی، هەڤ وەلاتی، خەلکی یەك ولات.

**هاو واتا** (ن.) هەڤواتا، دوو وشەی وەکو یەك لە واتا: *ئەڤان هاوواتایان ژبەریکە.*

**هاوینە** (ئان.) شیناوەری هاوینە، هاڤینی: *گنۆرە بەرووبوومی هاوینەیە.*

**هاوینەهەوار**(ن.) هاڤینگەه، هاوینگە، زۆزان: *لە هاویندا بۆ رابواردن دەچینە هاوینەهەواری پیرەم.*

**هاوینی** (ن.) هەر شتەك کە سیفەتی وەرزی هاوینەی پێوەبێ: *جلوبەرگی هاوینیم زۆرە.*

**هاوێنە**(ن.) بڕوانە ئاوێنە.

**هاوێنەی پەرت**(ن.) چاڤکا خویل، جۆرە ئاوێنەیەکە.

**هاوێنەی قۆقز**(ن.) چاڤکا کوور، ئاوێنەی قۆقز.

**هایدرۆجین**(ن.) گازەکی هەواییە: *ئاو لە هایدرۆجین و ئۆکسجین پێکهاتووە.*

**هەبوون**(چ.) ١– دژی نەبوون: *مێهڤان هەبوون لەوا ئەم نیار نەبووین.* ٢– بوون، زەنگین، دەوڵەمەند، ساماندار: *مالی مام پیرۆت هەبوونن.*

**هەتا**(ئام.) ١– هەتاکو، تا: هەتا باش نەخوێنیت نمرەی چاك ناهێنی. ٢– ماوە، نێوان: *دەتوانم هەتا مالتان بێم کارم پێتە؟*

**هەتاڤ**(ن.) هەتاو، خۆرەتاو، تاو: *مالا مە بەر هەتاڤە.*

**هەتا هەتایێ** (ئاك.) هەروەهەر: *ئالاّیێ مە هەتا هەتایێ بلند دبیت.*

**هەتوان** (ن.) مەڵحەم، مەرهەم: *هەتوانەکی باشە، برینەکەی زوو چارەسەرکرد.*

**هەتیو** (ئان.) هەتیم، باوك مردوو، دایكو باوك مردوو: *فەرمانگەیەکی تایبەت بۆ بەخێوکردنی هەتیوان مەیە.* بروانە: سێوی.

**هەر** (ئام.) ١- تەنیا: هەر خۆت وەرە. ٢- بۆ دڵنیا بوون، مسۆگەر: هەر دێم. ٣- ئەگەر، هەر کە: *هەر ببینم دەیناسمەوە.* ٤- یەك: *هەر یەك لە ئێوە بەیانی باوکی دەبێ بێتە قوتابخانە.*

**هەرا** (ن.) پشێوی، گۆبەند. غەڵبەغەڵب، بەزم، هاتو هاوار: *کێ هۆکاری ئەم هەرایە بوو؟*

**هەراسان** (ن.) وەڕزی، بێزاری: *ئەم بێکارییە هەراسانم دەکا.*

**هەراسانکردن** (چ) تێکدان، بێزارکردن، وەڕزکردن: *هەراسانکردنی دراوسێ کارێکی نا شارستانییە.*

**هەراش** (ئان.) پێگەیشتوو، بە گەشە، بە منداڵێك دەگوترێت، کە لە راپەڕاندنی کاروباریدا ئەوەند پێویستی بە یارمەتیدانی دایکوباوکی نییە، بۆیە دەڵێن منداڵەکە لە خەم رەخسیوە، هەراش بووەو پێگەییوە.

**هەراشان** (ئان.) نێوی ئەو فەرهەنگەی بەردەستتانە نێوەکە لە هەراش + ان/ نیشانەی کۆ دارێژراوە.

**هەرەس** (ن.) ١- ڕووخان، درز بردن، داڕووخان، هاتنەخوار: *هەرەسی بەفرەکە زیانی پێوە بوو.* ٢- شکست خواردن، بە هیچ نەگەیشتن: *دانوستاندنەکە هەرەسی هێنا.*

**هەرەوەزی** (ئان.) زیارە، هاریکاری، ئالیکاری، گەلکاری: *هەرەوەزی لە کاروباری لادێ بەدی دەکرێ.*

**هەرچەند** (ئام.) گەرچی، ئەگەر چی، لەگەڵ ئەوەی: *هەرچەند ئازاد زیرەك بوو، بەڵام نمرەکانی بەرز نەبوون.*

**هەردەم** (ئاك.) هەرکات، هەموو دەم، هەمی گاڤ، هەموو کات، هەمیشە: *هەردەم گەلەکەم لە یادە.*

**هەرزان** (ئان.) ئەرزان، کەم نرخ، کەم بەها: *میوە لە وڵاتی ئێمە زۆر هەرزانە.*

**هەرزانی** (ن.) ساڵی خۆش و پڕ بەرەکەت: *ئەو ساڵ هەرزانی بوو.*

**هەرسکردن** (چ.) گڤێریکرن، حەلکرن، پەرتکردنی خواردن لە سکدا، هەڵمژینی خواردن لە سکدا: *بۆ ئەوەی نان زوو هەرس بکرێ، پاروو باش بجوو، جا قووتی بدە.*

**هەرگیز** (ئاك.) چجار، هیچ، قەت: *هەرگیز لە بەڵێن پاشگەز نەبوومەتەوە.*

**هەرمێ** (ن.) هرمیك، جۆرە میوەیەکە: *هەرمێی گوڵاوی زۆر بەتامە.*

**هەروا** (ئاك.) هەر ئاوا، بەبێ هۆ، لەخۆوە، بە خۆڕایی، بەبێ بەرامبەر: *هەروا چوومە بازاڕ.*

**هەرووسا** (ئاك.) هەر هوسا، هەروەها، ئەوها: *کار هەرووسا ب رێڤە چوو.*

**هەروهەر** (ئاك.) هەمیشە، هەرگیزاو هەرگیز: *کورد هەروهەر بەرگری لە خاکی خۆی کردووە.*

**هەریر** (ن.) حەریر، شارۆچکەیەکە سەر بە پارێزگای هەولێرەو دەشتێکی بە پیت و بەرەکەتی هەیە.

**هەڕفاندن** (چ.) رووخاندن، وێرانکردن، تەختکردن: *دوژمنی گوندێن مە هەڕفاندن.*

**هەڕفتی** (ئان.) ڕووخاو، رامالدراو: *من خانیەکێ هەڕفتی دیت.*

**هەڕی** (ن.) حەڕی، قوڕ، هەڕ: دەمێ بوو باران، دێ بیتە هەڕی (پەند).

**هەزاران** (ئاك.) هەزارەها، چەند هەزارەك: *هەزاران كەس لە خۆپیشاندانەكە بەشدار بوون.*

**هەزار مێرد** (ن.) ئەشكەوتەكە دەكەوێتە ڕۆژئاوای سلێمانی.

**هەژار** (ئان.) ١- ژار، بێچارە، نەدار، بێ ماڵ و حاڵ، دەستكورت، بێ دەرەتان: *ماڵەكەی تەنیشتمان هەژارن.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**هەژاری** (ن.) ژاری، بێ دەرامەتی، نەداری، دەستكورتی: *هەژاری نەخۆشییەكی ترسناكە.*

**هەژاندن** (چ.) لەراندن، هژاندن، راتەكاندن، راچەڵەكاندن، راوەشاندن: *بۆ لێكردنەوەی سێوەكان لكە دارەكەمان هەژاند.*

**هەژمارتن** (چ.) هژماردن، هەژمارتن، بژارتن، ژماردن: *نیسك و ماش نامێنە ژمارتن لەوا بترازێ دكێشن.*

**هەژمەت** (ن.) حەسرەت، تاو، خەفەت، حەژمەت: *ئەوەندە خەمم خوارد لە هەژمەتا كەوتم.*

**هەسارە** (ن.) ستێری، گەڕۆك: *عەتارد نزیكترین هەسارەیە لە ڕۆژ.*

**هەستان** (چ.) ڕابوون، لە زەوی ڕاست بوونەوە، بڵندبوون: *هەستە با بڕۆین.*

**هەستەگان** (ن.) هەس، كۆڵ هەستە، ئاگا: *مرۆڤ پێنج هەستی دیاریكراوی هەیە.*

**هەڤ تەریب** (ئان.) هاوتەریب، وەكی ئێك: *هەر دوو لای بەرامبەر یەكی چوار گۆشە هەڤ تەریبن.*

**هەكسوس** (ن.) شێوەیەكی یۆنانییە بۆ وشەی خەتا-سوت بە زمانی میسری كۆن، كە واتای كۆچەر دەگەیەنێت. هەكسۆسەكان لە هەزارەی دووی پێش زایینیدا لە كەرتەی ئاسیاوە خۆیان خزاندە نێو میسر، ئەویش بەهۆی هاتنی هۆزانی هیندۆ ئاری بۆ ئەو

شوێنانەی، کە هەکسۆسەکان تێیدا دەژیان.

**هەکۆ** (ئام.) هەکە، ئەگەر: *مەکۆ تو چووی بێژە من دێ لگەل تە مێم.*

**هەل** (ن.) ١- دەرفەت، دەرەتان، فورسەت، دەلیڤە: ئەم هەلە لە دەست خۆت مەدە. ٢- نۆرە، جار، دەست: *هەلی منە راوەستە.*

**هەڵاڵە** (ن.) ١- گوڵی زەردی بۆنخۆش: *چەپکێك گوڵی هەڵاڵەم پێشکێشکرا.* ٢- دەرمانەکە پێستی پێ خۆش دەکەن. ٣- ناوە بۆ مێینە.

**هەڵامەت** (ن.) پەرسیف، پەسیو: *هەڵامەتەکی خراپم لێبوو، بەڵام زوو چوومە لای دکتۆر.*

**هەڵامسان** (چ.) هەڵاوسان، ئەستوور بوون، وەرمین: *جێی شکستییەکە هەڵامساوە.*

**هەڵە** (ئان.) سەهو، خەلەت، چەوتی، خەتا: *سنگ فراوان لە هەڵەی خەڵکی دەبوورێ.*

**هەڵەبجە** (ن.) شارۆچکەیەکە سەر بە پارێزگای سلێمانیو لە سنووری ئێرانەوە نزیکە: *لە ١٩٨٨/٣/١٦ پێنج هەزار کەس لە هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی شەهیدکران.*

**هەڵبەستن** (چ.) ١- قسە بۆ دروستکردن، درۆ بەزار کردن: *درۆ هەڵبەستن رەفتارەکی ناشیرینە.* ٢- دابەستن، دروستکردن، راکێشان: *جۆگایەکی لە رووبارەکەوە هەڵبەستووە.*

**هەڵبژاردن** (چ.) دەستنیشانکردنی کەسەك، یان شتەك، دەستبژێر کردن، بژار کردن: *براکەم بۆ ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی شارەوانی خۆی پاڵاوت.*

**هەڵترووشکان** (چ.) لەسەر چینچك دانیشتن: *سەگەکە هەڵترووشکابوو.*

**هەڵدران** (چ.) فرێدانە ئاسمان، هەلاوێتن: *کولارەکان هەڵدرانە ئاسمان.*

**هەڵدراو** (ئان.) چەقێندراو، هەلکراو، هەلاویستی.

**هەڵسوکەوت** (ن.) رەفتار، مامەڵە، سەودا، ئاکار: *هەڵسوکەوتی برادەرانەت لە یاد نەچێت.*

**هەڵسووڕاندن** (چ.) بەڕێوەبردن، برێڤەبرن، جێبەجێکردن: *کاروباری دوکانەکەمان باش هەڵدەسووڕێنم.*

**هەڵقولان** (چ.) ١- هەلاڤێت، بە تەوژم دەرچوونی ئاو، دەریوون: *کانییەکە لە هەڵقولان کەوت.* ٢- زێدەر: *شیعرەکانی ئەو لە کانگای دڵەوە هەڵقولاوە.*

**هەڵکەفت** (ئاک.) هەلکەوت، بۆنە، یاد: *ب هەلکەفتنا سەرکەفتنا تە دێ تە خەلاتکەم.*

**هەڵکەندن** (چ.) کۆڵان، هەلکۆلین، هەلقولین: ئەوەی چاڵ بۆ برادەری هەڵبکەنێت خۆی تێدەکەوێت.

**هەڵکەوتن** (چ.) بە دیار کەوتن، رسکان، پەیدابوون: *مامۆستا مرۆڤەکی هەڵکەوتووی کۆمەڵگایە.* بڕوانە **هەڵکەفت**.

**هەڵکەوتە** (ن.) شوێنی گرنگ: *کوردستان هەڵکەوتەیەکی گرنگی لە ناوچەکەدا هەیە.*

**هەلکرن** (چ.) داگیرسان: خۆ ژ هەلکرنا ئاگری دویر بێخە.

**هەڵکورمان** (چ.) کز هەڵنیشتن و خۆ مات کردنی باڵدار: *مریشکەکە نەخۆشە و هەڵکورماوە.*

**هەڵگیرساندن** (چ.) بەرپا کردن، داگیرسان و خۆشکردنی ئاگر، گڕ لێ پەیداکردن: *ئاگرەکەی داگیرساند.* ٢- بەرپابوون: *شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی* ١٩٦١ *هەڵگیرسا.*

**هەڵمەت** (ن.) ١- پەلامار، هێرش، شاڵاو: *هەڵمەتی پێشمەرگە بۆ*

*سەر لووتمن هەمیشە سەرکەوتوو بووە.*

**هەڵنەکرن** (ج.) گوزەران نەکردن، نەژیان: *بێ کار کرن هەڵناکەین.*

**هەڵواسین** (ج.) هەڵاویستن، چەسپاندنی تابلۆ، وێنەو...: *وێنەکەم بە دیواری ژوورەکەدا هەڵواسی.*

**هەڵوێست** (ن.) ١- هەڵوەستە، تێبینیو هزرو بیر دەربارەی شتێ: *پێویستە بەرامبەر کێشەی نەتەوەکەت هەڵوێستت هەبێت.*
٢- ناوە بۆ نێرینە.

**هەڵووژە** (ن.) حولیک، حلیك، ئاڵووباڵو، عەلوکە: *هەڵووژە وشك دەکرێت بۆ خۆشاوکردن.*

**هەڵۆ** (ن.) ئەلهۆ، جۆرە باڵندەیەکی گۆشتخۆرو بەهێزە: *هەڵۆ کەلەك بەرز دەفرێت.*

**هەمەچەشن** (ئان.) هەمەجۆر، هەمە ڕەنگ: *کتێبخانەکەمان کتێبی هەمە چەشنی تێدایە.*

**هەمەڕەنگ** (ئان.) ڕەنگاوڕەنگ، گەلەك ڕەنگ، جۆراو جۆر: ئەم فەرهەنگە وشەی هەمە ڕەنگی تێدایە.

**هەمەوەند** (ن.) هۆزەکی کوردە لە کەرکوك.

**هەمبانە** (ن.) هەمبان، همبان، هەگبە، پێستی دەرهاتووی خۆشکراوی مەڕو بزنە، کە شتی وشکی تێدەکرێ: *ئەنکم نیسکەکەی لە هەمبانەکە کرد.*

**هەمبێز** (ن.) هەمبز، ئامێز، باوەش: *دایکم هەمبێزی بۆ کردمەوە.*

**هەموو** (ج.) هەمیان، هەمی، تەڤ، گشت، تێکڕا: *هەموو گەلانی جیهانمان خۆشدەوێن.*

**هەمووجار** (ئاك.) هەرجار: *هەموو جارێ یادی دەکەم.*

**هەمیشەیی** (ئان.) بەشێوەیەکی بەردەوام، هەردەم: *من لەسەر میلاکی هەمیشەیی دامەزرام.*

**هەناسەدان** (چ.) بێهندان، هەناسە هەڵکێشان، هەڵمژینی هەواو دەردانەوەی لە ڕێگەی لوتەوە.

**هەنجیر** (ن.) ئەنجیر، هەژیر، هژیر: *هەنجیر گەلەك جۆری هەیە.*

**هەنگ** (ن.) مێشەنگین، مێشا هنگڤینی، مێشەنگوین: *هەنگ شیلەی گوڵ دەمژێت و دەیکا بە هەنگوین.*

**هەنگاو** (ن.) ١- ماوەی نێوان هەردوو لاق لە ڕۆیندا، شەقاو، پێنگاڤ: *شێرۆ لە ڕۆیشتندا هەنگاوی خێرا دەنێت.* ٢- ئاوە بۆ نێرینە.

**هەنگوین** (ن.) هەنگڤین، هەسەل، خۆراکەکی شیرینەو ڕەنگی هەنگوینییە، دەتوانیت لە نانی بسوویت و بیخۆیت: *هەنگوین چارەسەری زۆر نەخۆشی پێدەکرێت.*

**هەوار** (ن.) وار، شوێن: *هەواری ئێمە کوێستانە.*

**هەوارگە** (ن.) لانە، وارگە، هاوینەهەوار، هەوار، ژیان لە کوێستان: *کوردستان هەوارگەی شێرانە.*

**هەواڵ** (ن.) خەبەر، نوچە: *خۆم هەواڵی سەرکەوتنم بۆ برد.*

**هەور** (ن.) عەفر، ئەور، مژ، مژو مژران، هەڵمی ئاو،کە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان: *هەوری ڕەش نیشانەی باران بارینە.*

**هەولێر** (ن.) هەولێر لەو شارە کۆنانەی خڕکەی زەوییە، کە هەزاران ساڵە ژیانی تێدا بەردەوامە: هەولێر پایتەختی کوردستانە.

**هەوێن** (ن.) ١- هێڤێن، هێوێن، ئامیان، ئامیانی ماست و پەنیر: *ئەختێ ماستم بۆ هەوێنکردنی شیرەکە بۆ بێنە.* ٢- مایە، سەرچاوە، هۆ: *ئاشتی هەوێنی سەرکەوتنە.*

**هەیاسە** (ن.) کەمبەرەی زێڕو زیو: *ئەو کچە جوانە بە جلوبەرگی کوردیو هەیاسە ڕازاوەتەوە.*

**هەی هەی** (ئام.) وتەی سەرسوڕمانە: *هەی هەی لەم جلوبەرگە جوانە!*

**هرچ** (ن) ورچ: *هرچ لە ناو دارستان دەژی.*

**هری** (ن.) خوری: *جل و بەرگان ژ هریا چێدکەن.*

**هزر** (ن.) بیر، ئەندێشە: *هزرا من ناهێت کەنگی ئەم چووینە سەیرانێ.*

**هش** (ن.) ١- ئیشک، بیر، هۆش: ئاگاداری: ٢- وتەی فەرمان بە بێدەنگ بوون، وست: *هشبن نە ئاخفن مامۆستایێ هات.*

**هشك** (ئان.) ١- وشك، ئیشك، هوشك، ڕەق: *دارێ هشك زویتر دەمێتە سۆتن ژ دارێ تەڕ.* ٢- قرچۆك، ڕەزیل: *فلان کەس هشکە مرۆڤە.*

**هلقەشاندن** (چ.) هەڵوەشاندن: *هلقەشاندنا پەیمانان کرێتییە.*

**هنجن هنجن** (ئاك.) ورد کراو، ئەنجن ئەنجن، زفێل زفێل: *کراسەکەی هنجن هنجن کربووە.*

**هنجنین** (چ.) پەتشاندن، پرت پرتکرن، وردو خاش کردن: *ئەڤ گیایە هاتە هنجنین.*

**هوڕەبا** (ن.) ڕەشەبا: *ئەڤ چەند ڕۆژە هوڕە بایێ بەردەوامە.*

**هویر** (ئان.) ورد، هورد: *ئاخا هویر بۆ چاندنێ یا باشە.*

**هوون** (ج.) ئەنگۆ، ئێوە، هنگ، هەنگو: *هوون بۆ کوێ دەچن؟*

**هۆ** (ن.) ١- سەبەب، بۆنە، ئەگەر، سویچ، سۆنگە: *بە هۆی چی بوو نەتتوانی بێیت؟* ٢- وشەی بانگکردنە...: *هۆ هۆ فلان کەس.*

**هۆبە** (ن.) ١- هۆدە، ئۆدە، ژوور، پۆل، ئۆبە: *ئازاد لە هۆبەی جیمە.* ٢- کۆمەڵە چادرو ڕەشماڵێك بەیەکەوە: *ڕەوەندەکان هۆبە هۆبە ڕەشماڵیان هەڵداوە.*

**هۆدە** (ن.) بڕوانە: **هۆبە**.

**هۆز** (ن.) خێڵ، عەشیرەت، بەرەباب، تایەفە، ئیجاخ: *ئەز ژ هۆزا گورانم.*

**هۆزان** (ن.) ١- هۆنراوە: هۆزان ڤەهاندن بەهرەیە. ٢- ناوی کەسییە و لە کچ و کوڕ دەنرێت.

**هۆزانڤان** (ئان.) شاعر، هۆنەر، بوێژ، هەڵبەستڤان: *مەلای جەزیری هۆزانڤانەکێ ناڤدارە.*

**هۆشمەند** (ئان.) ژیر: *نازدار کچەکی هۆشمەندە.*

**هۆشیار** (ن.) وریا: هۆشیار هەڤالەکی دڵسۆزە.

**هۆکار** (ن.) ١- بڕوانە: **هۆ**(١). ٢- ڕێگا، پێناو: بەو هۆکارە دەتوانی بگەیتە ئامانج.

**هۆگر** (ئان.) متوو: *ئەم مندالە هۆگری منە.*

**هۆنراوە** (ن.) جۆرە تێکستێکە، کە لە کۆمەڵە ڕستەیەکی کورت پێکهاتووەو ئاوازدارە: *هۆنراوە کێشو سەرواداره.* بڕوانە: **هۆزان.**

**هۆنینەوە** (چ.) دانان، ڤەهین، ڤەهاندن: *هۆنینەوەی شیعر بەهرەیە.*

**هۆیەکانی گواستنەوە** (ن .) ڕێگاکانی هاتوچۆ کە بە ڕێگەی وشکانی، ئاوی یان ئاسمانیدا دەبێت.

**هیڤان** (ن.) مامۆستا، سەیدا: هیڤان خوێندکاران فێر دکەت.

**هیڤی** (ن.) هیوا، ئومێد، ئاوات: *ئازادی هیڤیا مەیە.*

**هین** (ئان.) هێنک، فێنک: *ل هافینێ خەلک دچیتە جهێن هین.*

**هینبوون** (چ.) فێربوون، زانین، هیبوون: *ژ بوو هینبوونێ هەر تشت پێدڤییە.*

**هێرش** (ن.) ئەگەر یەکێك هێرشی هێنایە سەرت، ئەوە نیشانەی ئەوەیە، کە دەیەوێت، شەڕت لەگەڵ بکات .

**هێز** (ن.) ١- وزە، تاقەت: *د هێزا مندا بوو بسەر چیایێ بکەڤم.*

**هێشتا** (ئاك.) تا ئێستاش، هەتا ئێستا، هێشـتان: *مـەرلێـرەم هێشـتا نەچوومەتەوە ماڵ..*

**هێلانـــە** (ن.) هــێلین، لانــە، لــیس: *هێلانەی خۆت خراپ مەکە.*

**هێلکــە** (ن.) هێـك: *باڵنـدەکان لەسـەر هێلکە کڕدەکەون.*

**هێلکەدان** (ن.) هێکدان، ئـەو شـوێنەی کە هێلکە تیایدا دروست دەبێت: *مریشکەکە هێلکەدانەکەی پڕ لـە هێلکە بوو.*

**هێڵ** (ن.) خیچ، خیـت، خـەت: *هێڵـەکم بەسەر نووسینەکەدا هێنا.*

**هێڵەك** (ن.) کوللەتێل، هێرینگ: *نـەنکم ئاردەکەی لە هێڵەك دا.*

**هێڵەکانی بوار** (ن.) خیچێت بیاڤی.

**هێڵکاری** (ن.) خەت کێشان بە شـێوەی خــەت: *بــە هێڵکــاری وێنــەی قوتابخانەکەمان بکێشن.*

**هــێمن** (ئــان.) ١- ئــارام، لەســەرخۆ: *منداڵی هێمن کارەکانی بە باشـی ئــەنجام دەدات.* ٢- نــاوە بــۆ نێرینە.

**هێنـــان** (چ.) هــاوردن، هــانین، ئــانین: *هێنـــانی کەلوپـــەلی چـــاك لـــە دەرەوە پێویستە.*

**هێنانەدی** (چ.) بـەدیهێنان، بجهئینـان: *هێنانـــەدی ئـــاوات شـــەونخونی دەوێت.*

**هێنك** (ئان.) بڕوانە: هێن

**و** (ئام.) ئامرازی پەیوەندییە، دوو وشە بە یەکەوە دەبەستێت وەك: دارا و تارا هاوڕێن، هەروا دەوری ئامرازی لێکدەریش دەگێڕێت و دوو ڕستە لێکدەدات، وەك: بەیانی لە خەو هەستام و دەموچاوم شوشت.

**وا** (ئاك.) ئەوە، ئەوا: وا دێم.

**وار** (ن.) هەوار، وەڵات، نیشتمان، جێگا: *ئەڤ وارە وارێ منە.*

**وارگەه** (ن.) جەه، جە، وار، هەوار: *هەولێر وارگەهێ عەکیدو مێرخاسانە.*

**واز لێهێنان** (چ.) لێگەڕان، دەست لێبەردان، خۆ لێکردنەوە، دەستبەردان: *وازم لە جگەرە کێشان هێنا.*

**وازی** (ن.) بازی، یاری، گەمە: *لەسەر جادە وازی مەکە.*

**واژە** (ن.) بێژە، دەستەپەیڤ، وتە: *بە چەند واژەیەکی پێکەنیناوی کۆتایی بە قسەکانی هێنا.*

**واژوو** (ن.) واژۆ، ئیمزا: *تکایە ناوی خۆت بنووسە، جا واژوویەکی لەسەر بکە.*

وان (ج.) ١- ئەوان: *وان فراڤین خوار.* ٢- ناوی شار و دەریاچەیەکە لە باکووری کوردستان: *چیایێ سیپانێ دکەڤیتە منداڤی بەحرا وانێ.*

وانـــە (ن.) دەرس، دەرز: *لـە وانـەی کوردیدا پلەیەکی باشم هێناوە.*

وانەبێژ (ئان.) مامۆستا، ئەو کەسەی وانـــە دەڵێتـــەوە: ژمـــارەی مامۆســـتامان کەمـــە، بۆیـــە پێویستمان بە وانەبێژ هەیە.

وەرچـــەرخان (چ.) زڤـــڕان، زڤـــڕین، سووڕانەوە، وەرگەڕان، ئاوەژوو بوونـەوە: *شۆڕشـی جیهانگـەری وەرچەرخانەکی مەزنە.*

وەرز (ن.) کـەژ، چـارێکی سـاڵ: *مـن وەرزی پـایزم پـێ جوانـە، ئـەی تۆ؟*

وەرس (ئان.) بێزار، هەراسان.

وەرزش (ن.) راهێنان، ریـازە، سپۆرت: *وەرزش لەش بەهێز دەکات.*

وەرگرتن (چ.) بەدەستهێنان، کەوتنـە دەست، دەستخستنی شتێك لـە یەکـەکی دییـــەوە: *وەرگرتنـــی مافەکان شتەکی رەوایە.*

وەریـــو (ئـان.) هـەڵوەریو، وەریـای، کەوتوو: *پەلکە وەریوەکـان بنـی دارەکەیان داپۆشیوە.*

وەڕس (ئان.)) بێـزار، وەڕز، هەراسان، جـاڕس: لــە خوێندنــەوە وەرس نابم.

وەزیر (ن.) پلەیەکی فەرمانڕەواییە لـە دەوڵـــەت، شـــالیار: *وەزیـــری پـەروەردە کاروبـاری خوێنـدن رادەپەڕێنێت.*

وەســـــتا (ن.) ١- هــــەر کەســـێك شارەزاییەکی باشـی لـە پیشـەی خۆیدا هەبێت پێیدەڵێن وەستا: کارزان لە دارتاشیدا وەستایەکی باشە. ٢- *زانا، لێزان: بە راستی وەستایە.*

وەســـتان (چ.) راوەسـتان: *کـە مـات وەســـــتابووم.* ٢- لــــەکار وەسـتان: کارگەکـە ماوەیەکـە وەستاوە.

وەش (ئان.) ١– پەسەند، خۆش: ئەم *ترێیە وەشە.* (ن.) ٢– ئۆش، هۆش، هۆنش، وشەیەکە بۆ راگرتنی گوێدرێژ لە کاتی رۆیشتن.

وەفادار (ئان.) دڵسۆز، ئەمەکدار، بە وەفا: *وەفاداری لوتکەی برادەرایەتییە.*

وەڵام (ن.) بەرسف، جەواب: *مـن وەڵامی پرسیارەکانم بە باشی دایەوە.*

وەنەوشە (ن.) بنەوشە، جۆرە گوڵەکە: *گوڵە وەنەوشە بۆنی خۆشە.*

وەها (ئاک.) هۆسا، وەسا، ئەوها، ئاوا: *کارەکی وەها لە تۆ ناوەشێتەوە.*

وەهار (ن.) بەهار: *وەهاران گوڵ وەدەردەکەون.*

وتار (ن.) جۆرە نووسینێکە لەناو رۆژنامە، یان گۆڤارێکدا بڵاو دەکرێتەوە: *دایکم هەموو هەفتەیەک وتارێک بۆ رۆژنامە دەنووسێت.*

ورە (ن.) توانایی و خۆراگرتن: *مرۆڤ لە کاتی ناخۆشیدا نابێ ورە بەربدات.*

ورچی دێز (ن.) هرچا رەش.

ورد (ئان.) ١– هورد، هویر. شتەک،کە دانە دانەکەی بچووک بن. ٢– لەسەرخۆ، جوان، بەدیقەت: *ورد تەماشا کە*

وردە (ن.) هووردە، خوردە، کە زۆرجار بۆ پارە بەکاردێت وەک: پارەی وردە، هەروا لەگەڵ شەکرو برنج و...: وردە شەکر، وردە برنج.

وردەئاسن (ن.) هویرکێ ئاسنی: *وردە ئاسن لە دوکانی ئاسنگەردا هەیە.*

وردەدار (ن.) ئارکێ داری، وردەدار: *پێویستمان بە هەندێ وردە دارە بۆ نانکردن.*

وردەوردە (ئاک.) پیچ پیچە، هوردە هوردە: *وردە وردە دەڕۆیشتین.*

وردبین

**وردبین** (ن.) ١- هوردبین، ئامێرەکە شتی بچووکی پێ دەبینرێ، میکرۆسکۆب. ٢- بە کەسێك دەگوترێت، کە شتی ورد دەبینێت.

**وردکردن** (چ.) قەدکرن، هوردکرن، پارچە پارچە کردن: *دارەکانمان بۆ سۆپا وردکردن.*

**ورمێ** (ن.) ناوی دەریاچە و شارەکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

**وریا** (ئان.) هشیار، هوشیار، لەسەرخۆ، ئاگادار، بە ئاگا: *دەبێ وریا بین بۆ ئەوەی هەڵە نەکەین.* ٢- ناوە بۆ نێرینە.

**وس بوون** (چ.) بێ دەنگ بوون، کڕ بوون: *لەکاتی وانە گوتنەوەدا وا باشە وس بیت.*

وشتر

**وشتر** (ن.) حێشتر، حوشتر: *وشتر بارهەڵگرەکی بیابانییە*

وشترگا

**وشترگا** (ن.) زرافە، زەڕافە، ژرافە.

وشترمرخ

**وشترمرخ** (ن.) وشتر مەل، نەعامە: *لە باخی ئاژەڵاندا وشترمرخێکم بینی.*

**وشکانی** (ن.) هشکی، هیشکایی: *هەندەک گیانەوەر لە ئاودا دەژی و هەندەکی تر لە وشکانیدا.*

**وڵات** (ن.) نیشتمان، وەتەن، زێد، مەڵبەند: *من وڵاتێ خۆ خۆش دڤێت.*

**وڵاتپارێز** (ئان.) نیشتمان پەروەر: *مرۆڤێ وڵاتپارێز یێ سەر بڵندە.*

**وڵاخ** (ن.) بە کەرو ئێسترو ئەسپو ماین دەڵێین وڵاخ، بڕوانە **رەشە وڵاخ**

**وڵاخی بەرزە** (ن.) بارەبەر، دەوار: *وڵاخی بەرزە بۆ بارلێنان بەکاردێت.*

**وی** (ج.) جێناوی جودایە بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر بەکاردێت، ئەو: *وی فراڤین خوار.*

**ویستگە** (ن.) گەراج، وەستانجێ، شوێنی وەستانی ئوتومبێل، پاس ، یان شەمەندەفەر.

**ویستن** (چ.) حەز لێبوون، ئارەزوو لێبوون، خواستن: ئەگەر تۆ ویستت شتێك فێر بیت، باش فێری دەبیت.

**وێ** (ج.) جێناوی جودایە بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ بەکاردێت: *وێ گۆتە مەڤالێن خۆ سبە ئەز دمێم قوتابخانێ.*

**وێران** (چ.) ١- نەترسان لە کردن و گوتنی شتێك. ٢- رمان و تێکچوونی شتێك، کاڤل، خاپوور، تێکچوو، کاول: *ئاڤەکێ گران و گوندەکێ وێران.*

**وێرانکــــرن** (چ.) کــاڤلکرن، خــاپوور کــــردن، تێکــــدان، کــــاولکردن: *چەندەها گوندی کوردستان بە دەستی بەعس هاتنە وێرانکرن.*

**وێرێ** (ئاك.) وی جهی، ڤێرێ، لـەوێ، ئــەوێ: ل وێــرێ ئــەم شـــارەزا بوون: *ل وێرێ مە ترپانێ کر.*

**وێنە** (ن.) نیگارێکە بەهۆی کامێرا دەگیرێت.

**وێنەگر** (ئان.) ئەو کەسەیە بەهۆی کامێرا وێنەی کەس و شت دەگرێت.

**وێنجە** (ن) گیایەکە بە پنج دەیچێنن بۆ ئالیك، ئینجە، ئوونجە: *وێنجەکە وشك کەوە بیدە بە ولاغەکان.*

**یا** (ئام.) ١- یان، یاخو: تۆ دەچی یا ئازاد؟ ٢- بە پێش ناوی تایبەتی دەکەوێت بۆ ڕێزلێنان بەکاردێت، وەك: یا هەمین، یا ئایشەگوڵ.

**یاخە** (ن.) یەخە، ئێخە، بەرۆك، یەقە، ئێقە، پشتە مل: *یاخەی کراسەکەی باش لە ئوتوو دراوە*

**یاخی** (ئان.) لامل، لاسار، هەڵگەڕاوە: *شێروان زۆر یاخییە، هیچ بە گوێمان ناکات.*

**یاد** (ن.) بیرەوەری، یادگاری، بیر: *باوکە گیان زۆر یادت دەکەم.*

**یاداشت** (ن.) نووسینی شتەك بۆ بەبیر هێنانەوە: *خۆپیشاندەران یاداشتەکیان دایە بەرپرسی شار.*

**یارمەتیدەر** (ئان.) یاریدەدەر، هاریکار: *مامۆستا یارمەتیدەری قوتابییە.*

**یاریدەر** (ن.) هاریکار، یارمەتیدەر، یاریدەدەر: *یاریدەدەری قوتابخانەکەمان وانەی کوردیمان پێ دەڵێت.*

**یاریزان** (ن.) یاریکەر: *ئازاد یاریزانەکی خێرایە.*

**یاریکەر** (ن.) بڕوانە: یاریزان.

یاریگە

**یاریگە** (ن.) یاریگا، گۆڕەپانی یاری، مەیدان: *یاریگەیەکی فراوان لە شارەکەمان دروستکراوە.*

**یاسا** (ن.) قانون، دام و دەستوور، ڕێ و شوێنی کۆمەڵ، ڕێسا: *پێویستە هەموومان ملکەچی یاسا بین.*

**یان** (ئام.) بڕوانە: **یا** (١)

**یاوەر** (ن.) هاوەڵ: *لە پێشبڕکێ و دیدەوانیدا مامۆستای وەرزش یاوەرمانە.*

**یەخچاڵ** (ن.) بەفرگر: *زۆربەی ماڵەکان یەخچاڵیان تێدایە. یەخچاڵەکەمان بەفرێکی زۆری گرتووە.*

**یەدەگ** (ن.) سپێر، ئامرازی زیاد بۆ جێگرتنەوەی شتی لە کەڵک کەوتوو: *یەدەگی ئەم ئۆتۆمبێلانە لە بازاڕ کەمە.*

**یەزدان** (ن.) خودای، خودێ، خوا: *یەزدان پشت و پەنای ڕاستگۆیانە.*

**یەکتربڕین** (چ.) ئێکودووبڕین، بەناو یەکدا چوون: *دوو هێڵی یەکتربڕم بۆ بکێشە.*

**یەکخستن** (ن.) یەکگرتن، کردنە یەک، ڕێکخستن: *یەکخستنی هێزەکانی کورد کارەکی پێویستە.*

**یەکدەست** (ئان.) یەکگرتوو، ئەگەر کۆمەڵێك کەس لەسەر ئەنجامدانی پرۆژەیەك یەك بیرو ڕایان هەبوو و پێکەوە هەوڵیان بۆ دا وەکو ئەوە وایە بە یەکدەستی بیکەن.

**یەکڕوو** (ئان.) ڕاست، ڕاستگۆ: *هاوڕێکەم لەگەڵمدا یەکڕووە.*

**یەکسانی** (ن.) وەك یەك، چوونیەکی، بەرانبەری: *یەکسانی نیشانەی دادپەروەرییە.*

**یەکسەر** (ئاك.) بێ ڕاوەستان، دەمودەست، ڕاستەوخۆ، دەستبەجێ: *پشتی مە نان خواری، یەکسەر مە دەست ب شۆلی کر.*

**یەکلایی کردنەوە** (چ.) بەلایەکدا خستن: گیانە ئەم کارەم بۆ یەکلایی بکەوە.

**یاڵ** (ن.) ١- ملەی چیا: *دوێنێ سەرکەوتمە سەر یالەکە.* ٢- مووی سەر ملی ئەسپو ماین: *یالی ئەسپەکەم شۆرد.*

**یۆنان** (ن.) ولاتێکە کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەلاتی کەرتەی ئەورووپا، کە بە ولاتانی تورکیا، بولغاریا، مەکەدۆنیا، ئەلبانیاو سێ زەریاش دەورەی داوە: یۆنان دوورگەیەکی زۆری لە نێو زەریای سپی ناوەڕاستدا هەیە.

**یۆنانی** (ئان.) خەڵکی یۆنان: ئەرستۆ زانایەکی یۆنانی بوو.

# کتێبە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان

١) فەرهەنگی زاراوە ( عەرەبی - کوردی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٢، ( ١٤٢ لاپەڕە).

٢) کوردی تورکمانستان - مێژوو - ئەتنۆگرافیا - ئەدەب، د. مارف خەزنەدار، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٣، (٢٥٨ لاپەڕە).

٣) زاراوەی یاسایی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٠ لاپەڕە).

٤) زاراوەی کارگێڕی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕە).

٥) من ینابیع الشعر الكلاسيكي الكردي،ج١، رشيد فندي، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢٤٠ لاپەڕە).

٦) ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٥٦ لاپەڕە).

٧) ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاک، د.شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (١٥٩ لاپەڕە).

٨) چوارینێن خەیام، د. کامیران عالی بەدرخان، وەرگێڕانی لە لاتینییەوە د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٩٤ لاپەڕە).

٩) شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، د. زەرێ یوسوپۆڤا، و : لە ڕووسییەوە د. کوردستان موکریانی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢١٦ لاپەڕە).

١٠) العروض في الشعر الكردي، احمد هردي، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢١٨ لاپەڕە).

١١) ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە ١٤٥٠ ـ ١٥٠٠، د. مەغدید سەپان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٨ لاپەڕە).

١٢) زاراوەی ڕاگەیاندن، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان ، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٠٨ لاپەڕە).

١٣) فەرهەنگی زاراوەکەلی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی - کوردی - عەرەبی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٦٥ لاپەڕە).

١٤) ئەدەبی منداڵانی کورد - لێکۆڵینەوە - مێژووی سەرهەڵدان، حەمە کەریم هەورامی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٤٠٦ لاپەڕە).

١٥) گیرەکێن زمانێ کوردی، د. فازل عمر، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٣٤ لاپەڕە).

١٦) ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ل سەد ساڵا نوزدێ و بیستێ زایینی، تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، هەولێر ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥؛ (٢٧٦ لاپەڕە).

١٧) دەنگسازی و بڕگەسازی لە زمانی کوردیدا، د. شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٠٦ لاپەڕە).

١٨) هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا ١٩٣٩ - ١٩٧٠، د. عبدالله یاسین عەلی ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٣٢٠ لاپەڕە).

١٩) یوسف و زولەیخا، حەکیم مەلا ساڵح، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٧ لاپەڕە).

٢٠) زمانی کوردان - چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆجی زمان، پ . د فریدریش موولێر ئەوانی تر، و : لە ئەڵمانییەوە د. حمید عزیز ، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، ( ١٩٢ لاپەڕە ).

٢١) ڕێبەری بیبلۆگرافیە کوردییەکان ١٩٣٧ - ٢٠٠٥، شوان سلێمان یابە، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٠ لاپەڕە).

٢٢) فەرهەنگی گەورەی من . د. کوردستان موکریانی ، چاپی یەکەم، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦ ،(٨٠ لاپەڕە).

